# شەرحی سەبعەی موعەللەقە

داتراوی:
مامۆستا مەلا موحەممەدی شەلماشی

سرشناسه : شلماشی، محمد

عنوان قراردادی : معلقات سبع. کردی. شرح

عنوان و نام پدیدآور : شەرحی سەبعەی موعەللـەقە/ دانراوی محمدی شەلماشی.

مشخصات نشر : سنندج : انتشارات کردستان ، ۱۳۸۹.

مشخصات ظاهری : ۲۳۸ص.

شابک : 978-964-980-087-5

وضعیت فهرست نویسی : فیپا

یادداشت : کردی.

موضوع : معلقات سبع -- نقد و تفسیر

موضوع : شعر عربی -- پیش از اسلام -- تاریخ و نقد

رده بندی کنگره : ۲۶۰۶PJA /م۸۰۶ش۸ ۱۳۸۹

رده بندی دیویی : ۷۱۱۰۹/۸۹۲

شماره کتابشناسی ملی : ۹۵۰۲۶۰۲

# شەرحی
# سەبعەی موعەللـەقە


دانراوی:

**ماموٚستا مەلا موحەممەدی شەڵماشی**


سنه

سنه ـ پاساژی عیززەتی ـ تەلەفوون ـ ٢٢٦٥٣٨٢

# شەرحی سەبعەی موعەللەقە



| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | شەرحی سەبعەی موعەللەقە |
| ✓ دانراوی (مؤلف): | موحەممەدی شەڵماشی |
| ✓ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول)؛ ١٣٩١ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ١٠٠٠ (بەرگ) جلد |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع): | ٣٠٤ صفحەی رقعی |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |

نرخی: ١٠،٠٠٠ تمەنە

شابک: ٥ ـ ٠٨٧ ـ ٩٨٠ ـ ٩٦٤ ـ ٩٧٨

ISBN: 978 - 964 - 980 - 087 - 5

# ناوەڕۆك


دەسپێك ........................................ ٧

موعەللەقەی یەكەم ................................ ٩

موعەللەقەی دووەم ................................ ٥٥

موعەللەقەی سێهەم................................ ٥٥

موعەللەقەی چوارەم ................................ ١٣٩

موعەللەقەی پێنجەم ................................ ١٨٧

موعەللەقەی شەشەم ................................ ٢٢٩

موعەللەقەی حەوتەم................................ ٢٦٩

# دەسپێك

سەبعەی موعەلەقە حەوت قەسیدەیە لە شیعری قەدیمی عەرەبی، ئی حەوت شاعیری زەمانی جاهیلییەتن، کە لەپێش پەیدابوونی ئیسلامدا ژیاون، گۆیا ئەو حەوت قەسیدە لە نەزەری فەساحەت و بەلاغەتەوە پەسەند و قەبوڵی ئودەبای عەرەب بوون و بە ئاوی زێڕ لەسەر پارچە حەریرێکیان نووسیونەوە و بە پەردەی کەعبەدا هەڵیان واسیون. لە پاشان لە لایەن زۆر لە زانایانەوە شەرحیان لەسەر کراوە. بۆ نموونە وەك ئەو زانایانە:

١ـ «ابو جعفر بن نحاس» لە ساڵی ٣٣٨کۆچیدا

٢ـ «ابو علی ثعالبی» لە ساڵی ٣٥٦کۆچیدا

٣ـ «ابوبکر بطلیوسی» لە ساڵی ٣٩٤کۆچیدا

٤ـ «زوزني» لە ساڵی ٤٨٦کۆچیدا

٥ـ «ابو زکریا بن خطیب تبریزي» لە ساڵی ٥٩٢کۆچیدا

٦ـ «دمیری صاحب حیات الحیوان» لە ساڵی ٨٠٨کۆچیدا

٧ـ «احمد ترجانی‌زادە» لە ساڵی ١٣٤٨کۆچیدا

هەروەها زۆربەیان بەزمان ئینگلیسی و ڕووسی و ئەڵمانی و لاتینی وەرگێڕدراون.

جا منیش بۆ ئەوەی کە زمان و ئەدەبی کوردیش بێبەش نەبێ لەو چەکامانە گوتم؛ با هەر چەند کرچ و کاڵیش بێ وەریانگێڕمە سەر زمانی شیرینی کوردی، تایەکێك لە فرسەتێکدا لەوەی من باشتر وەریان دەگێڕێ. بەڵام وەرگێڕانەکەشم هەروا لەخۆڕا نەبوو، بەڵکوو دۆست و زاناو مامۆستا مەلا ئەبوبەکر فەلسەفی پێش‌نیهادی پێ کردم و منیش ئیتاعەم کرد. چونکە شێخی سەعدی دەڵێ **«آزردن دل دوستان جهل است»**.[1]

هاتم شەرحە فارسییەکەی مامۆستا تورجانی‌زادەم وەگیڕایە سەر زمانی کوردی و ئومێدەوارم زۆر بێ کەڵك نەبێ.

**٢٠٠٧/٨/٥ زاینی**

**محمدی شڵماشی**

---

١. [واتە: ڕەنجاندنی دڵی دۆستان نەزانییە].

# موعەللەقەی یەکەم

---

قِفَا نَبْكِ مِن ذِكْرىٰ حَبِيبٍ وَ مَنْزِلِ    بِسِقْطِ اللِّوىٰ بَينَ الدَّخُولِ فَحَوْمَلِ

فَتُوضِحَ فَالمِقْراةِ لَمْ يَعْفُ رَسْمُها    لِمَا نَسَجَتْها مِن جَنُوبٍ وَ شَمْأَلِ

---

قِفا: فیعلی ئەمرەو بۆ تەسنییەی موزەکەری موخاتەبە و لە «وقوف»ە و بە مەعنا ڕاوەستانە. لەوانەیە هەر نەفەرێکی لەگەڵ بووبێ، بەڵام بەعادەتی عەرەبان کە بۆ یەکێك و چەند کەس هەر سیغەی دو نەفەری بەکار دێنن. لەوانەشە ئەلفی قفا ئیسم و ئەلفی تەسنییە نەبێ، بەڵکوو حەرف و عەلامەتی دووبارەکردنەوەی لفظ بێ، واتە «قف قف» بێ و بۆ تەئکید لە ڕاوەستانەکەدا بێ. وەك ئەبوو عوسمانی مازەنی لە ئایەتی سەت و یەکی سووڕەتی «المؤمنون»دا کە دەفەرمووێ: ﴿قال رَبِّ ارْجِعُونِ﴾ گوتویەتی: مەبەست سێ بارەکردنەوەی لەفزی «ارجع»ە. وە لەلای هێندێکان لە ئەسڵدا «قفن» بووە بە نوونی تەئکیدەی خەفیفەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەو نوونە لە حاڵەتی وەقفەدا دەبێتە ئەلف و قاعیدەش وایە کە بە شکڵی وەقفە بنووسرێ بە ئەلف نووسراوە. هەر وەك لە ئایەتی یازدەی سووڕەتی «علق»دا نووسراوە ﴿لَنَسْفَعاً بِالنَّاصِيَةِ﴾ کە ئەسڵەکەی «لَنَسْفَعَنْ» بە نوون بووە و بە شکڵی ئەلف نووسراوە.

«نَبكِ»: فیعلی موزاریعی مەجزووم بە حەزفی یێی لامەفیعلە و جوابی ئەمرە و ئەسڵەکەی «نَبْکی» بووە.

«ذِکریٰ» واتە: یادکردنەوە و ناوبردن.

«حبیب»: مەحبوبە و خۆشەویست.

«سقط»: ڕمڵ و خۆڵەمێش.

«اللوِیَ»: مەبەست ئەو تۆز و خۆڵ و ڕمڵەیەکە لە عەرەبستانێ "با"کۆی دەکاتەوە و بڵاوەی پێدەکا و باریك دەبێ.

«دخول» و «حومل» و «توضح» و «مقراة»: ناوی چوار جێگان لە خاکی خێڵی بەنی ئەسەدەکە ئەو خۆڵ و لمە لەبەینی ئەو چوار جێگایەدا واقیع بووە.

«رسم»: ئاسار و پاشماوەی ڕەشماڵ و مەننزڵ، وەك پشکلی حەیوانات و خۆڵەمێش.

«جنوب»: نوقتەی بەرامبەر بە شیمال و بە "با"یەکیش دەڵێن کە لەوێوە دێ.

«شَمال»: بەو "با"یە دەڵێن؛ کە لەلای شیمالەوە بێ.

پوختەی مەعنای ئەو دوو شیعرە ئەوەیە دەڵێ: هاوڕێکان ڕاوەستن تا بەیادی یارێك بگرین کە جێگاو مەنزڵی لەنێو ئەو تەپۆڵکە خۆڵە خوار و خێچانەی بەینی ئەو چوار جێگایەدا بوو، وە ئێستاش ئاساری ماوەتەوە، لەبەر ئەوەی «با» هەر سەعاتە لەلایەکەوە هاتووە ئەگەر بایەك پڕی کردبێتەوە «با»کەی دی ماشتویەتیەوە. یان مەبەست ئەوەیە کە لەگەڵ ئەوەشا کە «با» شوێنەواری شوێنی خۆشەویستەکەیان لەبەینی بردووە، بەڵام ئاساری عیشق و خۆشەویستی یار لە دڵ و گیاندا هەر ماوەتەوە.

مەعنایەکی دی ئەوەیە کە لەبەینچوونی مەنزڵی خۆشەویستەکەی تەنیا بەهۆی باوە نەبووە، بەڵکوو هۆی دیکەش بوون، وەك بارانی زۆر و مرووری زەمان.

تَرَىٰ بَعَرَ الْأَرْآمِ فِي عَرَصَاتِها ... وَ قِيعَانِها كَأَنَّهُ حَبُّ فُلْفُلِ

«تَرىٰ»: موزاریعی «رأیٰ» وەلە ئەسڵدا «تَرْأیٰ» بووە و بۆ تەخفیف کراوە بە «تَرىٰ».

«بَعْر»: بە فەتحەی «ب»ێکە و سکوون و فەتحەی عەینەکە بە مەعنا پشکلی حەیوانە.

«آرام»: وەك «آرْآم». جەمعی «رِءم»ی بە مەعنا ئاسکی سپی خالیسە و لە ئەسڵدا «آرْءَمِ» بووە و بەهۆی نەقڵ قەلبەوە بۆتە «آرام».

«عَرَصات»: جەمعی عەرسەیە و بەو زەوییە خاڵییە دەڵێن کەلە پێش خان و ماڵەوەیە، بەڵام «سەعالیبی» دەڵێ: هەر ئەرزێك کە خالی بێ و نەکرابێ بە خانوو پێی دەڵێن؛ عەرسە.

«قیعان»: جەمعی «قاع»ە و بە مەعنا جێگای نەرمان و دەشتە.

«فلفل»: بیبەر، ئاڵەت.

پوختەی مەعنای ئەو شیعرە، یەعنی دار و ماڵ و دیاری مەحبووبە کە کاتێك ئاوەدان و خۆش بوو، ئێستا چۆڵ و وێرانە و شوێنی ئاسکانی ڕەنگ سپییە و پشکەلەکەیان وەك دەنکە بیبەر بڵاوبوونەوە و لەبەردەمی جێگاکەیدا دەیانبینی.

كَأَنِّي غَداةَ الْبَيْنِ يَوْمَ تَحَمَّلُوا ... لَدىٰ سَمُراتِ الْحَيِّ ناقِفُ حَنْظَلِ

وُقُوفاً بِها صَحْبِي عَلَيَّ مَطِيَّهُمْ ... يَقُولُونَ لا تَهْلِكْ آسىً وَ تَجَمَّلِ

«غداة»: چێشتەنگاوە.

«بین»: بە مەعنا بەیەك گەیشتن و لێك جیابوونەوەی دێ، بەڵام لێرەدا بۆ

جودایی بەکار هاتووە.

«تَحَمَّلوا»: کۆچیان کردووە و چوونە سەفەر.

«لَدَى»: لە کن، بەڵام «لَدَى» لەشتی مادی و حازر بەکار دەبرێ، بە پێچەوانەی «عِنْد»کە ئەو لە مادیات و مەعنەویات و حازر و غایب بەکار دەبرێ.

«سَمُرات»: جەمعی ـ «سَمَرَةَ»و بە درەختێکی گەورەی دڕکاوی دەڵێن.

«حَيّ»: هۆزە.

«ناقِفُ حنظَلِ»: بە کەسێك دەڵێن؛ کە کاڵەکە مارە لەت بکا و دەنکەکانی دەربێنی، لەو کاتەدا بە بێ ئیختیار فرمێسکی بەچاواندا دێتە خوارێ.

«وُقوفًا»: جەمعی «واقف»، وەك چۆن «شهود» جەمعی «شاهد»ە و لە ئیعرابدا بۆتە حاڵ. زەمیری «بها» بۆ «سُمرات» دەگەڕێتەوە.

«صحب»: جەمعی «صاحب»ە.

«مَطِي»: جەمعی «مطية» و بە مەعنا وەڵاغی سوارییە.

«آسى»: مەفعووللەهووە و بە مەعنای زۆر مەحزوونییە.

پوختەی مەعنای ئەو شیعرە دەڵێ: لە چێشتەنگاوی ڕۆژی جیابوونەوە لە یار کە کۆچیان دەکرد لەلای دارە دڕکاوییەکانی خێڵەکە، وەك ئەوکەسەی کە کاڵەکە مارە لەت بکاو ئاوی بە چاواندا بێتە خوارێ سەرسام بووم و دەگریام، لە کاتێکدا کە هاوڕێکانم وشترەکانیان لەلای سەری من ڕاگرتبوو دڵخۆشی منیان دەدایەوە و دەیانگوت: خۆت بە خەفەتانەوە مەکوژە و خۆڕاگر بە.

---

وَ إِنَّ شِفَائي عَبْرَةٌ مُهْراقَةٌ     فَهَلْ عِندَ رَسْمٍ دارِسٍ مِن مُعَوَّلِ

---

«مهراقة»: ئیسمی مەفعووله و لە «اهراق»ە و مازی بابی «ئیفعال»ە و بە

مەعنا ڕژاوە.

«معول»: شوێنی گریان و جێگای پشت پێ‌بەستنە.

دەڵێ: دەوای دەردی مــن فـرمێسك هـەڵوەرانـدنە، بـەڵام دەبێ لەسـەر شوێنەواری وێران و لەبەینچوو پیاو بگری؟ ئایا لەو نەوعـە جـێگـایانە دەبێ ئومێدت بەگریە و زاری بێت و ئومێدی ڕزگاربوونی لێ بکەن؟

---

کَدَأْبِكَ مِنْ أُمِّ الْحُوَيْرِثِ قَبْلَها ... وَ جارَتِها أُمِّ الرَّبابِ بِمَأْسَلِ

إِذا قامَتا تَضَوَّعَ الْمِسْكُ مِنْهُما ... نَسِيمَ الصَّبا جاءَتْ بِرَيّا الْقَرَنْفُلِ

---

«دَأْب»: بە سکون و فەتحەی هەمزەکە، بە مەعنا عادەتە؛ بەڵام لە ئەسڵدا وە دواکەوتنی کاز و کۆششێکی وایە کە پێیەوە ماندوو نەبی.

«امالحويرث» و «أم الرباب»: ناوی دوو ئافرەتی دراوسێینی کـە لەپـێش ئەوەیدا گرفتاری عیشقی ئەو دۆستە تازەی بێ، سەرو ساختی لەگەڵ ئەواندا بووە.

«مأسل»: بە فەتحەی سینەکە ناوی کێوێکە و بەکەسرەی ناوێکە.

«تَضَوَّع»: فیعلی مازییە و بە مەعنا بڵاوبۆتەوەیە.

«مسك»: میسکە.

«نَسيم»: لە جێگای مەفعولی موتڵەقە و لە ئەسڵدا «تَضَوُّعًا مِثلَ تَضَوُّعِ نَسيمِ الصَّبَا» بووە و لەپاش حەرفی مەفعولی موتڵەق و سیفەتەکـەی لەگـەڵ «مضاف إِليه»، «نسيم» لە جێگای دانیشتووە و مەنسووب کراوە.

«رَيّا»: بە فەتحەی ڕێکە و شەددەی یێکە، بۆنی خۆشە.

«قرنفل»: مێخەکە.

دەڵێ: حاڵ و عادەتی تۆ سەبارەت بە خۆشەویستی ئەو خۆشەویستە تازەت وەك ئی ئەو دوانە دەچێ لە ناکامی و دووری و لێك جیابوونەوەدا کە لە جوانی و بۆنی خۆشداکاتێ کە هەڵدەستان بۆنی عەتر و عەبیریان بڵاو دەبۆوە، وەك بای سەبای لەسەرخۆ کە بۆنی مێخەك بڵاو دەکاتەوە.

فَفَاضَتْ دُمُوعُ الْعَيْنِ مِنِّي صَبَابَة    عَلَى النَّحْرِ حَتَّىٰ بَلَّ دَمْعِيَ مِحْمَلِ

«دموع»: جەمعی «دمع»ە و بە مەعنا فرمێسکە.

«صبابة»: عیشق و خۆشەویستییە.

«محمل»: بەند و قایشی شیرە.

دەڵێ: لەبەر زۆری عیشق و خۆشەویستیم بۆ ئەو دوانە، فرمێسك بە چاوانمدا دەهاتنە خوارێ و بەند و قایشی شیرەکەمی تەڕ دەکرد.

أَلَا رُبَّ يَومٍ لَكَ مِنْهُنَّ صَالِحٍ    وَ لَا سِيَّمَا يَومٍ بِدَارَةِ جُلْجُلِ

«ألا»: حەرفی ئاگادارکردنەوەیە.

«ربَّ»: حەرفی جەڕڕە و لە ئەسڵدا بۆ کەم دانراوە، کەلیمەی «کم» بۆ زۆران دانراوە، بەڵام هێندێك جار لە مەعنای یەکتردا بەکار دەبرێن، وەك «رُب» لێرەدا بۆ زۆری بەکار هێنراوە.

«سيّ»: بەتایبەتی. جا ئەگەر "ما" مای مەوسوولە بێ، ئەوە «یوم»

ئیعرابەکەی ڕەفعە دەبێ و ئەگەر زائیدیش بێ، بە مەجروری دەخوێندرێتەوە.

«دارة جلجل»: ناوی گۆلاوێکە.

دەڵێ: ئای کە چەند کات و ڕۆژی خۆش بە دڵ و ئارەزووی خۆم لەگەڵ ژنان ڕام بواردووە و لێیان بەئاوات گەیشتووم بەتایبەت لەسەر ئاوی «دارە جلجل».

وَ يَوْمَ عَقَرْتُ لِلْعُذارىٰ مَطِيَّتِي    فَيا عَجَبًا مِنْ كُورِهَا الْمُتَحَمَّلِ

«يَومَ»: لەبەر ئەوەی ئیزافە کراوە وەلای فیعلی مازی و مەبنی و مەفتوحە.

«عقر»: برینداركردن و كوشتنەوەیە.

«عذارىٰ»: جەمعی «عذراء» بە مەعنا كچە.

«عَجَبا»: ئەلفەكەی لەجیاتی یێی ئیزافەیە، چونكە لە ئەسڵدا «عَجَبی» بووە.

«كور»: جل و كورتانی وشترە.

دەڵێ: بەتایبەت ئەو ڕۆژەی كە وشتری سوارییەكەم بۆ ئەو كچانە كوشتەوە زۆرم بەلاوە عەجایب بوو كە جل و كورتانەكەیان هەڵگرتبوو.

فَظَلَّ الْعَذارَىٰ يَرْتَمِينَ بِلَحْمِهَا    وَشَحْمٍ كَهُدّابِ الدِّمَقْسِ الْمُفَتَّلِ

«ظَلّ»: لە ئەفعالی ناقیسەیە و بۆ دەوام و پەیدابوونی كارێكە لە ڕۆژدا و بە مەعنا «صار»ەیە.

«يَرتَمِين»: موزاریعی جەمعی موئەننەسی غایبە و لەبابی ئیفتیعالە و ڕمی بە مەعنا فڕێدان و هاویشتنە.

«هداب و هدب»: بە بژوڵکی چاو و ئەو شتانە دەڵێن؛ کە بە قەراغانەوە بێ.

«دمقس»: ئاوریشمە.

«مُفتَّل»: ئیسمی مەفعووله و له «فتل»ه و بە مەعنا درەوشانەوەیە.

دەڵێ: لە تەواوی ڕۆژدا کچەکان گۆشتی برژاو و کەبابی وشترەکەیان بۆ یەکتر داویشت و ئەو پیوەی کە وەك هەودا نەچندراوی قەراغی ئاوریشم و پەشمینە دەدرەوشایەوە.

وَ يَومَ دَخَلْتُ الْخِدْرَ خِدْرَ عُنَيْزَةٍ      فَقَالَتْ لَكَ الْوَيْلاتُ إِنَّكَ مُرْجِلِي

«خدر»: کەژاوە و سەراپەردە.

«مخدره»: بە ئافرەتێك دەڵێن کە لە ماڵێ وەدەرنەکەوێ و خۆی نیشانی خەڵکی نەدا.

«عنیزة»: نازناوی فاتمەی کچی مامی خۆشەویستەکەیەتی و لەبەر زەرووڕەتی شیعر مونسەریفە. دەنا دەبوو غەیرە مونسەریف بوایە. چونکە تەئنیس و تەعریفی تێدایە.

«لَكَ الويلات»: جەمعی «ویلة» بە مەعنای عەزابی سەختە.

«مرجل»: بە مەعنا پیادەکەر و ڕیسواکەرە لەلای پیاوان.

دەڵێ: ئەو ڕۆژەی کە چوومە ناو کەژاوەی عونەیزەوە گوتی: ئەی بەدبەخت کە من دادەبەزێنی و لە پێش چاوی پیاوان خەجاڵەت و ڕیسوام دەکەی.

تَقُولُ وَ قَدْ مَالَ الْغَبِيطُ بِنَا مَعاً      عَقَرْتَ بَعِيرِي يَا امْرءَ الْقَيْسِ فَانْزِلِ

«مال»: خوار بوو.

«غبیط»: جۆرێك لە جل و کورتانی وشترە.

«مَعاً»: پێکەوە.

«عَقرتَ بعیری»: واتە پشتی وشترەکەمت بریندار کرد.

«انزل»: دابەزە.

دەڵێ: لە کاتێکدا کەژاوەکە و کورتانی وشترەکە خوار ببون و خەریك بوو بەرەوبین دەیگوت: پشتی وشترەکەت بریندار کرد ئەی «امرء القیس» دابەزە.

فَقُلْتُ لَهَا سِيرِي وَ أَرْخِي زِمَامَهُ ... وَ لا تُبْعِدِينِي مِنْ جَنَاكِ الْـمُعَلَّلِ

فَمِثْلِكِ حُبْلىٰ قَدْ طَرَقْتُ وَ مُرْضِعٍ ... فَأَلْهَيْتُهَا عَنْ ذِي تَـمائِمَ مُـحْوِلِ

إِذَا مَا بَكىٰ مِنْ خَلْفِهَا انْصَرَفتْ لَهُ ... بِشِقٍّ، وَ تَحْتِي شِقُّهَا لَـم يُـحَوَّلِ

«سیري»: برۆ و لێخورە.

«أرخي» فیعلی ئەمرە لە بابی ئیفعالە و بە مانا شلکردنە.

«تبعدي» موزاریعی مەجزووم بە حەزفی نون. «ني»: نوونی ویقایە و «یا»: زەمیر موتەکەللیم.

«جن»: میوە و بە مەعنا چنینیش هاتووە.

«مُعَلَّل»: بە سیفەتی ئیسمی فاعیل و مەفعوول هاتووە لە «عَلّ»یە و بە مەعنا چەند جار ئاودانە و بە مەعنا مەشغوڵکردنی منداڵ بە میوەخواردنیش هاتووە.

«مثل»: مەجروورە بە تەقدیری «رُبَّ»ەو لە ئەسڵدا «ربّ امرَاةٍ مثلك» بووە. واتە: چەند ژنی زۆری وەك تۆ.

«حُبْلی»: ئاوس.

«طرقت»: لە «طروق»ە و بە مەعنا چون لە شەودایە.

«مُرضِع»: ئافرەتی شیردەر.

«تَمائِم»: جەمعی تـەمیمە و دوعـای چـاوەزارە کـە بـەشانی مـنداڵانـەوەی هەڵدەواسن.

«مُحول»: منداڵی یەکساڵە.

«شِقّ»: نیوەی بەدەن.

پوختەی مەعنای ئەو سێ شیعرە ئەوەیە دەڵێ: پێمگوت: لێخوڕە و جڵەوی شلکە و لە میوەی زۆری سەرگەرمکەری بێستانی ویسالت دەرم مەکە. زۆر ژنی خۆشەویستی وەك تۆ لەگەڵ ئەوەی حامیلە بوون، یان منداڵیان بەبەرەوە بـووە لەشەودا چومەلایان و هۆشی لە منداڵە خۆشەویستەکەی نەماوە کە نوشـتەی منداڵی بەشانەوە بووە و لەکاتێ گریانیدا لای سەروی بەدەنی بۆ ژێرکردنەوە و شیرپێدان بەرز کردۆتەوە بۆلای لانکی منداڵەکە و نـیوەکـەی لای خـواری لە باوەشی مندا نەبردۆتە دەرێ.

---

**وَ یَوماً عَلیٰ ظَهْرِ الْکَثِیبِ تَعَذَّرَتْ     عَـــلَيَّ وَ آلتْ حَـلْفَةً لَـمْ تُـحَلَّلِ**

---

«یَوماً»: بۆتە مەفعولوفیهی بۆ «تعذرت».

«کثیب»: تەپۆڵکەیەك لە ڕمڵ و خۆڵ.

«تعذَّرَتْ»: توندی نواند و خۆی توڕە کرد.

«آلت»:ـ سوێندی خوارد.

واتە: ئەو ڕۆژە وەیاد بێنەوە کە لە سەرتەپۆڵکە ڕمڵەکە سوێندی خوارد لێم.

أَ فَـاطِمَ مَـهْلاً بَـعْضَ هٰــذَا التَّـــدَلُّلِ
وَ إِنْ كُنتِ قَدْ أَجْمَعْتِ صَرْمِي فَأَجْمِلِي

«أ»: حەرفی «نِداءَ»ە.

«فاطم»: مونادای مورەخخەمە.

«مَهلاً»: مەفعوولی موتلەقی مەنسووبە و بە مانا لەسەرخۆبوونە لێرەدا.

«بَعضَ»: مەفعوولوبیهی «مَهْلا»یە و بە مەعنا لێگەڕانە.

«تدلل»: عیشوە و نازە.

«أجْمَعتِ»: بڕیارت داوە.

«صَرْمی»: جودایی لە من.

«أجمِلِي»: بە مەعنا ئیمان و چاکەکردنە.

دەڵێ: ئەی فاتمە کەمێك دەست لەو ناز و عیشوە هەڵگرە و ئەگەر بڕیاریشت داوە هەر جیاوە بێ بە حەوسەڵە و ئینساف ڕەفتار بکە.

أَغَرَّكِ مِـنِّي أَنَّ حُـبَّكِ قَـاتِلِي وَ أَنَّكِ مَهْما تَأْمُرِي الْقَلْبَ يَفْعَلِ

«أ»: هەمزەی ئیستفهامە و لێرەدا بۆ تەقدیرە.

«قاتل»: کوشندە، بکوژ.

«قلب»: مەبەست یان دڵی شاعیر خۆیەتی، یان دڵی دڵدارەکەیەتی.

«مهما»: هەر چۆنێك.

«تَأمُرِی»: بەلابردنی نوون بە مەعنا: ئەمر دەکەی

«**يَفعَلِ**»: لەبەر زەروورەتی وەزنی شیعر مەکسوور کراوە، دەنا لامەکەی دەبێ ساکن بێ.

دەڵێ: بەوە بە سەهو چووین کە کوشتەی عیشقی تۆم و گیانم لە گرەوی ئیشارەیەکی تۆدایە کە هەرچی بفەرمووی لای واجبە بە قسەت بکا.

یان بە مەعنایەکی دیکە دەڵێ: بەلای تۆوە وایەکە منیش وەك تو زاڵم بەسەر دڵی خۆمدا و دەتوانم دەست لە خۆشەویستی تۆ هەڵگرم؟ لە کاتێکدا لە ئیختیاری خۆمدا نەماوە و ناتوانم هەنگاوێك بە پێچەوانەی عیشقی تۆ باوێم.

**وَ إِنْ تَكُ سٰاءَتْكِ مِنِّي خَلِيقَةٌ　　فَسُلِّي ثِيٰابِي عَنْ ثِيٰابِكِ تَنْسُلِ**

«**تَكَ**»: لە ئەسڵا «تكونُ» بووە، بەهۆی «إن»ی جازیمەوە ساکن بووە و لەپاش ئەوەی کە مەجزووم بووە بە سکوون، نوونەکەی لەبەر تەخفیف حەزف کراوە، چونکە لە ئەفعالی ناقیسە یەکێك ئەوەیە کە لە سوورەتی جەزمدا موزاریعەکەی دروستە نوونەکەی حەزف بکرێ، بەو شەرتەی کە لەگەڵ زەمیری نەسبە، یان حەرفی ساکن نەبێ.

«**خليقة**»: خوو و حەوسەڵە.

«**سُلّي**»: فیعلی ئەمری «سل» و بە مەعنا دەرهێنان شتێك لە شتێك بە لەسەر خۆیی.

«**ثياب**»: لیباسە، یان کینایەیە لە «دڵ»، وەك هێندێك زانایان لەئایەتی ﴿**وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ**﴾ دا بەدڵیان مەعنا کردووە.

«**تَنسل**»: لە «نسل»ەو بە مەعنا ڕژان و هەڵوەراندنی موو و کەوتنی «پەڕ» و «خوری»یە.

دەڵێ: ئەگەر بەعزە ئەخلاق و خووڕەوشتی منت پێ خۆش نییە، لیباسەکانی من لە لیباسەکان خۆت جیا بکەوە و لە خۆتم دور بخەرەوە، هەرچەند کە دوری لەتۆ بۆ من قابیلی تەحەمول نییە و زۆر سەختە، بەڵام ناتوانم بێ ئەمریت بکەم. ئەو کاتە لیباسەکانم وەك پەڕی باڵندە، یان مووی حەیوانات دوور لەتۆ فڕێ دەدرێن.

یان دەڵێ: ئەگەر ئەتۆ دەتوانی و پێت ئەکرێ، دڵم لەناو دڵت بێنیەدەر، تا دڵت ئاسوودە دەبێ؛ چونکە من خۆم ناتوانم ئەو کارە بکەم.

وَ مٰا ذَرَفَتْ عَيْنٰاكِ إلا لِتَضْرِبِي بِسَهْمَيْكِ فِي أَعْشٰارِ قَلْبٍ مُقَتَّلِ

«ذرف»: فرمێسك هەڵوەراندن.

«تَضرِبي»: مەنسووبە بە حەرفی «أن»ی ناسیبەی موقەددەرە.

«سهمي»: «سَهْمَيْنِ» تەسنییەی «سهم» و بە مەعنا «تیر»ە، نوونەکەی بە هۆی ئیزافەوە حەزف کراوە.

«أعشار»: یان لەفزێکە بەبێ موفرەد و بە مەعنا پارچە پارچەیە، یان جەمعی عوشرە و بە مەعنا دەیەکە.

«مُقَتَّل»: ئیسمی مەفعوولە و لە «قتل»ە و بە مەعنا زەلیل و ئیتاعەکردنە.

واتە: گریە و تەماشاکردنەکەت تەنیا کوشتن و دڵشکاندنی منە، چونکە فرمێسکی دوو چاوەکانت وەك تیر کار لە دڵم دەکەن و وەك «دیزە» پارچە پارچەی دەکەن.

یان مەعنای وایە دەڵێ: بەو فرمێسك هەڵوەراندنەت دەتهەوێ لە یاری و بازی عیشقدا سەرتاپای دڵم وەدەست بێنی وەك قومارباز‌ێك.

وَ بَيْضَةِ خِدْرٍ لا يُرامُ خِباؤُها تَمَتَّعْتُ مِنْ لَهْوٍ بِها غَيرَ مُعْجِلِ

«بيضة»: هێلکەی مریشك، یا ئی نەعامە و «شترمرغ»ە و مەجرووره بەواوی «رُبَّ».

«یرام»: موزاریعی مەجهول و له «روم»ە و بە مەعنا قەسره.

«خباء»: ڕەشماڵە لە موو و خوری و بەرگن.

«غیر»: ئەگەر مەجرووری وەخوێنین سیفەتی «لهو»ە و ئەگەر مەنسووبیش بێ دەبێتە حاڵ.

«مُعجل»: ئیسمی فاعیلی بابی «إفعال»ە و لە «عجل»ە.

دەڵێ: ئەی کە تا ئێستا لەگەڵ چەندین ئافرەتی نەرم و ناسك و دەست لێنەدراوی ڕەنگ وەك هێلکە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەرگیز لە ڕەشماڵ نەچوونە دەرەوە و کەس دەستی لێنەداوە، ئەمن بە بێ‌شێواوی و پەشۆکان لەگەڵم ڕابواردووە و بە ئارەزووم گەیشتووم.

تَجاوَزْتُ أَحْراساً إِلَيْها وَ مَعْشَراً عَلَيَّ حِراصاً لَوْ يُسِرُّونَ مَقْتَلِي

«احراس»: جەمعی «حارس»، یا جەمعی «حَرَس»ە و بە مەعنا ئێشك‌گرە و پاسەوانە.

«معشر»: خێڵ و دەستە.

«حراص»: جەمعی «حریص»ە.

«یُسِرُّون»: بە مەعنا ئاشکراکردن و شاردنەوەیە.

دەڵێ: بەنێو پاسەوان و ئێشك‌گرانێکی زۆردا خۆم گەیاندۆتە ئەو ژنە، هەرچەندە بە خوێنی سەرم تینوو بوون، ئەگەر بیانتوانیایە و دەستیان پێم بگەیشتایە بە هەر جۆرێك بوایە دەیانکوشتم.

إِذَا مَا الثُّرَيَّا فِي السَّمَاءِ تَعَرَّضَتْ    تَعَرُّضَ أَثْنَاءِ الوِشَاحِ الْمُفَصَّلِ

«ثریا»: چەند ئەستێرەیەکن لە بورجی «ثور»دان.

«تعرض»: بە مەعانی ڕووتێکردن و نیشاندان و ڕۆیشتن بەلای پانی شتدا.

«أثناء»: قەراغ و ناوەڕاستی ڕاخراو.

«وشاح»: بەرمووری ژنان.

«مفصل»: بە بەرمورێك دەڵێن کە نێو بە نێو دوڕڕ و گەوهەر و مەرجانی تێدا بێ.

دەڵێ: کاتێ چوومە لای ئەو ژنە کە ئەستێرەی حەوتەوانە و کۆ و تەرازوو لە ڕۆژهەڵاتی ئاسمانەوە سەریان وەدەرنابوو دەبیندران.

فَجِئْتُ وَ قَدْ نَضَّتْ لِنَوم ثِيَابَهَا    لَدَى السِّتْرِ إِلَّا لِبْسَةَ الْمُتَفَضِّلِ

«نضا»: لیباس دانان.

«سِتر»: پەردە.

دەڵێ: چووم بۆلای لە کاتێکا لە نزیکی پەردە بوو، وە لیباسەکانی دانابوو بێجگە لە لیباسی خەوەکەی.

فَلَمّا أَجَزْنا ساحَةَ الْحَيِّ وَانْتَحىٰ     بِنا بَطْنُ خَبْتٍ ذِي حِقافٍ عَقَنْقَلِ

**«"اجاز" المكان و جازه»**: یەعنی لەو جێگایە ڕۆیشت و تێپەڕی.

**«حيّ»**: عەشیرەت. یان جێگا و گەڕەك.

**«انتحى»**: تێکەی زائید و نوونەکەی ئەسڵیە و لەبابی ئیفتیعالە و بە مەعنا باوەڕ و ئیعتیمادە.

**«بطن»**: بە جێگایەکی هەموار و دەشت دەڵێن کە لە دەورەی بڵندی هەبێ.

**«خبت»**: عەرزێکی نەرم و سەرەوژێر.

**«حقاف»**: تەپۆڵکەی ڕمڵ و خۆڵ.

**«عقنقل»**: یەعنی عەرزێکی سەخت و ناهەموار.

دەڵێ: کاتێ لەلای خێڵەکە ڕۆیشتین و گەیشتینە ئەو جێگا ئەمین و خەڵوەتییە و کرا ئەوەی کرا، کە بۆ گێڕانەوە نابێ.

هَصَرْتُ بِفَوْدَيْ رَأْسِها فَتَمايَلَتْ     عَلَيَّ هَضِيمَ الْكَشْحِ رَيَّا الْمُخَلْخَلِ

**«هصر»**: ڕاکێشان.

**«فودان»**: مووی سەر و بن گوێی ڕاکێشان.

**«هضيم الكشح»**: یەعنی قەد باریك.

**«رَيّا»**: یەعنی تێراو.

**«مخلخل»**: جێگای خرخاڵ لە پێدا.

دەڵێ: کاتێ گەیشتینە ئەو جێگا خەڵوەتییە و دوور لەچاوی ڕەقیبان، لە دوو

لاوە پرچەکانم ڕاکێشا و لە باوەشم گرت، ئەو بەژن و باڵا ناسکە و تەنیشت زەعیفە و ناوقەد باریك و بەلەك قەڵەوە.

مُهَفْهَفَةٌ بَيْضاءُ غَيْرُ مُفاضَةٍ    تَرائِبُها مَصْقُولَةٌ كَالسَّجَنْجَلِ

«**مهفهفة**»: ژنی مەیلە و زەعیفی ناسك بەدەن.

«**مُفاضَة**»: ژنی زگ زلی گۆشتن.

«**ترائب**»: جەمعی «تربیة» جێگای گەردن بەند لە سەر سنگی ئافرەت.

«**مصقولة**» پاککردنەوەی ژەنگ و چڵك.

«**سجنجل**»: ئاوێنە. بەلای هێندێکانەوە بە مەعنا پارچەیەك ئاڵتوون و تەلایە.

دەڵێ: ژنێکە ناوقەد باریك، زگ بچووك و زەعیف، نەك زگ زل و گۆشتن، سینگی وەك ئاوێنە دەدرەوشێتەوە.

كَبِكْرِ الْمُقاناةِ الْبَياضَ بِصُفْرَةٍ    غِذاها نَمِيرُ الْماءِ غَيْرُ الْمُحَلَّلِ

«**بِكْر**»: بە ئەووەڵی هەموو شتێك دەڵێن.

«**مقاناة**»: پەروەردە کراو.

«**البیاض**»: سپی.

«**نمیر**»: ئاوی ساردو خۆش.

«**محلل**»: یان لە «حلول»ە یا لە «حلّ»ە.

دەڵێ: ڕەنگی سپی و مایل بەزەردە، وەك هێلکەی نەعامە وایە. ئاوی خواردنەوەی سافی و خالیسە و لەسەر ڕێگای خەڵکدا نییە تا لێڵی بکەن. جا

کەسێك بە ئاوێکی وا پەروەردە کرابێ دەبێ چەند ناسك و لەتیف و خۆش مەشرەف بێ.

یان مەعنای وایە دەڵێ: لە ڕەنگ و جوانیدا وەك دانەی مرواریەکە بە ئاوێکی وا پەروەردە کرابێ کە لەبنی دەریادا دەستی لێ نەدرابێ.

| | |
|---|---|
| تَصُدُّ و تُبْدِي عَنْ أَسِيلٍ وَ تَتَّقِي | بِنَاظِرَةٍ مِنْ وَحْشِ وَجْرَةَ مُطْفِلِ |

«صد»: ڕوو وەرگێڕان.

«إبداء»: ئیزهار.

«أسيل»: گۆنا.

«تتقي»: خۆی دەپارێزی.

«ناظرة»: چاو.

«وحش»: جەمعی «وحشی».

«وَجرَة»: ناوی جێگایەکە.

«مطفل»: خاوەن منداڵ.

دەڵێ: ڕووی لە ئێمە وەردەگێڕی و گۆنا و ڕوومەتی جوانی نیشان دەدا و بە چاوێك تەماشا دەکا وەك چاوی ناسك و گاکێوی شوێنی «وجرة»، لەکاتێکداکە بە چکەی هەبێ، لەبەر ئەوەی چاوەکانی پڕبوون لە خۆشەویستی، وەك چاوی ئەو حەیواناتانەی کە تەماشای بەچکەکانیان دەکەن.

| | |
|---|---|
| وَ جِيدٍ كَجِيدِ الرِّئْمِ لَيْسَ بِفَاحِشٍ | إِذَا هِـيَ نَـصَّتْهُ وَ لَا بِـمُعَطَّلِ |

جید: گەردن.

«رەم»: ئاسكی سپی خالیس.

«فاحِش»: زیاد لە ئەندازە.

«نص»: بڵندكردنەوە.

دەڵێ: گەردنێك نیشاندەدا وەك گەردنی ئاسك، بەڵام بە گەردەنەكەی لە ئەندازەی جوانی دەرناچی ئەگەر بە گەردنبەند خۆی دەرازێنیتەوە.

---

وَ فَرْعٍ یَزِینُ الْمَتْنَ أَسْوَدَ فاحِمٍ  أثیثٍ كَقَنْوِ النَّخْلَةِ الْـمُتَعَثْكِلِ

---

فرع»: مووی پڕ و ئینسانی موو زۆر.

«متن»: پشت.

«فاحم»: زۆر ڕەش.

«أثیث» موو، یا گیایی زۆر و پڕ و ڕەش، وەك هێشووی داری خورمای زۆر خاوەن بەر.

دەڵێ: زولفانێك نیشان دەدا زۆر پڕ و ڕەشن. وەك هێشووی دارخورمای زۆر خاوەن بەر.

---

غدائِرُهُ مُسْتَشْزِراتٌ إِلَي الْـعُلیٰ  تَضِلُّ الْعِقاصُ فِي مُثَنّیً وَ مُرْسَلِ

---

«غدائر»: جەمعی «غدیرة» یەعنی چەپكێك موو.

«مستشزرات» ئیسمی فاعیل جەمعی موئەننەسە لە بابی ئیستیفعالە و لە

«شزر» و بە مەعنا قایم و مەحکەم، یان بە مەعنا بڵند و مڵند بوونە. کە لەو وەختەدا بە ئیسمی فاعیل و مەفعوول دەخوێندرێتەوە.

«عُلیٰ»: لای سەرەوە.

«تضلّ»: ون دەبێ.

«عقاص»: جەمعی «عقیصة»ە، بە مەعنا لێك هاڵاو.

«مثنی»: مودی بریقەدار و بە قۆرت و پێچ.

«مرسل»: مووی ئازاد نە وەندراوە.

دەڵێ: دەستە مووی زوڵفەکانی لێك هاڵابوون و بەرز ببوونەوە، ئەو بەشەی کە لێك هاڵابوو لە نێو ئەوانەدا کە وەندرابوونەوە و بەردرابوونەوە شاردرابوونەوە، یەعنی پرچەکانی ئەوەندە پڕ و زۆر بوون ببوونە چەند بەش، هێندێکی بەرز کردبوونەوە و لەسەر سەری قوت بووبوونەوە و بەشی زۆری بەردابوونەوە و هێندێك لوول و لێك هاڵا بوون.

---

وَ كَشْحٍ لَطِيفٍ كَالْجَدِيلِ مُخَصَّرٍ وَ سَاقٍ كَأَنْبُوبِ السَّقِيِّ الْمُذَلَّلِ

---

«كشح»: تەنیشت.

«جدیل»: ئاوساری قایش.

«مُخَصَّر»: ناوقەد باریك.

«انبوب»: بەینی دوو گرێی بلوێر.

«سقی»: لێرەدا بە مەعنا ئاو دراوە.

مذلل: بە دارخورمایەك دەڵێن کە بەری زۆر بێ و داری وەبەر دەن تا نەشکێتەوە.

دەڵێ: زگ زەعیف و ناوقەد باریکێکە کەلەکەی وەك ئاوسارێکی چەرمی باریك وایە و بەلەکی وەك قەدی ئەوگوڵە وایە لە سافی و سپیەتیدا کە لەبن سێبەری دارخورمادا پەروەردە کرابێ.

وَ تُضْحِي فَتِيتُ الْمِسْكِ فَوْقَ فِرَاشِهَا نَؤُومُ الضُّحىٰ لَمْ تَنْتَطِقْ عَنْ تَفَضُّلِ

«تضحی»: فیعلی ناقیسە و بۆ کردنی کارێك لە چێشتەنگاودایە.

«فتیت»: وردکردن و کوتراوی هەر شتێك بێ.

«نوؤم» خەواڵوو.

«لم تنتطق»: پشتێندی نەبەستووە.

«عَن»: لەپاش.

«تفضل»: لەبەرکردنی کراسی خەو و کار.

دەڵێ: لەبەر ئەوەی کە گوزەرانی خۆشەو دەوڵەمەند و قەرەواشی هەن. تا چێشتەنگاو لە جێگادا هەڵناستی و بۆنی میسك لە جێگاکەیدا بڵاو دەبێتەوە و لەسەر کراسی تەنکی کارکردنەوە پشتێند نابەستێ چونکە کار ناکا و لە ناز و نیعمەتدا ڕایدەبوێرێ.

وَ تَعْطُو بِرَخْصٍ غَيْرِ شَثْنٍ كَأَنَّـهُ أَسَارِيعُ ظَبْيٍ أَوْ مَسَاوِيكُ إِسْحِلِ

«تَعطُو»: دەست دەبا بۆ کار.

«رخص»: نەرم و لەتیف.

«شثن»: ئەستوور و سەخت.

«أساريع»: جەمعی «أسروع»، کرمی ناو گیایان، یان جێگایەکی شێدار کە قامکی ژنانی پێ تەشبیە دەکەن.

«ظبي»: ناوی جێگایەك.

«مساويك»: جەمعی «مسواك». واتە: سیواك.

«اسحل»: دارێکە لەقەکانی ڕاست و باریکن دەیانکەن بە سیواك کە قامکی ژنان بەوان تەشبیھ دەکەن.

دەڵێ: بە دەستی نەرم و لەتیف دەست دەبا بۆ شت، نەک بە پەنجەی ئەستوور و سەخت کە وەک کرمی ناو گیاکانی دۆڵی «ظبي»، یان وەك میسواکی داری «اسحل» وان.

| تُضِيءُ الظَّلامَ بِالْعَشاءِ كَأَنَّها | مَنارَةُ مُمْسىٰ رَاهِبٍ مُتَبَتِّلِ |
| --- | --- |

«تضيئ» موزاریعی «أضأ» لە «ضوء»ە و بە مەعنا ڕووناکی.

«ظلام» تاریکی.

«عشاء» دوای ڕۆژا ئاوا.

«منارة»: جێگای ڕووناك و چرا.

«ممسى»: لەدوا نیوەڕۆ تا ڕۆژ ئاوا.

«راهب»: دێرنشینێك کە تەرکی دنیای کردبێ.

دەڵێ: جوانی و ڕووناکی ڕوخساری یار تاریکی شەو وا ڕووناك دەکاتەوە وەك چرای ڕووناکی ئەو عابیدە دێرنشینە لەکاتی شەودا.

إِلَىٰ مِـثْلِهَا يَـرْنُو الْـحَلِيمُ صَـبَابَةً    إِذَا مَا اسْبَكَرَّتْ بَيْنَ دِرْعٍ وَ مِجْوَلِ

«يَرْنُو»: دەڕوانی.

«حليم»: عاقڵ.

«صبابة»: مەفعوولولەهو، یەعنی لە ڕووی عیشق و خۆشەویستییەوە.

«اسبكرّت»: لەبابی «افعللال» و ڕوباعی و مـەزیدوفـیهی. واتـە: لە ڕووی عیشق و خۆشەویستییەوە خۆی بەرز دەکاتەوە.

«درع»: کراسی ژنان.

«مجول»: یەعنی کراسی بچووکی کچی ساوا.

یەعنی: پیاوی عاقڵ لەڕوی شەوق و عیشقەوە تەماشای ژنێکی ئاوا دەکا لەو کاتەیەداکە لەناو چەند ژن وکچی نابالّق بە بەژن و باڵای جوان و ڕاست و بڵند و ڕێك و پێکەوە خۆی بنوێنی. واتە: لە منداڵی تێپەڕی بێ و هێشتا بە حەددی بلۆغ نەگەیشتبێ. بەڵام بەقیافە و قەدو باڵا لەناو هەمواندا دیار و مومتاز بێ.

تَسَلَّتْ عَمَايَاتُ الرِّجَالِ عَنِ الصِّبَا    وَ لَيْس فُؤَادِي عَنْ هَوَاكِ بِـمُنْسِلِ

«تسلت»: ئارام و ئاسودە دەبوو.

«عمايات»: جەمعی «عماية» بە مەعنا گومڕاو وەدوا شتی بێ مەعنا کەوتن.

«صبا»: منداڵی و کاری منداڵانەکردن.

«فؤاد»: دڵ و عەقڵ.

«هواك» عیشقی تۆ.

««منسل» ئیسمی فاعل لەبابی «انفعال»ە، «سلو»: بە مەعنا دڵ ئاسوودەیی و غەم ڕۆیشتنە. لە ئەسڵدا «منسلی» بووە و یێکەی لەبەر تەخفیف حەزف کراوە.

دەڵێ: گومڕاهی و کارە خەراپ و بێ جێکانی پیاوان نەما و لەدواگەنجی و لاوی دڵیان ئاسوودە بوو، لە شێتی عیشق و حەزلێکردن دەستیان هەڵگرت، بەڵام دڵ و عەقڵی من سەبارەت بە عیشق و خۆشەویستی تۆ ئارام ناگرن و بەهیچ وەسیلەیەك دەست هەڵناگرن.

---

**أَلَا رُبَّ خَصْمٍ فِيكِ أَلْوىٰ رَدَدْتُهُ    نَصِيحٍ عَلىٰ تَعْذالِهِ غَيرِ مُـؤْتِلِ**

---

«**خصم**» واتە: دوژمن. وە هێندێك عەرەب لایان وایە تەسنییە و جەمع و تەئنیسی نییە، وەك لە قورئانی پیرۆز لە سوورەی «ص» لە ئایەتی بیستدا دەفەرمووێ: ﴿وَهَلْ أَتَاكَ نَبَؤُاْ الْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا الْمِحْرابَ﴾.

«**أَلوىٰ**»: بە کەسێك دەڵێ کە لە دوژمنایەتیدا زۆر شێگیر و توند و تیژ بێ.

«**نصیح**»: دڵسۆز و ئامۆژگاریکەر.

«**تَعذال**»: لۆمە و سەرزەنشت.

«**مؤتل**»: لە ئەسڵدا «مؤتلی» و لەبابی ئیفتیعالە و لە «الو» و بە مەعنا تەقسیرە.

دەڵێ: زۆر وشیار بە و بزانە کە ئێستا زۆر دوژمنی داغ لەدڵ ئامۆژگاری و سەرزەنشت و لۆمەیان کردووم سەبارەت بە خۆشەویستنی تۆ و ویستوویانە دەستم پێ لە خۆشەویستی تۆ هەڵگرن، بەڵام دەستم بەسینگی پڕ لە داخیانەوە ناوە و جوابم کردن و نەیانتوانیوە دەستم پێ هەڵگرن.

وَلَيْلٍ كَمَوْجِ الْبَحْرِ أَرْخىٰ سُدُولَهُ    عَلَيَّ بأَنْواعِ الْهُمُومِ لِيَبْتَلِي

**«لیل»**: مەجرووره به واوی «رُبَّ»ە.

**«أرخی»**: هەڵاوەسین و دادانەوە.

**«سدول»**: جەمعی «سدل»، یەعنی پەردە.

**«هموم»**: جەمعی «همّ»ە بە مەعنا غەم و خەفەت.

**«بێ» لە «بأنواع»دا بە مەعنا مەعەیە، واتە لەگەڵ.**

**«یبتلی»**: لە «ابتلا»یە و بە مەعنا تاقیکردنەوە و ئیمتیحانە.

دەڵێ: تا ئێستا چەندین شەوی وەك مەوج و شەپۆلی دەریا و وەحشەتناك و ترسناك داوێنی ڕەشی خۆیان پڕ لە ئەنواعی خەم و خەفەت بەسەر مندا کێشاوە تا من تاقی بکەنەوە و سەبر و خۆڕاگری من لە بەرامبەر بەڵا و موسیبەتدا بزانن.

فَقُلْتُ لَهُ لَمَّا تَمَطّىٰ بِصُلْبِهِ    وَ أَرْدَفَ أَعْجَازاً وَ نَاءَ بكَلْكَلِ

**«تمطی»**: درێژە بۆوە.

**«صلب»**: پشت.

**«أردف»**: دواکەوتن و بە دوا خۆدا بردن.

**«أَعجاز»**: بەشی دواوەی هەر شتێك.

**«ناء»**: دوورکەوتنەوە.

**«کَلکَل»**: واتە سینگ و بەرۆك.

دەڵێ: بە شەوم گوت: کاتێك پشتی خۆی درێژ کرد و سەرین و ڕانی خۆی بەدوا خۆیدا هێنا و سینگی دوورکەوتەوە، خولاسە شەو ڕۆژ درێژ بوو ئەووەڵ و ئاخری زۆر لێك دوورکەوتنەوە، شەوێکی زۆر سەخت و ناهەموار بوو. ناچار بووم بە شەوم گوت:

| | |
|---|---|
| أَلا أَيُّهَا اللَّيْلُ الطَّوِيلُ أَلاَّ انْجَلِي | بصُبْحٍ وَ مَا الْإِصْبَاحُ مِنْكَ بِأَمْثَلِ |

«أَلا»:ی یەکەم بۆ ئاگادارکردنەوەیە و ئەوەی دووەم تەمەنناو ئارەزویە.

«أَيُّها»: منادای موبهەم بە حەزفی حەرفی نیدایە.

«الليل»: سیفەتە بۆ «أَيُّها».

«انجلی»: فیعلی ئەمری بابی «انفعال» و بە مەعنا دەرکەوتن و لاچوونە.

«إصباح» ڕۆژ بونەوەیە.

«أمثل» چاکتر.

بێی «بصبح»: بۆ سەببیەتە، یان بە مەعنا «عَن»ە.

دەڵێ: گوتم: ئاگادار بە ئەی شەوی درێژ خۆزگە دەبووی بە ڕۆژ و بە هاتنی ڕۆژ ڕەفعی زەحمەتت دەکرد، ئەگەر چی ڕۆژیش لەتۆ باشتر نییە، چونکە ڕووناکی و تاریکی لە دڵ و دیدەی عاشقی ناکامدا ئەوەندەیان فەرق و جیاوازی نییە.

| | |
|---|---|
| فَيَالَكَ مِنْ لَيْلٍ كَأَنَّ نُجُومَهُ | بِأَمْرَاسِ كَتَّانٍ إِلَى صُمِّ جَنْدَلِ |

**«فاء»**: عاطفه و

**«یا»**: بۆ نیدا و بانگکردن.

**«لك»**: تەعەجوب و سەرسامی دەگەیەنی.

**«أَمراس»**: وەك دەرگای ئاسن و ئەنگوستیلەی زێڕ، تەنافی زۆر ئەستوور.

**«أصم»**: سەخت و ڕەق.

**«جندل»**: بەرد.

دەڵێ: ئەی شەو سەرم سوڕماوە لە درێژی بێ‌ئینسافی تۆ.

یان بە مەعنا دەڵێ: ئەی قەوم فریام کەون سەرم سوڕماوە لە درێژی بێ‌ئینسافی تۆ.

یان بە مەعنا دەڵێ: ئەی قەوم فریام کەون سەرم سوڕماوە لەو شەوەی کە ئەستێرەکانی بە تەنافێکی زۆر قایم لە کەتانی بە بەردێکی زۆر سەخت و مەحکەمەوە بەستراونەوە و هەڵناکەندرێ و ناڕوا و ڕەفعی زەحمەت ناکا و ڕزگارم بێ.

---

**وَ قِربَةِ أَقْوامٍ جَعَلْتُ عِصٰامَهٰا         عَلیٰ کٰاهِلٍ مِنّي ذَلُولٍ مُرَحَّلِ**

---

زۆربەی زانایان دەڵێن؛ لەو شیعرەوە تا شیعری «کِلانٰا» لەو قەسیدە نەبووەو بەعزێکان هاویشتوویانەتە سەری.

**«قربة»** بە کەسرەی قافەکە بە مەعنا مەشکەی ئاوە.

**«عصام»**: پەتی مەشکەی ئاو.

**«کاهل»**: شان.

**«مُرَحَّل»**: ئیسمی مەفعوول و بۆ موبالەغە لە هەڵگرتن و خۆڕاگرتنە.

دەڵێ: زۆر جار مەشکەی ئاوم بە شانی داداوە و چوومە سەرکار و دەستەمۆکەی خۆم گرتووە و هاوڕێکانم خزمەت کردووە.

یان مەبەستی پێی ئەوەیە دەڵێ: لەکاتی بەڵا و موسیبەت و ژیانی خەڵکدا خۆم بە بەرپرس زانیوە و زەحمەتی بەجێگەیاندنی کار و ئارەزووی خەڵکم قەبووڵ کردووە و بە زەحمەتم نەزانیوە.

وَ وادٍ كَجَوْفِ الْعَيْرِ قَفْرٍ قَطَعْتُهُ بِهِ الذِّئْبُ يَعْوِي كَالْخَلِيعِ الْمُعَيَّلِ

**«وادی»**: شیو، یان دەشتێك لە بەینی کێو و تەبۆڵکەدا.

**«جوف»**: سک و ناوی شت.

**«عیر»**: جاشەکەر، «جوف العیر»: بە جێگایەك دەڵێن کە پێشتر سەرسەوز ئاوەدان بووبێ، بەڵام بە تێپەڕبوونی زەمان گەڕابێت بە چۆڵ و وێرانە.

**«قفر»**: خاڵی، وشك.

**«بە»**: لەودا.

**«ذئب»**: گورگ

**«یعوی»**: دەلوورێنێ.

**«خلیع»**: دەرکراو، یان قومارباز.

**«مَعَیَّل»**: خاوەن منداڵی زۆر.

دەڵێ: ئای کە تا ئێستا چەندین دەشت و سەحرای خاڵی لە خەڵك وەك زگی برسی جاشەکەر و خاڵی و بەتاڵ لە لەوەڕ، یان وەك زگی کەرێکی بەرهەڵداو بێ‌سوود، یان وەك ماڵی ئەو کەسەی کە لە قەومی عاد مابۆوە و ناوی حیمار بووە و لەپاش تەمەنێکی زۆر لە خواپەرستیدا کافر و ماڵوێران و

بەدبەخت بووە، پێیاندا ڕۆیشتووم کە گورگ وەك کەسێکی دەرکراو هەر لوورەی بووە، یان وەك قوماربازێکی خاوەن منداڵ و نەدار کە دەنەڕێنێ و هاوار دەکا.

فَقُلْتُ لَهُ لَمّا عَوىٰ إِنَّ شَأْنَنا قَلِيلُ الغِنىٰ إِنْ كُنْتَ لَمّا تَمَوَّلِ

«قلیل الغنی»: یەعنی دەست کورت و بێنەوا و لە ئیعرابدا خەبەرە بۆ «إِنَّنا»ی مەحزووف و لە ئەسڵدا ئاوا بووە: «إِنَّ شَأْنَنا إِنَّنا قليل الغِنىٰ».

«لَمّا»: بە مەعنا «لم»ە وەك لەو ئایەتەی سوورەتی ئالیعیمراندا دەفەرموێ: ﴿وَ لَمّا يَعْلَمِ اللّٰهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنْكُمْ﴾ دا کە بە مەعنا «لم»ە.

دەڵێ: کاتێ گورگ دەستی کرد بە لوورەلوور پێمگوت: وەزع و حاڵی هەردوکمان هەژارییە و بەخۆڕایی وەدوا سەرووەت و ماڵکەوتنە، ئەگەر تۆش وەك من ماڵ و حاڵێکت نەبێ.

كِلانا إِذا ما نالَ شَيْئاً أَفاتَهُ وَ مَنْ يَحْتَرِثْ حَرْثِي وَ حَرْثَكَ يَهْزَلِ

«کلانا»: هەردوکمان.

«أَفاتَهُ»: لە دەست دەدەن.

«حرث»: لە ئەسڵدا بە مەعنا کێڵان و تۆوچاندنە، بەڵام لێرەدا بە مەعنا کار و تێکۆشانە.

«یَهزل»: جەزای «منْ» جازمەیە و مەجزوم بە سکوونە، بەڵام لەبەر زەرووڕەتی شیعر مەکسوور کراوە.

دەڵێ: هەر یەکێك لە من و تۆ ئەوەی دەستی دەکەوێ بە ئیسراف و وێڵخەرجی لە دەستی دەدەین و ئەوەی وەك ئێمە کار و کاسبی بکا نەدار و ژیان ناخۆش دەبێ.

وَقَدْ أَغْتَدِي وَالطَّيْرُ فِي وُكُنَاتِها    بِمُنجَرِدٍ قَيْدِ الْأَوابِدِ هَيْكَلِ

«أَغتَدي»: زوو دەچمەدەرێ.

«طَيَر»: جەمعی «طائر»ە وەك چۆن «تَجَر» جەمعی «تاجر»ە.

«وُكُنات»: یەعنی هێلانە.

«مُنجَرِد»: توندڕەو، یان کەم موو.

«قيد الأوابد» بەندی گیان لە بەرانی وەحشی.

«هيكل»: ئەسپی گەورەو خۆشڕەوی وەحشی گیر.

دەڵێ: ئیستا پەڕەندە و باڵدار هەر لەناو هێلانەکاندا بوون کە ئەمن سواری ئەسپی وەحشیگیری خۆشڕەو سوار بووم و زوو چوومە دەرەوە.

مِكَرٍّ مِفَرٍّ مُقْبِلٍ مُدْبِرٍ مَعاً    كَجُلْمُودِ صَخْرٍ حَطَّهُ السَّيْلُ مِن عَلِ

«مِكَر مِفَر»: لە کەڕو فڕن بە مەعنا هات و چۆن، «مكرّ»: ئەسپێکە کە لە شەڕا چاك هێرش نەبات، «مفرّ»: ئەسپی تیژ.

«مُقبل و مُدبر»: بە مەعنا ڕوو تێکردن و پشت تێکردن.

«جلمود صخر»: بەردی گەورەو سەخت

«حط»: سەرەو ژێری کردەوە.

«عل»: سەرەوە.

دەڵێ: ئەو ئەسپە لەیەك کاتدا پەلامار دەداو دەگەڕێتەوە. ڕووی تێدەکا و پشت هەڵدەکاتەوە. وەك بەردێکی گەورە و سەخت وایە کە سێلاو هەڵیدەکەنێ و بە توندی بەملا و ئەولایدا دەدا.

---

کُمیتٍ یَزِلُّ اللِّبْدُ عَنْ حَالِ مَتْنِهِ      کَمَا زَلَّتِ الصَّفْواءُ بِالْمُتَنَزِّلِ

---

«کمیت»: تەسغیری «اکمت» بە غەیری قیاس، بە ئەسپێك دەڵێن کە ڕەنگی لەبەین ڕەشی و سووریدا بێ و ناوی شەرابیشە.

«یزل»: دەخزێ.

«لبد»: لبادی بن زین.

«حال متنه»: ناوەڕاستی پشتی.

«صفواء»: بەردی سەخت و ڕەق.

«متنزل»: بارانی باریو. یان ئەو کەسەی لەسەر بەرد دانیشتووە.

دەڵێ: ئەسپێکی ڕەنگ ڕەش و سوورە، بەهۆی قەڵەوی و لووسی پشتی لبادی بن زینەکەی دەخزێ و بەپشتیەوە بەند نابێ، وەك بەردێکی ساف و لووس کە دڵۆپەی باران لەسەر خۆی ڕاناگری.

---

عَلَى الذَّبْلِ جَيَّاشٍ كَأَنَّ اهْتِزامَهُ      إِذَا جَاشَ فِيهِ حَمْيُهُ غَلْيُ مِرْجَلِ

---

«ذبل»: زەبوونی و کزی.

«جيّاش»: زۆر بەجۆش.

«اِهتزام»: شکان.

«حَمیٰ»: حەرارەتی توڕەبوون و شتی وا.

«مِرْجَل»: مەنجەڵ.

دەڵێ: ئەو ئەسپە هەرچەند زگی بچووك بوو، بەڵام لە کاتی غاردانـدا ئەوەندە بەتوانا بوو کە نرکەی هەناسە و پرمەی لە گەروویدا لە وەختی تووڕەبوون و هەیەجانیدا وەك دەنگی قوڵتە و کوڵینی مەنجەڵ وایە.

## مِسَحٍّ إِذٰا مَا السّٰابِحٰاتُ عَلَى الْوَنیٰ أَثَرْنَ الْغُبٰارَ بِالْكَدِيدِ الْمُرَكَّلِ

«مِسَح»: سیغە موبالەغەیە و بە مەعنا بڵاوکردنەوەیە.

«سابح»: بە ئەسپێك دەڵێن کە لەوەختی غاردانـدا وەك مەلەوان دەستان درێژ بکا.

«ونیٰ»: ماندویی.

«أثر»: وەحەرەکە خستن و پەیداکردن.

«غبار»: تۆزو خۆڵ.

«کدید»: عەرزی سەخت و هەموار.

«مرکل»: بەو عەرزە دەڵێن کە لە ژێر سمی ئەسپاندا زۆر کوترابێتەوە.

دەڵێ: کاتێ ئەسپانی غاردەر و تۆندڕەو لەبەر ماندووبوونیان لە عەرزی کوتراودا تەپوتۆز هەڵدەستێنن، ئەو ئەسپە وەك مەلەوانی چاك بە ئاسانی توند و گورج و گۆڵ غار دەکا و دەڕوا.

| يَزِلُّ الغُلامُ الْخِفُّ عَن صَهَوٰاتِهِ | وَ يُلْوِي بِأَثْوٰابِ الْعَنِيفِ الْمُثَقَّلِ |
|---|---|

«**خف**»: سووك.

«**صَهوَة**»: یەعنی جێگا دانیشتنی سوار لەسەر پشتی ئەسپ.

«**یلوی بالشیء**»: یەعنی ئەو شتە فڕێدەدا و دەیبا.

«**عنیف**» یەعنی سەخت و بێبەزەیی.

«**مثقل**» یەعنی قورس و سەنگین.

دەڵێ: ئەو ئەسپە ئەوەندە ئازایە، ئەگەر گەنجێك سواری بێ خۆی بۆ ڕاناگیرێ و دەخزێ لەسەر پشتی، وە ئەگەر ئینسانێکی کارامە و سوارچاك و وریا و قورسیش سواری بێ، ئەوە بەهۆێ تاودان و توندی غاردانیەوە لیباسەکانی دوور فڕێدەدا.

| دَرِيرٍ كَخُذْرُوفِ الوَلِيدِ أَمَرَّهُ | تَتَابُعُ كَفَّيْهِ بِخَيْطٍ مُوَصَّلِ |
|---|---|

«**دریر**»: لە «درّ»ە و بە مەعنا سەریعە.

«**خذروف**»: شتێکە کە منداڵان کونی دەکەن و پەتێکی تێدەخەن و لەسەر سەری خۆیان هەڵیدەسوڕێنن.

«**ولید**»: منداڵ.

«**أَمَر**»: چاك و بە قووەت و مەحکەم.

«**تَتَابع كفيه**»: لە وەختی غاردانـدا هەردوو لەپی دەستی توند بە ئـاوسـار و جڵەو گرتن.

«**مُوصَل**»: چاك قایم كراو.

دەڵێ: ئەو ئەسپە لە توندی حەرەكەتداو لە سووكی وەرچەرخانیدا وەك ئەو شتە وایە كە منداڵان بەنێكی تێدەخەن و هەڵی دەسوورێنن بەسەر سەری خۆیاندا.

لَهُ أَيْطَلَا ظَبْيٍ وَ سَاقَا نَعَامَةٍ وَ إِرْخَاءُ سِرْحَانٍ وَ تَقْرِيبِ تَتْفَلِ

«**أَيْطَلا**»: نوونی تەسنییەكەی لەبەر ئیزافە حەزف كراوە موفرەدەكەی «ایطل»ە و بە مەعنا كەلەكەیە.

«**نعامة**»: وشترمورغە.

«**إرخاء**» جۆرێكە لە ڕاكردنی گورگ.

«**تقریب**»: ئەوەیە كە لەكاتی غاردانددا دوو پێیانی لەجێگای دوو دەستەكانی دابنێ.

«**تتفل**»: بەچكە ڕێوی.

دەڵێ: ئەو ئەسپە دو كەلەكەی وەك كەلەكەی «ئاسک» لە زەعیفیدا و دوو لاقی وەك دولاقی «نەعامە» لە بڵندی و درێژیدا و غاردانی وەك «گورگ» و پەڕینی لە جێگایەك بۆ جێگایەكی دی وەك بەچكەی ڕێوییە.

ضَلِيعٍ إِذَا اسْتَدْبَرْتَهُ سَدَّ فَرْجَهُ بِضَافٍ فُوَيْقَ الْأَرْضِ لَيْسَ بِأَعْزَلِ

«**ضلیع**» تەنیشت و پەراسوو گەورە.

«استدبار»: لە پاشەوەڕا تەماشای شت کردن.

«فرج»: بۆشایی بەینی دەست و پێ.

«ضاف»: کلکی پڕو و زۆر موو.

«فُویق»: تەسغیری «فوق» بۆ نزیك کردنەوەیە، وەك «قُبَیْل» و بُعَیْد».

«اعزل»: واتە کلك خوار.

دەڵێ: باڵابەرز و کەلەکە گەورەیەکەی ئەگەر لە پشتەوەڕا تەماشای بکەی ئەوە بە کلکە درێژ و پڕ مووە ڕاستەکەی بەینی هەردوك پێکانی دادەپۆشی.

---

کَأَنَّ عَلَى الْمَتْنَيْنِ مِنهُ إِذَا انْتَحىٰ      مَدٰاكَ عَرُوسٍ أَوْ صَلٰايَةَ حَنْظَلِ

---

«كَأَنَ»: لە حرووفی مُشَبَّبەهە بە فیعلە و بۆ تەشبیهە.

«المتنین»: مەبەست لە دوو «متن»ە واتە: دوولایەنی ستوونی فەقەڕاتە.

«انتحاء»: باوەڕ پێکردن و پشت پێ بەستن.

«مَداك»: بەردێکی لووسە کە شتی بۆنخۆشی لەسەر دەسوونەوە.

«صلایة»: بەردێکە کە دەنك و تۆوی «کاڵەکە مارە»ی لەسەر دەسوونەوە.

دەڵێ: ئەسپێکە قەراغەکانی پشتی کاتێ خۆداوێتە سەر لای چەپ لە سافی و لووسی و گۆشتنیدا وەك ئەو بەردە لووسە وایە کە «کلی» چاوی بووکی لەسەر دەسوونەوە، یان ئەو بەردەی کە دەنك و تۆی «کاڵەکە مارە»ی لەسەر دەکوتن.

---

کَأَنَّ دِمٰاءَ الْهٰادِیٰاتِ بِنَحْرِهِ      عُصٰارَةِ حِنٰاءٍ بِشَیْبٍ مُرَجَّلِ

---

«دم»: خوێن.

«هادیات»: پێشکەوتوان.

«عُصارَة»: گووشراو.

«حِناء»: خەنە.

«مُرَجَّل»: ڕیشی بە شانە داهێنراو.

دەڵێ: دڵۆپەی خوێنی وشکی ئەو حەیوانانە کە لە پێشەوە ڕایان کردووە. بەسنگییەوە وەك ئەو خەنە وایە کە لە ڕیشی سپی شانە کراوت هەڵسووبێ.

فعَنَّ لنا سِـرْبٌ كَأَنَّ نِـعْاجَهُ　　　　عَذارىٰ دَوارٍ فِي مُلَاٍ مُذَيَّلِ

«عَنَّ»: دەرکەوت.

«سرب»: مێگەلێك ئاسك، یان گاکێوی، کۆمەڵە ژنێك، یا دەستەیەك پەڕندە.

«نِعْاج»: مانگای کێوی و بە مەعنای دیکەش هاتووە.

«دوار»: بوتێك بووە کەلە پێش ئیسلامدا تەوافیان بە دەورەدا کردووە.

«مُلاٍ»: نەوعە لیباسێکی درێژە.

«مُذیل»: داوێندار.

دەڵێ: دەستەیەك مانگا کێوی لێمان وە دیار کەوت، دەتگوت ئەو کچانەی کە بەکراسی داوێن درێژەوە لە دەورەی ئەو بەرد و بوتە پاکە و گەورەیانەوە خەریکی تەوافن.

مەبەستی پێ ئەوەیە دەڵێ کە ئەو مانگا کێویانە لە ڕەنگی سپی و تەمیزی و کلکی بڵند و جۆری حەڕەکە و هاتوچۆیاندا وەك ئەو کچانە بوون.

فَأَدْبَرْنَ کَالْجَزَعِ الْمُفَصَّلِ بَيْنَهُ  بِجِيدِ مُعَمٍّ فِي الْعَشِيرَةِ مُخْوَلِ

«أدبَرن»: ڕویان وەرگێڕا.

«جزع»: مورورویەکی «یەمەنی»یە کە قەراغەکەی ڕەش و باقیەکەی سپییە.

«مفصَّل بینه»: یەعنی لە بەینی واندا چەند گەوهەری دیکەش هەبن.

«جید»: گەردن.

«مُعَمّ» و «مُخْوَل» خاوەن مام و خاڵ.

دەڵێ: ئەو دەستە مانگا وەحشییانە پشتیان دەمەکرد و ڕایانکرد. وەك دانەی گەردنبەندی «یەمەنی» لە گەردنی کوڕێکی پیاوی گەورە و دەوڵەمەند، لەبەر ئەوەی کە ئەو مانگا کێوییانە گۆنایان ڕەشە و باقی بەدەنیان سپییە لە کاتی لێك بڵاوبوونەوەیاندا وەك دەنك و دانەی ئەو گەردنبەندە وان کە لە ملی کوڕی پیاوێکی نەجیبدا بن.

فَأَلْحَقَنا بِالْهادِياتِ وَ دُونَـهُ  جَواحِرُها فِي صَرَّةٍ لَمْ تَزَيَّلِ

«ألحقنا»: ئێمەی بەوان گەیاند.

«هادیات»: پێش کەوتووەکان.

«جواحر»: دواکەوتووەکان.

«صَرَّة»: بە مەعنا هاوار و دەستەیەك.

«لم تَزیل»: بڵاو نەبوونەوە.

دەڵێ: ئەو ئەسپە بەهۆی سورعەتیەوە ئێمەی گەیاندە ئەو مانگا وەحشییانەی

کە وەپێش کەوتبوون بێ ئەوەی ڕێگا بدا بڵاو وەبن و ئەوانەی وەدوا کـەوتـبوون وەدوا خۆی دان.

**فعَادیٰ عِدَاءً بَیْنَ ثَوْرٍ وَ نَعْجَةٍ دِرٰاكاً وَلَمْ یَنْضَحْ بِمٰاءٍ فیُغْسَلِ**

«عداء»: مەفعوولی موتەڵەقی «عادیٰ»یە، یەعنی یەك بین غاریدا.

«ثور»: گا.

«نعجَة»: مەڕی مێ، مانگا.

«دراك»: گەیشتوان.

«لم ینضح»: ئارەقی نەکرد.

«فیُغْسَل»: بشورێ.

دەڵێ: بەغارێکی گەیشتە نێر و مێکانیان وکوشتنی، بەبێ ئەوەی زۆر ئارەق بکا و بەدەنی تەڕ بێ.

**فَظَلَّ طُهٰاةُ اللَّحْمِ مِنْ بَیْنِ مُنْضِجٍ صَفِیفَ شِـواءٍ أَوْ قَـدِیرٍ مُـعَجَّلِ**

«طهاة»: جەمعی «طاهی»یـە، وەکـو «قـضاة و قـاضی» ـ یـەعنی ئـاشپەز چێشت لێنەر.

«مِن»: بۆ بەیانە.

«مُنضِج»: لێنەر.

«صفیف»: بەو گۆشتەی دەڵێن؛ کە بە بەردی گەرمیدا دەدەن بۆ برژاندن.

«شواء»: کەباب.

«أو»: بە مەعنا واوە.

«قدیر»: گۆشتی کوڵاو لە دیزەدا.

«مُعَجَّل» بەپەلە حازر کراوە.

دەڵێ: ئەو ڕۆژە تا ئێوارە خەریکی خاوێن کردنەوە و برژاندنی گۆشت بوون. هێندێکیان بەسەر بەردی گەرمدا دەداو بەعزێکیان بەپەلە لە دیزەدا دەکوڵاند، لەبەر ئەوەی گۆشتەکە زۆر بوو، بە ئارەزوی خۆیان دەکرد.

---

وَ رُحْنا یَکادُ الطَّرْفُ یَقْصُرُ دُونَهُ     مَتیٰ ما تَرَقَّ الْعَیْنُ فِیهِ تَسَفَّلَ

---

«رحنا»: ڕۆیشتین.

«یکاد»: نزیك بوو.

«طرف»: چاو و برژانگ و بژۆڵك.

«ترق»: عاجز بوو، لای سەرەوە.

«تَسَفَّل»: لای خوارەوە.

دەڵێ: ڕۆیشتین و چاو لە دەرکی جوانی و هونەر و ئەساڵەتی ئەو ئەسپە عاجز بوو، کە تەماشای سەر و شان و گەردن و یاڵی بکەی ئارەزووی تەماشاکردنی سم و لاق و کەفەڵی دەکەی.

---

فَباتَ عَلَیْهِ سَرْجُهُ وَ لِجامُهُ     وَباتَ بِعَیْنِي قائِماً غَیرَ مُرْسَلِ

---

«بات»: شەوی بە ڕۆژکردەوە.

«سرج»: زینه.

«لجام»: لە غاوە.

«قائم»: ڕاوەستاو.

«غیر مرسل»: بەرهەڵدا نەکراو بۆ لەوەڕ.

دەڵێ: شەو تابەیانی لەبەر چاوی ئێمە بەزین و لەغاوەوە ڕاوەستا و نەچوو بۆ لەوەڕگا، واتە: لەگەڵ ئەو هەموو و هاتوچۆ و غاردان و دەشت و سەحرا بڕینەوە هەر ئامادەی خزمەت بوو پێویستی بە ئیجازە و ئیستراحەت نەبوو.

أَصَاحِ تَرَىٰ بَرْقاً أُرِيكَ وَمِيضَهُ    كَلَمْعِ الْيَدَيْنِ فِي حَبِيٍّ مُكَلَّلِ

«أَصاح»: لە ئەسڵدا «أصاحب» بووە و تەڕخیمی تێدا کراوە.

«ومیض»: بریقە و ڕووناکی.

«لمع»: حەرەکەت.

«حبی»: هەوری زۆر.

«مکلل»: ئەگەر وەك ئیسمی فاعیلی وەخوێنی پێکەنین، بەڵام ئەگەر وەك ئیسمی مەفعوولی وەخوێنی بە مەعنا تاج لەسەرنانە.

دەڵێ: ئەی هاوڕێ! ئایا ئەو بەرقە خاوەن شوعلە و ڕوناکییە بەتۆ نیشاندەم کە وەك حەرەکەی دو دەست لەنێو هەورێکی پڕی زۆر، بەشی سەرەوەی وەك تاج لەسەر سەری باقییەکەی ڕاوەستاوە، یان زەردە خەندە دەکا و پێدەکەنێ.

يُضِيءُ سَنَاهُ أَوْ مَصَابِيحُ رَاهِبٍ    أَمَالَ السَّلِيطَ بِالذُّبَالِ الْمُفَتَّلِ

**«یضیئ»**: دەدرەوشێتەوە.

**«سنا»**: نوور و ڕووناکی

**«مصابیح»**: جەمعی «مصباح»ە، یەعنی چرا.

**«سلیط»**: ڕۆنی چرا.

**«ذبال»**: پڵیتە چرا.

**«مفتل»**: خواردنەوە.

دەڵێ: ئەو بەرقە دەدرەوشیتەوە و وەك حەرەکەی دەست دەجووڵێ. یان وەك چرای ڕاهیبێکە کە چراکەی خوار کردبێتەوە بۆ ئەوەی نەوتەکەی زیاتر لەلایەك کۆوەبێ و پڵیتەکەی زۆرتر نەوت هەڵگرێ و ڕووناکی زۆرتر بێ.

دەڵێن: ڕاهیبان چرایان لەبەر دەرگای «دێر»ەکەیان دادەنا تا کاروانچییان ڕێگایان لێ ون نەبێ.

**قَعَدْتُ لَهُ وَ صُحْبَتِي بَيْنَ ضَارِجٍ وَ بَيْنَ الْعُذَيْبِ بُعْدَ مَا مُـتَأَمَّلي**

زەمیری «له» بۆ هەورەکە دەگەڕێتەوە.

**«صحبة»**: یەعنی هاوڕێ.

**«ضارج و عذیب»**: ناوی دوو جێگان.

**«متأملی»**: واتە ئەوەی تەماشام دەکرد دوور بوو.

دەڵێ: لەگەڵ هاوڕێکانکم لەنێوان ئەو دوو جێگایە دانیشتبووین و لە دوورەوەڕا تەماشای ئەو هەورەمان دەکرد.

یان مەعنای وایە، دەڵێ: لەحاڵێکدا کە هاوڕێکانم لە بەینی ئەو دو شوێنەدا بوون. ئەمن دانیشتبووم و سەرگەرمی تەماشاکردنی ئەو هەورە دوورە بووم.

عَلىٰ قَطَنٍ بِالشَّيْمِ أَيْمَنُ صَوْبِهِ ‌ ‌ ‌ ‌ وَ أَيْسَرُهُ عَلَى السَّتَارِ فَـيَذْبُلِ

**«قطن»** و **«ستار»** و **«يذبل»**: ناوی سێ کێون. کە «قـطن» زۆر لەوانـی دی دوورترە.

**«شیم»**: تەماشاکردنی برووسکە و بەرق و چاوەڕوانکردنی باران.

**«أیمن»**: لای ڕاست.

**«صوب»**: باران.

**«أیسر»**: لای چەپ.

دەڵێ: لای ڕاستی ئەو هەورە لەسەر کێوی «قـطن» و لای چـەپی لەسـەر کێوی ستار و یذبل بوو، گومانی لێ دەکرا بباری.

فَأَضْحىٰ يَسُحُّ الْماءَ حَوْلَ كُـتَيْفَةٍ ‌ ‌ ‌ ‌ يَكُبُّ عَلَى الْأَذْقانِ دَوْحَ الْكَنَهْبَلِ

**«یسح»**: واتە: دەڕژێنی.

**«حول»**: لە دەورە.

**«کتیفة»**: جێگایەکە.

**«کب»**: بە ڕوودا کەوتن.

**«ذقن»**: چەناگە.

**«دَوح»**: داری گەورە.

**«کنهبل»**: نەوعە دارێکی سەحرایە.

دەڵێ: لە دەور و بەری «کتیفه» دەستی بە بـاران کـرد و داری ئـەستوور و

گەورەی «کنهبل»ی هەڵدەکەند و بەرەو ڕوو دەی خست. یەعنی ئەوەندە باری و لافاوێکی گەورە هەستاو داری گەورەی کۆنی هەڵدەکەند.

---

وَ مَرَّ عَلَى الْقَنَانِ مِـنْ نَـفَيَانِهِ فَأَنْزَلَ مِنْهُ الْعُصْمَ مِنْ كُلِّ مَنْزَلِ

---

**«قنان»**: کێوێکە لەسەر زەمینی خێڵی بەنی سەعد.

**«نفیان»**: ئەوەی دەڕوا بۆ حەوا و بڵاو دەبێتەوە لە دڵۆپە باران و تۆز و خۆڵ و لۆکە و شتی تر.

**«العصم»**: بزنە کێوی، یان حەیوانێکی دی کە دەستی بەڵەك بێ.

**«منزل»**: جێگای هاتنە خوارەوە.

دەڵێ: بەهۆی بارانی زۆری پەرت و بڵاو لەسەر کێوی «قنان» ئەو بزنە کێوی دەست سپیانەی لە کێوەکە هێنایە خوارەوە.

---

وَ تَيْمٰاءَ لَمْ يَتْرُكْ بِهٰا جِذْعَ نَخلَةٍ وَ لٰا أُطُماً إِلّٰا مَشِـيداً بَـجَنْدَلِ

---

**«تیماء»**: ناوی شارێك و دێیەکە.

**«جَذع»**: قەد و ڕیشەی دارخورما.

**«أطم»** قەسر.

**«مشید»**: بڵند و بە گەچ دروست کراو.

دەڵێ: باران و سێڵاو لەشاری «تیماء» هەرچی بوو هەڵی کەند و ویرانی کرد، ئەو خانوانە نەبێ کە بە بەرد و گەچ دروست کرابوون.

كَأَنَّ ذُرىٰ رَأْسِ المُجَيْمِرِ غُدْوَةً مِنَ السَّيْلِ وَ الْغُثْاءِ فَلْكَةُ مِغْزَلِ

**«ذروة»**: واتە: بڵندی و لای سەرەوەی هەرشتێك.

**«مُجيمر»**: ناوی تەپۆڵكێكە.

**«غثاء»**: ئەو شتەی كە لافاو و سێڵاو لەگەڵ خۆی دێنی، وەك قوڕ و لیتە و دار و بەرد و شتی‌تر.

**«فلكة مغزل»**: سەرەتەشی.

دەڵێ: تۆ قەسەری تەپۆڵكەی «مجیمر» لە چێشتنگاوێدا بە هۆی ئەو شتەی كە سێڵاو هێنابووی، دەتگوت؛ سەرەتەشییە.

وَ أَلْقىٰ بِصَحْراءِ الْغَبِيطِ بَعْاعَهُ نُزُولَ الْيَمٰانِي ذِي الْعِيٰابِ الْمُحَمَّلِ

**«غبیط»**: لێرەدا مەبەست تەپۆڵكەیەكە كە ناوەڕاستەكەی چاڵ بێ و دەورەكانی بەرز بووبنەوە بە وێنەی جل و كورتانی وشتر.

**«بعاع»**: بار و سەنگینی.

**«نزول الیمانی»**: واتە وەك تاجر و بازرگانی «یەمەنی».

**«محمل»**: بار كراو.

دەڵێ: بارو سەنگینی خۆی لەسەر خاكی «غبیط» بە عەرزێدا دا و بە قوڕ و خاشاك وای داپۆشی، دەڵەی بازرگانی یەمەنی بارە پارچەی ڕەنگاو ڕەنگی خۆی بۆ فرۆشتن لەوێ بڵاو كردۆتەوە و نیشانی خەڵكی دەدا.

«كَأَنَّ مَكَاكِيَّ الْجِواءِ غُدَيَّةً صُبِحْنَ سُلافاً مِنْ رَحِيقٍ مُفَلْفَلِ

«مکاکي» ـ نەوعە باڵندەیەکی ڕەنگ سپییە کە زۆر لە حەوادا دەفڕی و دەنگێکی زۆر خۆشی هەیە.

«جواء»: شیو.

«غدیة»: تەسغیری «غداة»ە و بە مەعنا بەیانییە.

«صبحن»: یەعنی دەڵێی؛ بەیانیزوو شەرابیان دراوەتێ.

«سلاف»: باشترین شەراب.

«مفلفل»: بەو شەرابە دەڵێن کە ئاڵەتی تێکرابێ.

دەڵێ: پەڕندەی ئەو دەشت و شیوە ئەوەندەیان بە زەوق و شەوق دەخوێند و لەسەرخۆ بوون، دەتگوت؛ بەیانیزوو لەو شەرابەیان داونێ کە ئاڵەتی تێکرابێ و مەستیان کردوون.

كَأَنَّ السِّبَاعَ فِيهِ غَرْقَىٰ عَشِيَّةً بِأَرْجَائِهِ الْقُصْوَىٰ أَنَابِيشُ عُنْصُلِ

«غرقی»: جەمعی غەریق بە مەعنا خنکاو.

«عشیة»: لەپاش نیوڕۆوە تا مەلا بانگدان.

«ارجاء»: جەمعی «رجا»یە و بە مەعنا دەوروبەرە.

«قصوی»: دوورتر.

«أنابیش»: یەعنی ڕیشە و بنکی گیا.

«عنصل»: پیوازی کێوی.

دەڵێ: ئەو دڕندانەی لافاو و سێڵاو هێنابوونی و غـەڕەق بـبوون، لەپـاش نیوەڕۆ لە دوورتر لە شوێنی لافاوەکە دەتگوت سەلك و بنکی پـیوازە سـەیەن هەریەکەیان لە گۆشەیەك کەوتبوون.

## موعەللەقەی دووەم

«مُعلّقه»ی دووەم نوسینی «طَرْفة»ی کوڕی سوفیانی بەکرییە لە «٥٤٣ - ٥٦٩»دا ژیاوە و ناوی عەهر بووە. بەهۆی گوتنی شیعرێکەوە نازناوی تەڕفەیان داوەتێ. «تەڕفە» لە ئەسڵدا ناوی درەختێك بووە. تەرفە لە خانەوادەیەکی شەریف و گەورەی «بەحرەین»ی هاتۆتە دنیاوە، ناوی دایکی وەردی کچی «عبدالمسیح» بووە. باب و باپیر و دوو مام و خاڵی شاعیر بوون. هەر بە منداڵی باوکی لە دەست داوە و لای مامەکانی بووە. بەڵام زۆر لەگەڵ دایکی و ویدا بەد ڕەفتار بوون. لەبەر ئەوەی بە لاموبالی و مەستی ڕایدەبوارد. لەبەر ئەو خوو ڕەوشتەی خێڵەکەی دەریان کردووە و دەربەدەر بووە. هەر بە گەنجی دەستی کردووە بە شیعرگوتن. بەهۆی هەجو و زەمبی عەمری کوڕی هێندی پاشای «حیرە» لە قەسیدەیەکدا، لەتەمەنی کەمتر لە سی ساڵیدا بە دەستی حاکمی ویلایەت کوژراوە. «مُعَلقه»کەی بە چەند زمان تەرجەمە کراوە و لە بەحری «طویل» و «١٠٤» بەیتە و قافییەکەی «دال»ە، زۆر لە ئەدیبەکان «معلقه»کەی بەباشتر لە هەموو شعری جاهیلی دەزانن، چونکە دەڵێن؛ بە عەلاوەی چاکی شیعرەکەی فائیدەی مێژوویی و ژیانی زۆری تێدایە.

لِـخَوْلَةَ أَطْـلَالٌ بِـبُرْقَةِ ثَـهْمَدِ      تَلُوحُ كَبَاقِي الْوَشْمِ فِي ظَاهِرِ الْيَدِ

«خولة»: ژنێکی خێڵی لەکەلب بووە.

«أطلال»: جەمعی «طَلَل»ە و بە مەعنا ئاساری مەنزڵ و جێگایەکە دەمێنیتەوە.

«برقة»: جێگایەکە کە خاکەکەی لەگەڵ بەرد و ڕمڵ تێکەڵ بێ.

«ثهمد»: ناوی شوێنێکە.

«تلوح»: دەدرەوشێ.

«وشم»: خاڵ کوتان.

دەڵێ: لەسەر زەمینی بەرداوی «ثهمد» ئاساری ڕەشماڵ و مەنزلی «خەولە» وەك خاڵی کوتانی پشتی دەست ئاشکرا و نمایانە.

وُقُوفاً بِهَا صَحْبِي عَلَيَّ مَطِيَّهُمْ      يَقُولُونَ لَا تَهْلِكْ أَسىً وَ تَجَلَّدِ

ئەو شعرەی «تەرفە» لەگەڵ شیعری پێنچی «امرءالقیس» تەنیا ئەوەندەی فەرقە لەباتی «تجمل»، «تجلد»ی وتووە و مەعناکەشی وەك وی وایە.

كَأَنَّ حُدُوجَ الْـمَالِكِيَّةِ غُـدْوَةً      خَلَايَا سَفِينٍ بِالنَّوَاصِفِ مِنْ دَدِ

«حدوج»: جەمعی «حِدج»ە و جۆرێکە لە کەژاوە.

«مالكية»: یەعنی لە کەژاوەکانی خێڵی بەنی مالیك.

«خلایا»: واتە کەشتی گەورە.

«سفین»: پاپۆڕ، کەشتی.

«نواصف»: جەمعی «ناصفة» و بە مەعنا شوێنێکی پان و بەرینە لە دەورەی شیو.

«دد»: ناوی شیوە، وە هێندێك دەڵێن؛ بە مەعنا گاڵتە و گەپە.

دەڵێ: لە بەیانی ڕۆژی جیابوونەوە لە یار و خۆشەویست کەژاوەکانی بەنی مالیك لەو دەشتەپانەی «دەد» وەك کەشتی گەورە دەچوون.

یان دەڵێ: لە ئەسەری سەرگەرمی و سەرگەردانی واماندەزانی کە ئەوان کەشتین. مەبەستی ئەوەیە دەڵێ: حەرەکەی وشترە توندڕەوەکان وەك کەشتی لە دەریادا دەهاتنە بەرچاو.

---

عَدَوْلِيَّةٌ أَوْ مِنْ سَفِينِ ابْنِ يـامِنٍ ` يَجُورُ بِهَا الْمَلَّاحُ طَوْراً وَ يَهْتَدِي

---

«عدولی»: ناوی تائیفەیەکە لە «بەحرەین».

«ابن یامن»: ناوی کابرایەکی خەڵکی وێیە.

«جار»: لەڕێ لایدا.

بێی «بها» بۆ تەعدییەیە.

«طور»: دەفعەیەك.

دەڵێ: لە کەشتییەکانی خێڵی «عدولیە»، یان لە نەوعی کەشتی «ابن یامن»ە کە کشتییەوانەکە جاری وایە ڕاست و دروست و جاری واشە لەڕێگا لادەدا و لێیان دەخوڕی. چونکە بۆ کورتکردنەوەی ڕێگا و زوو بە مەنزڵ گەیشتن وشترەوانەکان ئاوا دەکەن.

يَشُقُّ حَبابَ الْماءِ حَيْزُومُها بِها        كَما قَسَّمَ التُّرْبَ الْمَفايِلُ بِالْيَدِ

«يشق»: دەدڕێ.

«حباب»: جەمعی «حبابة»، کەف و شەپۆلی ئاو.

«ترب»: خاك.

«مفايل»: قوماربازێکە، کە شتێك لە ناو عەرزدا دەشاردرێتەوە و لە پاشان عەرزەکە دەکاتە دوو بەش و دەڵێ: شتەکە لەکام بەشەدایە؟. جا ئەگەر کابرا زانی ئەوە دەیباتەوە دەنا دەیدۆڕێنی.

دەڵێ: ئەو کەشتییە شەپۆلی دەریاکان بە سینگی خۆی دەدڕێ و دوولەتیان دەکا، وەك قوماربازێك کە کۆمەڵێك گڵ دەکاتە دوو بەش.

وَ فِي الْحَيِّ أَحْوىٰ يَنْفُضُ الْمَرْدَ شادِنٌ    مُـظاهِرُ سِـمْطَيْ لُـؤْلُؤٍ وَ زَبَـرْجَدِ

«احوی»: خاوەن لێوی ئەسمەرو نیلی. بە ئاسکێکیش دەڵێن؛ کە بەو ڕەنگە بێ.

«ينفُضُ المردَ»: سیفەتی «احویٰ»یە و بە مەعنا بزاوتنە.

«مرد»: میوەی تازەی داری. «اراك»ە.

«شادن»: بە ئاسکێك دەڵێن؛ کە گەورە بووبێ و کاری بە دایکی نەما بێ.

«مظاهر»: کەسێکە کە کراسێك لەسەر کراسێك یان زرێیەك لەسەر یەکی دییەوە، یان گەردنبەند لەسەر گەردنبەندەوە لەبەر کا.

«سمطی»: بەو ڕشتە دەڵێن؛ کە جەواهێراتی پێوە دەکەن.

«**لؤلؤ**»: مرواری.

«**زبرجد**»: بەردێکی بەنرخە.

دەڵێ: لەناو ئەو خێڵەدا خۆشەویستێك هەیە وەك ئاسك وایە. لێوی نیلی و چاوی ڕەش و گەردن مینایی و لەکاتێکدا کە داری «اِراك» ڕادەوشێنی و لە گوڵ و میوەکەی دەخوا و دوو ڕشتە مرواری و گەردنبەندی لە گەردندایە.

| خَذُولٌ تُراعِي رَبْـرَباً بِـخَميلَةٍ | تَنَاوَلُ أَطرافَ الْبَرِيرِ وَ تَرْتَدِي |
|---|---|

«**خذول**»: واتە: بەچکەکانی بەرهەڵدا کردووە.

«**ترعی**»: دەلەوەڕێ.

«**ربرباً**»: مێگەلێك لە ئاسك و گاکێوی.

«**خميلة**»: ئەو عەرزە نەرم و نۆڵەی کە گیای لێ دەڕوێ، یان بە زەمـینێك دەڵێن کە داری لێ بێ، یان مێرغوزار بێ، واتە مێرگ.

«**برير**»: میوەی گەیشتووی داری «اراك».

«**ترتدی**»: باڵاپۆش لەبەر دەکا.

دەڵێ: ئەو ئاسکەی کە وەك مەحبووبە دەچێ، بەچکەکانی بەجێ هێشتووە و لەگەڵ دەستەیەك لە ئاسکان لە شوێنێکی سەر سەوز بـەری داری «اراك» دەلەوەڕێ و لەق و گەڵا دایدەپۆشن، واتە: لە بەینی لەق و گەڵاکاندا ون دەبێ.

| وَ تَبْسِمُ عَنْ أَلْمىٰ كَأَنَّ مُنَوِّراً | تَخَلَّلَ حُرَّ الرَّمْلِ دِعْصٍ لَهُ نَدِ |
|---|---|

«**ألمی**»: سیفەتی دەدانێکە کە ڕەنگی لێوەکانی مایل بە ڕەشی بێ.

«منورا»: سیفەتە بۆ «اقحوان»ی موقەددەر. کە لە ئەسڵدا ئاوا بووە: «کأن اقحواناً منوراً»، «اقحوان» ئیسمی «کأن»ەیە و خەبەرەکەی حەزف کراوە کە «تَعرُهُ»یە و بە مەعنا ددانە. «اقحوان»: گوڵە بەیبوونە.

«حرّ»: خالیس.

«دعص»: بە دەڵی «الرمل»ە و بە مەعنا تەپۆڵکەیەك لە لم و خۆڵە.

«ند»: ئەگەر ئەسڵەکەی «نَدِی»بێ بە فەتحەی نوون و کەسرەی دال، ئەوە سیفەتی موشەببەهەیە و بە مەعنا شێدارە و جەڕەی دالەکە حەرەکەی ئیعرابی و ئەسڵییە، بەڵام «لَهُ» زاهیرەن بێ‌مەعنا دەبێ. بەڵام ئەگەر «ندَی» بە فەتحەی دال بێ، ئەوە مەسدەرە و بە مەعنا تەڕی و شێدارە، ئەو کاتە «لَهُ ندَی» یەعنی ئەو تەڕە.

دەڵێ: ئەو مەعشووقە بە ددانێك پێدەکەنی کە لێوەکانی مایل بە ڕەشین و ددانەکانی وەك گوڵی «بەیبوونە» وان کە لەنێو تەپۆڵکە لمێکی خالیسی شێدار گەورە بووبێ، چونکە ئەو کاتە ئەو گوڵە تەڕ و تازە و جوان دەبێ وەك لێوی مەحبووبە.

---

سَقَتْهُ إِيَاةُ الشَّمْسِ إلّا لِثَاتِهِ      أُسِفَّ وَلَم تَكْدِمْ عَلَيْهِ بِإِثْمِدِ

---

«إياة»: تیشکی ڕۆژ.

«لثات»: جەمعی «لثە» و بە مەعنا «پووك»ە.

«أسّف»: بە سەرداکردن.

«لم تکدم»: یەعنی گازی نەگرتووە.

«إثمد»: سورمە.

دەڵێ: ددانی ئەوەندە جوانن، دەڵێی؛ بە نووری ڕۆژ ئاو دراون و کلت بەسەر و پووکەکانیدا ڕشتووە تا دەدانی زیاتر وەدەرکەون و قەت بەو دەدانانەی گازی نەگرتووە و عەیبێکیان پێوە دیار نییە.

وَ وَجْهٍ كَأَنَّ الشَّمْسَ أَلْقَتْ رِدٰائَهٰا     عَلَيْهِ نَقِيُّ اللَّوْنِ لَمْ يَتَخَدَّدِ

«و وجه»: واو عاطفەیە، «وجه» مەجروورە بە عەطف بۆ سەر «ألمى» لە شیعری هەشتدا.

«رداء»: ڕۆژە و بریتیە لە نووری ڕۆژ.

«لم یتخدد»: زیبکە و گرێ و چرچی لێ پەیدا نەبووە.

دەڵێ: بەدەم و ڕوخسار و سەر و سیمایەکەوە پێدەکەنی، دەڵێن؛ ڕۆژ پەردە و نیقابێکی لە نوور بەسەردا کێشاوە و سوورەتێکی نوورانی جوان و بێ‌زیبکە و چرچ.

وَ إِنِّي لَأُمْضِي الْهَمَّ عِنْدَ احْتِضٰارِهِ     بِعَوْجٰاءَ مِرْقٰالٍ تَرُوحُ وَ تَغْتَدِي

«امضى الهمّ»: یەعنی مەبەستی خۆم بەجێ دەگەیێنم.

«احتضار»: حازرکردن.

«عوجاء»: بە وشترێکی «مێ» دەڵێن کە لەبەر زەوق و نیشاتی ڕاست بەڕێگادا ناڕوا.

«مرقال»: سیفەتی موبالەغەیە و لە «ارقال»ە و بە مەعنا توند ڕۆیشتنە، بەڵام

ناگاتە غاردان.

«تروح و تغتدي»: یەعنی شەو و ڕۆژ دەڕوا.

دەڵێ: کاتێ ویستم کارێك بکەم، ئەنجامدانی کارەکەم حەواڵەی ئەو وشترە «مێیە» دەکەم کە لەبەر توند ڕۆیشتن لە ڕاستە ڕێ لا دەدا و شەو و ڕۆژ ڕاناوەستی هەر دەڕوا.

| | |
|---|---|
| أَمُونٍ كَأَلْوَاحِ الْإِرَانِ نَصَأْتُهَا | عَلَىٰ لَاحِبٍ كَأَنَّهُ ظَهْرُ بُرجُدِ |

«أمون»: هەڵناخلیسکێ.

«إران»: تابووت.

«نَصأْتُها»: ئەگەر بە «صاد»بێ یەعنی وە هەیەجانی دەخەم. بەڵام ئەگەر بە «سین»بێ یەعنی بەقامچی لێی دەدەم.

«لاحب»: ڕێگای ئاشکرا.

«برجد»: کراسی خەتدار.

دەڵێ: ئەو وشترە «مێیەم» قەت هەڵناخلیسکێ و ناکەوی و وەك تەختەی تابوتوی گەورە ڕاحەت و مەحکەمە و بەو ڕێگا ئاشکرایەیدا دەبەم کە وەك کراسی خەتدار وایە.

یان مەعنای وایە، دەڵێ: بەقامچی لێی دەدەم لێی دەخورم.

| | |
|---|---|
| جَمَالِيَّةٌ وَجْنَاءَ تَرْدِي كَأَنَّهَا | سَفَنَّجَةٌ تَبْرِي لِأَزْعَرَ أَرْبَدِ |

«جمالية»: بەو وشترە «مێیە» دەڵێن کە لە بەدەن و قـووەت و تـوانـادا وەك وشتری «نێر» بێ.

«وجناء»: گەورە و بەتوانا.

«تردي»: توند دەڕوا.

«سفنجة»: نەعامە، وشترمرغ.

«تبري»: خۆی نیشان بدا.

«أزعر»: کەم مو.

«أربد»: ڕەنگ خۆڵە مێشی.

دەڵێ: ئەنجامی ئیرادە و مەبەستم بەهۆی وشترێکەوەیە کە وەك وشترێکی نێری بە توانا و ئەندام ڕێك و پێکە و لە پەلەکـردن و گـورج ڕۆیشـتندا دەڵێی نەعامەی «مێیە» کە خۆی بە نەعامەیەکی «نێری» کەم مووی ڕەنگ خۆڵەمێشی نیشان بدا.

---

تُبَارِي عِتَاقاً نَاجِيَاتٍ وَ أَتْبَعَتْ          وَظِيفاً وَظِيفاً فَوْقَ مَوْرٍ مُـعَبَّدٍ

---

«تُباري»: دەیهەوێ وەپێش بکەوێ.

«عتاقا»: جەمعی «عتيق» یەعنی وشتری ڕەسەن.

«ناجيات»: توندڕەو.

«أتبعت»: بەدوایدا هێنا.

«وظيف»: بەلەك و باسك.

«مور»: ـ ڕێ.

«معبد»: کوتراو و ساف و تەخت کراو.

دەڵێ: لەپێش برکێدا لەگەڵ وشترانی ڕەسەن و توندڕەو پێش برکێ دەکاو پێ لەشوێنی دەست دادەنێ لەڕێگای سفت و ساف و هەمواردا.

## تَرَبَّعَتِ الْقُفَّينِ فِي الشَّوْلِ تَرْتَعِي حَدَائِقَ مَوْلِيِّ الأَسِرَّةِ أَغْيَدِ

«تربع»: یەعنی لەوەڕخواردن لە بەرهاردا و جێگیربوون لە جێگایەك.

«قُفّ»: عەرزێکی سفت و بەرز، نەك بە ئەندازەی کێو.

«شول»: جەمعی «شائلة»، یەعنی وشتری مەمك بچووك و کەم شیر. بەڵام «شول» کە جەمعی «شائل» بێ، ئەوە بە مەعنا وشتری کلك بەرزە لە نێر و لە مێ و بەبێ «ت»ێیە و فیعلەکەشی بە واستیەی «با» دەبێتە «موتەعەددی».

«ترتعي»: لە «رعیٰ»یە و لێرەدا بە مەعنا لەوەڕاندنە.

«حدائق»: جەمعی «حدیقه»یە بە مەعنا باغ و بێستان و عەرزێکی سەوز و شینە کە دەورەکەی بەرز و ناوەڕاستەکەی نزم بێ.

«مولی»: ئیسمی مەفعوول و بە مەعنا بارانی دووەم لە ساڵدا. واتە: زەمینێك کە دووجار بارانی لێ باریبێ. وەکەلیمەی «مولی» سیفەتە بۆ کەلیمەی «واد»ی موقەددەر.

«أسرّة»: جەمعی «سرّ» و لێرەدا بە مەعنا ناوەراستی شیوە و باشترین شوێنی لەوەڕەکەیەتی.

«أَغْيد» شوێنی گیا زۆر.

دەڵێ: ئەو وشترە «مێیە» لەکاتی بەهاردا لەگەڵ وشترانی کەم شیر و مەمك سووك لە دوو تەپۆڵکەی دیاری کراو لەوەڕاوە و لەسەر زەمینێکی شین و سەوز کە دووجار بارانی لێ باریوە و چاکترین لەوەڕگایە. (کە دیارە وشترێك کە لە جێگایەکی وادا بلەوەڕێ زۆر قەڵەو و بەکەیف دەبێ).

تَرِيعُ إِلىٰ صَوْتِ الْمُهِيبِ وَ تَتَّقِي     بِذِي خُصَلٍ رَوْعاتِ أَكْلَفَ مُلْبِدِ

**«تريع»**: دەگەڕێتەوە.

**«مهيب»**: بانگکەر.

**«ذي خصل»**: سیفەتە بۆ «ذنب»، واتە کلکی مەحزووف، واتە کلکی موو زۆر.

**«روعة»**: ترس.

**«أكلف»**: سیفەتی «فحل»ە، واتە نێری سووری مایل بە ڕەش.

**«ملبد»**: خاوەن تووکی پڕی تێکەڵاو.

دەڵێ: هەر کەسێك بانگی بکا بۆلای دەگەڕێتەوە و زۆر وشیار و زرنگە و کلکە پڕ تووکەکەی دەکاتە مانع کە وشتری نێری ڕەنگ سوور و ڕەش و تووك پڕ سواری بێ. (کلکی توند لە ناو ڕانان دەگرێ و ناهێڵێ ئاوسی بکا و کە ئاوسیش نەبێ هەمیشە بە توانا و بە کەیف و جوان و قەڵە و دەبێ.

كَأَنَّ جَنَاحَيْ مَضْرَحِيٍّ تَكَنَّفَا     حِفَافَيْهِ شُكَّاً فِي الْعَسِيبِ بِمِسْرَدِ

**«مضرحي»**: هەڵۆ و داڵاش.

**«تكنف»**: لە باوەشکردن.

**«حفاف»**: لایەن و لا، وە زەمیرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ «ذي خصل». واتە: کلك.

**«شُكّ»**: دروون، دوورین.

**«عسيب»**: ئێسکی کلك.

**«مسرد»**: درێشەی کەوش پێ دروون.

دەڵێ: دەڵێی دوو باڵی داڵاشی سپی لە دوولاوە بە درێشە بە ئێسکی کلکیەوە درووە. (مەبەست پڕ مووی و زۆری کلکی وشترە).

| | |
|---|---|
| فَطَوْراً بِهِ خَلْفَ الزَّمِيلِ وَ تارَةً | عَلىٰ حَشَفٍ كَالشَّنِّ ذاوٍ مُجَدَّدِ |

«طورا»: جارێك، دەفعەیەك.

«به»: بە کلکی.

«زمیل»: ئەوەی لەپاش سوارەوە سوار دەبێ.

«حشف»: لێرەدا مەبەست مەمکی وشکی چرچە.

«شنّ»: مەشکە کۆنە.

«ذاوٍ»: سیس و وشك بۆوە.

«مجدد»: لە «جدّ»ە و بە مەعنا قەتعە، یەعنی شیری وشکی کردووە.

دەڵێ: جاری وایە کلکی لە پشتی ئەو کەسەی کە لە دواوە سوار بووە و جاری واشە لە مەمکە چرچەکانی بێ شیری خۆی کە وەك مەشکەکۆن وان ڕادەکێشی.

| | |
|---|---|
| لَها فَخِذانِ أُكْمِلَ النَّحْضُ فِيهِما | كَأَنَّهُما بابا مُنِيفٍ مُمَرَّدِ |

«نحض»: گوشت.

«بابا»: تەسنییەی «باب»ە واتە دەرگا، دوو لنگەی دەرگا.

«منیف»: سیفەتی قەسرە، یەعنی دوو دەرگای کاخێکی گەورە.

«ممرّد»: سادە و درێژ.

دەڵێ: دوو ڕانی قەڵە و گۆشتنی دی دەڵێی دوو لا دەرکەی کۆشکێکی سادە و درێژن.

**وَ طَيٌّ مَحَالٍ كَالْحَنِيِّ خُلُوفُهُ          وَ أَجْرِنَةٌ لُزَّتْ بِدَأْيٍ مُنَضَّدِ**

**«طيّ»**: بەرزکردنەوەی چاڵاو بە بەرد. لە ئیعرابدا موبتەدا و خەبەرەکەی حەزف کراوە.

**«محال»**: ستونی فەقەڕات.

**«حني»** ـ جەمعی «حنية» یەعنی کەوان.

**«خلوف»**: جەمعی «خلف» یەعنی ئێسکی پەراسوو.

**«أجْرِنة»**: جەمعی «جران» یەعنی دیوی ژووری گەردن.

دەڵێ: ستونی فەقەڕات و ئێسکی پەراسووەکانی قەوی و ڕێك و مەحکەمن، وەك «کەوان» وان، دیوی ژووری گەردنی مۆرە ئێسقانەکانی پێکەوە چەسپیون.

**كَأَنَّ كِنَاسَيْ ضَالَةٍ يَكْنُفانِها          وَ أَطْرَ قِسِيٍّ تَحْتَ صُلْبٍ مُؤَيَّدِ**

**«كناس»**: چاڵێکە لە بن دار کە ئاسك و حەیوانیتر دەیکەنە لانە.

**«ضالة»**: داری سیدری کێوی.

**«أطر»**: دولا هاتنەوە.

**«قسي»**: جەمعی «قوس»ە واتە کەوان.

**«صلب»**: پشت.

**«مؤيد»**: قەوی.

دەڵێ: دوو بن باڵی گوشادە، لەبەر ئەوەی لە هەڵخلیسکان و کەوتن بە دورە. یان دەڵێی دوو لانەی ئاسك لەبن داری سیدری کێوی لەژێر دوو باڵ و بن هەنگڵی ئەو وشترەدان و چەند کەوانی کەچ و خوار بۆوە لە بن پشتە بە قووەتەکەیدان. واتە دەندەی تیغەرەکانی پشتی وەك ڕیزکردنی کەوانان دەچن.

| لَهَا مِرْفَقَانِ أَفْتَلَانِ كَأَنَّمَا | تَمُرُّ بِسَلْمَيْ دَالِجٍ مُتَشَدِّدِ |
|---|---|

«مرفقان»: دوو ئانیشك.

«أفتل»: سەخت و قەوی.

«سلم»: دۆڵچە.

«دالج»: بەو کەسە دەڵێن کە ئاو بە دۆڵچە لە بیر هەڵدەکێشی و دەیکاتە حەوزەوە.

«متشدد»: بەتوانا و قەوی.

دەڵێ: دوو ئەنیشکی زۆر سەخت و قەوی هەن (چونکە لە تەنیشتیەوە دورن) وەك پیاوێکی ئاوکێش دەچێ کە دوو دۆڵچە بە دەستەوە بگری و بە ڕێدا بڕوا.

| كَقَنْطَرَةِ الرُّومِيِّ أَقْسَمَ رَبُّهَا | لَتُكْتَنَفَنْ حَتَّى تُشَادَ بِقَرْمَدِ |
|---|---|

«قنطرة الرومی»: پردی پیاوی ڕۆمی.

«لتکتنفن»: لام، جەوابی قەسەمە؛ ئەسڵەکەی «واللهِ لتکتنفن» و نوونەکەی نوونی تەئکیدە. یەعنی دەبێ زۆری موبالات پێ بکرێ.

«حتى تشاد»: تا بڵند و بە گەچ دروست بکرێ.

دەڵێ: لەگەورەیی و بڵندی و قایمیدا وەك پردێك بێ کە بۆ پیاوێکی ڕۆمی دروست بکرێ و سوێندی خواردبێ کە دەبێ بەخشت و گەچ و قسڵ دروست بکرێ.

صُهَابِيَّةُ الْعُثْنُونِ مُوجَدَةُ الْقَرا بَعِيدَةُ وَخْدِ الرِّجْلِ مَوَّارَةُ الْيَدِ

«صهابية»: خەبەرە بۆ موبتەدای مەحزوف کە «هِيَ»یە و وشترێکە کە زۆر سپی نەبێ.

«عثنون»: موی ژێر چەناگە.

«موجدة»: ئیسمی مەفعوول و بە مەعنا قەوییە.

«قرا»: وادییە و بە مەعنا پشتە.

«وخد»: توند ڕۆیشتن.

«موّارە»: سیفەتە موبالەغەیە و یەعنی هاتو چۆ و حەرەکەی دەست.

دەڵێ: مووی ژێر چەناگەی سوور و پشتی قەوی و حەرەکەی دەست و پێیانی لە ڕۆیشتندا توندە.

أُمِرَّتْ يَدَاهَا فَتْلَ شَزْرٍ وَأُجنِحَتْ لَهَا عَضُدَاهَا فِي سَقِيفٍ مُسَنَّدِ

«إمرار»: زۆر درەوشاوە.

«فتل شزر»: بریقەی ئاوریشم.

«اجناح»: خوار و دوو لا هاتنەوە.

«سقیف»: سەربان و سەقف.

«مسند»: مەحکەم بووە.

دەڵێ: دەستی وەك تەنافی مەحکەمی ئاوریشم دەدرەوشێتەوە تا لە سینگی دوور بێ و لە ژێر دوو تەنیشتیدا وەك بانێکی مەحکەم دروست کراوە.

**جَنُوحٌ، دِفَاقٌ، عَنْدَلٌ، ثُمَّ أُفْرِعَتْ　　لَهَا كَتِفَاهَا فِي مُعَالىً مُصَعَّدِ**

«جنوح»: سیفەتە موبالەغەی «جانحە»یە. یەعنی بەهۆی نیشاتی لە ڕۆیشتندا خوارە و خوار دەڕوا.

«دفاق»: زۆر توندڕەوە.

«عندل»: سەرگەورە.

«افرعت»: بڵند کراوە.

«کتفاها»: دوو شانی.

«معالی»: بڵند بووە.

«مصعد»یش هەر بەو مەعنایەیە.

دەڵێ: بەنیشات و کەچڕەو و توندڕەو و سەرگەورەیە و شانی بڵند و باهەیکەلە.

**كَأَنَّ عُلُوبَ النِّسْعِ فِي دَأَيَاتِهَا　　مَوَارِدُ مِنْ خَلْقَاءَ فِي ظَهْرِ قَرْدَدِ**

«علوب»: جەمعی «علب» و بە مەعنا ئەسەرە.

«نسع»: گوریسی باربەستن.

«دأیات»: جەمعی «دأی»ە و بە مەعنا ستوونی فەقەرات و شان و پشت و پەراسووە.

«موارد»: جەمعی «مورد»، یەعنی مەحەل، یان ڕێگا چونە سەر ئاو.

«خلقاء»: یەعنی بەردی سەخت و لووس.

«قردد»: یەعنی خاکێکی سەخت و پڕ هەوراز و لێژ.

دەڵێ: دەڵێی ئاساری قایش و گوریسی باربەندێك لە دەندەکانی سینگ و شان و پشتی چەند چاڵێکی پڕ لە ئاون لەسەر بەردێکی لووسی ڕەق لە عەرزێکی سەخت و پڕ هەوراز و نشێو. «ئەسەری گوریس و قایشی لە بەدەنیدا شوبهاندووە بە چاڵێکی پڕ لەئاو لە چاڵی و سپیەتیدا و پشت و شان و سینگی لە سەختیدا شوبهاندووە بە بەرد و لاشە و بەدەنی وەك زەمینێکی سەخت حیساب کردووە.

دەڵێ: گوریس و قایش تەئسیر لەو وشترەدا ناکەن، مەگین وەك تەئسیری باران لە بەردی لووس و سەختدا نەبێ.

تَلاقَىٰ، وَ أَحْياناً تَبِينُ كَأَنَّها بَنٰائِقُ غُرٌّ فِي قَمِيصٍ مُقَدَّدِ

«تلاقی»: لە ئەسڵدا «تتلاقی» بووە، یەعنی دەگەنە یەکتر و زەمیرەکەی ڕاجیعە وەلای شوێن و ئاساری قایشەکان.

«احیان»: جەمعی «حین» یەعنی وەخت.

«تبین»: لێك جیاوە بن.

«بنائق»: جەمعی «بنیقة» ـ بەو پارچە پەڕۆیە دەڵێن؛ کە بۆ مەحکەمی لە ئێخەی کراسی دەدروون.

«غرّ»: جەمعی «اغر» یەعنی سپی.

«مقدد»: دڕاو.

دەڵێ: نیشانە و شوێنی گوریس و قایشان لە پێستی بەدەنیدا جاری وایە وێك دەکەون و جاری واشە دوور دەکەونەوە، وەك لە نزیك ئاڵقەکان و لەسەر بارەکان وەك ئەو پارچە سپیە وایە کە لە ئیێخەی کراسی دەدروون کە لای سەرەوەی باریك و لای خوارەوە گوشادە.

---

وَ أَتْلَعُ نَهَّاضٌ، إِذٰا صَعِدَتْ بِهِ   كَسُكّٰانِ بُوصِيٍّ بِدِجْلَةَ مُصْعِدِ

---

«أَتلع»: بڵند گەردن.

«نهاض»: زۆر جوولەر و حەرەکەکەر.

«صعدت»: بڵندی کرد.

«بِهِ»: بێکە بۆ تەعدییە و زەمیرەکە ڕاجیعە وەلای گەردن.

«سکان»: دواوەی کەشتی.

«بوصي»: نەوعە کشتییەکە.

دەڵێ: گەردنی بڵندە و زۆر لە حەرەکەدایە کاتێ بەرزی دەکاتەوە، دەڵێ: دواوەی کەشتی «بوصی»یە لەناو چۆمی دیجلەدا ڕاست و بڵند حەرەکە دەکا.

---

وَ جُـــمْجُمَةٌ مِـثْلُ الْـعَلاٰةِ كَأَنَّـما   وَعَى الْمُلْتَقىٰ مِنْهٰا إِلىٰ حَرْفِ مِبْرَدِ

---

«جمجمه»: کاسەی سەر، وە لە تەرکیبدا موبتەدایە و خەبەرەکەی «لَها»ی مەحزووفە. یەعنی خاوەنی کاسە سەرێکی وایە.

«علاة»: سندانی ئاسنگەر.

«وعی»: لێرەدا بە مەعنا پێکەوە چەسپاوە.

«ملتقی»: جێگای پێکەوە چەسپاندن.

«حرف»: کەنار.

«مبرد»: بڕبەند، سەوهان.

دەڵێ: کاسە سەرێکی هەیە دەڵێی جێگای پەیوەستەکانی بە قەراغی بڕبەند پێکەوە چەسپاون.

---

**وَ خَدٌّ كَقِرْطاسِ الشّآمِي وَ مِشفَرٌ    كَسِبْتِ الْيَمَانِي قَدُّهُ لَمْ يُجَرَّدِ**

---

«خد»: کوڵمە.

«قرطاس الشامی»: واتە قاقەزی پیاوی شامی.

«مشفر»: لێوی وشتر.

«سبت»: پێستی گای دەباغ کراو.

«یمانی»: پیاوی یەمەنی.

«قد»: نەبڕاو و نەرم.

«لم یجرد»: فەرقی نییە.

دەڵێ: ڕوومەت و کوڵمەی لە سافی و شەفافیدا وەك قاقەزی شامی و لێوی وەك چەرمی یەمەنی نەرم و ڕاستن.

---

**وَ عَيْنانِ كَالْماوِيَتَيْنِ اسْتَكَنّتا    بِكَهْفَي حِجاجَيْ صَخْرَةٍ قَلْتِ مَوْرَدِ**

---

«ماویە»: ئاوێنە.

«استکنتان»: ساکن و جێگرتن.

«کهف»: ئەشکەوت.

«حجاج»: ئێسکی برۆیان.

«قلت»: گۆلاوی کێوی.

«مورد»: لێرەدا بە مەعنا ئاوە.

دەڵێ: چاوەکانی وەك دوو ئاوێنە دەچن لە پاکی و ڕووناکیداکە نێوگلێنەکانی وەك لە ناو بەردی سەختدا بن و دەشوبهێن بە گۆلاو.

طَحُورَانِ عُوَّارَ الْقَذىٰ فَتَرَاهُمَا　　كَمَكْحُولَتَيْ مَذْعُورَةٍ، أُمِّ فَرْقَدِ

«طحوران»: سیفەتە بۆ «عینان» لە شیعری پێشەوەدا و سیفەتە موبالەغەی «طحر»ە و بە مەعنا دوور فڕێدانە.

«عوار و قذیٰ» هەردووکیان بە مەعنا دڕك و داڵ و خاشاك.

«مکحولة»: یەعنی چاوێك کە سورمە و کلی تێ کرا بێ، بەڵام لێرەدا مەبەست دوو چاوی گاکێوییە.

«مذعُورَةٍ»: ترسناك.

«فرقد»: گوێرەکەی گاکێوی.

دەڵێ: چاوەکانی خود بە خود ناهێڵن تۆز و خۆڵ و چڵ و چێو بچیتە ناویانەوە. وە لە جوانیدا وەك چاوی مانگاکێوی سامناکن کە دایکی گوێرەکە بێ، کە لەبەر ئاگاداری بەچکەکەی نیگەرانە و هەمیشە بە دەورەی خۆیدا دەڕوانێ.

وَ صَادِقَتَا سَمْعِ التَّوَجُّسِ لِلسُّرىٰ        لِهَجْسٍ خَفِيٍّ أَوْ لِصَوْتٍ مُنَدَّدِ

**«توجس»**: گوێڕاگرتن.

**«سری»**: شەوڕەوی.

**«لهجس»**: دەنگ و حەرەکەت.

دەڵێ: بە دوو گوێی هەمیشە گوێقوڵاغە لە کاتی شەوڕۆیشتندا گوێ لە هەموو چرپە و دەنگی ئاشکرا و نەهێنی ڕادەگری.

مُؤَلَّلَتَانِ تَعْرِفُ الْعِتْقَ فِيهِمَا        كَسَامِعَتَيْ شَاةٍ بِحَوْمَلَ مُفْرَدِ

**«مؤللتان»**: تەسنییەی ئیسمی مەفعولە و لە «تأليل»ە و ئەسڵی «ألّة»ە. بە مەعنا نێزە و باقی ئالەتی جەنگی و «تأليل» بە مەعنا تیژکردن و لێرەدا مەبەست دوو گوێی تیژی وشتری مێیە.

**«عتق»**: ئەسالەت، نەجیبی.

**«سامعة»**: گوێی.

**«شاة»**: لە لۆغەتدا بە مەڕ و بزن و ئاسك و گاکێوی دەڵێن، بەڵام لێرەدا بە مەعنا گاکێوییە.

**«حومل»**: ناوی جێگایەکە.

**«مفرد»**: تەنیا.

دەڵێ: گوێی زۆر تیژن و وەك دوو گوێی گاکێوی وان کە لە «حەومەل» تەنیا بێ، کە زۆر وریا و لەسەر هەستە و گوێڕاگرە.

وَ أَرْوَعُ نَبَّاضٌ، أَحَذٌّ مُلَمْلَمٌ كَمِرْداةِ صَخْرٍ فِي صَفِيحٍ مُصَمَّدِ

«أَروع»: ترسناك، باهۆش.

«نباض»: نەبز و لێدان بە زۆری.

«أحذ»: سووك و سەریع.

«مُلملم»: مەحكەم و سەخت.

«مرادة»: ئەو بەردەی بەردانی پێ دەشكێنن.

«صفیح»: بەردی پان.

«مصمد»: مەحكەم و سەخت.

دەڵێ: دڵێكی هەیە كە هەمیشە وشیار و لە لێداندایە و سووك و سەریعە و دڵی وەك بەردێكی ڕەق و پان و سەخت وایە.

وَ أَعْلَمُ مَخْرُوتٌ مِنَ الْأَنْفِ مَارِنٌ عَتِيقٌ مَتىٰ تَرْجَمِ بِهِ ٱلْأَرْضَ تَزْدَدِ

«أعلم»: قەڵشی لێوی سەرەوە.

«مخروت»: كون كراو.

«مارن»: نەرمەی لووت.

«عتیق»: بە مەعنا كۆنە، بەڵام لێرەدا بە مەعنا «أَصیلَ»ە.

دەڵێ: قەڵشتی لێوی سەرەوەی و نەرمەی لووتی كون و ئەوەندە ئەسڵە كە لە هەر جێگایەك لێخوڕی ماندوو نابێ نیشاتی زیاتر دەبێ.

یان دەڵێ: ئەگەر سەروو لووتی بە ئاوسارەكەی ڕاكێشی و بۆلای عەرزی بێنی توندتر دەڕوا.

**وَ إِنْ شِئْتُ لَمْ تُرْقِلْ وَ إِنْ شِئْتُ أَرْقَلَتْ   مَخافَةَ مَـلْوِيٍّ مِـنَ الْـقَدِّ مُـحْصَدِ**

«**ارقل**»: بە پەلە و توند ڕۆیشتن.

«**مخافة**»: لە ترسان.

«**ملوی**»: لێك هاڵاو.

«**قَد**»: قامچی.

«**محصد**»: قایم.

دەڵێ: ئەگەر بمهەوێ لەسەرخۆ دەڕوا و ئەگەر بشمهەوێ توند و بە پەلە دەڕوا، لە ترسی ئەو قامچییە چندراو و مەحکەمە.

**وَ إِنْ شِئْتُ سامیٰ واسِطَ الْكُوْرِ رَأْسُها   وَ عامَت بِضَبْعَيْها نَـجاءَ الْـخَفَيْدَدِ**

«**سامی**»: بەرامبەر و موقابیل.

«**واسط الکور**»: پێشی کورتانی وشتر.

«**عامت**»: مەلەی کرد.

«**ضَبعیها**»: دوو باسکی.

«**نجاءَ**»: بە توند ڕۆیشتن.

«**خَفیدَدِ**»: نەعامە، وشترمورغ.

دەڵێ: ئەگەر مەیلم لێ بێ سەری بەرز دەکاتەوە و لە موقابیل بەرزی پێشی کورتانەکەی ڕادەگرێ و بە هەردوك باسکی وەك «نەعامە»ی نێر مەلە دەکا. واتە: بەپەلە دەڕوا دەست و باسکانی تەکان دەدا وەك مەلە بکا.

عَلىٰ مِثْلِهٰا أَمْضِي إِذٰا قٰالَ صاحِبِي    أَلٰا لَيْتَنِي أَفْدِيْكَ مِـنْهٰا وَ أَفْـتَدِي

**«أفديك»**: نەجاتت دەدەم لەبەرانبەر ماڵێك یان هەر شتێکی تر.

دەڵێ: سورای ئەو جۆرە وشترە دەبم و سەفەر دەکەم وەختێك هاوڕێکەم بڵێ: خۆزگە لە نارەحەتی سەفەر و دووری ڕێگا ئەتۆم نەجات دەدا و خۆشم ڕزگارم دەبوو. دەڵێ: لە سەفەردا وشترێکی وام پێ دەبێ.

وَ جٰاشَتْ إِلَيْهِ النَّفْسُ خَوْفاً وَ خٰالَهُ    مُصٰاباً وَ لَوْ أَمْسىٰ عَلىٰ غَيْرِ مَرْصَدِ

**«و جاشت اليه النفس»**: عەطفە بۆ سەر «قال صاحبی» شیعری پێشـەوە، یەعنی: هاوڕێکەم ترسا و خەیاڵی بوو ڕابکا.

**«خاله مصابا»**: وایزانی تووشی موسیبەت بووە.

**«مرصد»**: ڕێگا.

دەڵێ: ترسا و هاتە سەر ئەوەی ڕابکا و وایزانی تووشی مـوسـیبەت بـووە. هەرچەند شەوانە دز ناچنە سەر ڕێگا، بەڵام خودی ڕێگا و دەشت و چۆڵ و سەحرا لە سەفەردا خەتەرناکە.

إِذَا الْقَوْمُ قٰالُوا مَنْ فَتىً؟ خِلْتُ أَنَّنِي    عُـنِيتُ فَـلَمْ أَكْسَـلْ وَ لَـمْ أَتَـبَلَّدِ

**«فتی»**: گەنجی نازا.

**«خلت»**: وا دەزانم.

**«عنیت»**: مەبەستیان لە منە.

«لم أكسل»: واتە سستيم نەكرد.

«لم اتبلد»: يەعنى كەودەن نيم.

دەڵێ: كاتێ گەل بڵێ: لەكاتى تەنگانەدا كێ ئازاو مەردە؟ وا دەزانم ڕووى قسەيان لەگەڵ منداية، لەوكاتەدا ئەمن نە تەنبەڵى دەكەم و نەكەودەنى بە خەرج دەدەم. بەڵكوو لە خزمەت بە گەلەكەم هۆشيارم.

| أَحَلْتُ عَلَيْها بِالْقَطِيعِ فَأَجْذَمَتْ | وَ قَدْ خَبَّ آلُ الأَمْعَزِ الْـمُتَوَقِّدِ |
|---|---|

«أحلت»: لێرەدا بە مەعنا ڕووم دەوى كرد.

«قطيع»: قامچى.

«أجذمتْ»: توند ڕۆيشت.

«خبّ»: شێواو، لەرزين.

«آل»: سەراب، تراويلكە.

«أمعز»: بەو زەمينە دەڵێن كە بەرد و لمى تێدا بێ.

«متوقد»: بريقەدار.

دەڵێ: ڕووم تێ‌كرد و بە قامچى لێمدا و توند ڕۆيى لە چێشتەنگاوێدا لە سەرابى عەرزى خاوەن بەرد و ڕمل بريقەى دەدا.

| فَذالَتْ كَما ذالَتْ وَلِيدَةُ مَجْلِسٍ | تُرِي رَبَّها أَذْيالَ سَحْلٍ مُـمَدَّدِ |
|---|---|

«ذالت»: لەنجە و لار.

«وليدة»: كەنيزەك.

«تُري»: ـ خۆی نیشان دا، دەبینی.

«أذيال»: داوێن.

«سحل»: کراسی سپی.

«ممدد»: درێژ.

دەڵێ: لار و لەنجەی کرد وەك ئەوکەنیزەکەی کە لە مەجلیسی ڕەقسکردندا داوێنی کراسی سپی درێژ بە هۆی ڕەقس و سەماوە با دەدا و بە خاوەنەکەی نیشاندەدا.

**وَ لَسْتُ بِحَلّالِ التِّلاعِ مَـخافَةً وَلٰكِنْ مَتىٰ يَسْتَرْفِدِ الْقَوْمُ أَرْفِدِ**

«حلال»: سیفەتە موبالەغەی «حلول»ە و بە مەعنا هاتنە خوارە.

«تلاع»: جەمعی «تلعة». یەعنی زەوییەکی بڵند و سێلاوگیر. کە لێرەدا مەبەست جێگای بەرزە.

«استرفاد»: داوای یاری.

دەڵێ: لەجێگای بڵند خۆم ناشارمەوە لەترسی میوانان. بەڵام هەر کاتێك قەوم و خوێش داوای یارمەتیم لێ بکەن بە گیان و دڵ یارمەتیان دەدەم، مەبەستی پێ ئەوەیە دەڵێ: بێ‌غیرەت نیم و ناترسم؛ لە کاتی پێویستدا بۆ هەر نەوعە کۆمەکی ماڵی و بەدەنی و جەنگی ئامادەم.

**فَإِنْ تَبْغِنِي فِي حَلْقَةِ الْقَوْمِ تَـلْقَنِي وَإِنْ تَلْتَمِسْنِي فِي الْحَوانِيتِ تَصْطَدِ**

«تبغ»: شەرتە و مەجزوومە بە حەزفی یێ.

«و تلق»: جەزا و مەجزوومە بە حەزفی ئەلف.

«حوانیت»: جەمعی «حانوت»ە، واتە دوکانی مەیفرۆشی و مەیخانە.

«تصطد»: ڕاوکردن.

دەڵێ: ئەگەر دەتهەوێ لە مەجلیسی قەومدا چاوت پێ بکەم بۆ تەگبیر و مەشوەرەت ئەوە لەوێ دەمبینی و ئەگەر دەشتهەوێ لەدوکانی مەیخانە ڕاوم بکەی ئەوە لەوێ دەخۆمەوە و شەراب دەدەم بە هاوڕێیان.

دەڵێ: ئەمن ئەهلی بەزم و ڕەزم و شۆخی و مەیخانەم.

وَ إِنْ يَلْتَقِي الْحَيُّ الْجَمِيعُ تُلَاقِنِي ... إِلَىٰ ذِرْوَةِ الْبَيْتِ الشَّرِيفِ الْمُصَمَّدِ

«یلتق»: موزاریعی بابی ئیفتیعالە و لە «لقاء»ە و مەجزوومە بە حەزفی «یێ» و بە مەعنا پێك گەیشتنە.

«تلاق»: ئەسڵەکەی «تلاقی» بووە و بە مەعنا کۆبوونەوەیە.

«الی»: نیسبەت دەدرێم.

«ذروة»: دوند، بەرزترین شوێنی کێو، نووکی هەر بەرزاییەك.

«مصمد»: پەنابۆبەر.

دەڵێ: هەرکاتێ گەل کۆوە بێ و باسی فەخرکردن بە ئەسڵ و حەسەب و نەسەب بێتە پێشەوە، ئەمن دەبینییەوە لە خانەوادیەکی بەرزترین لەو خانەوادانەدا کە شەریف و قیبلەی ئامالن.

نَدامَايَ بِيضٌ كَالنُّجُومِ وَ قَيْنَةٌ ... تَرُوحُ إِلَيْنا بَيْنَ بُرْدٍ وَ مُجْسَدِ

«نداما»: جەمعی «ندمان»ە یەعنی هاونشین، ڕەفیق.

«بیض»: یەعنی سپی.

«قینة»: کەنیزەکی گۆرانیبێژ.

«برد»: کراسی خەت خەتاوی بە کراسی خوری ڕەشیش دەڵێن.

«مجسد»: کراسی ڕەنگکراو بە «زەعفەران».

دەڵێ: هاوڕێ و هاودەمەکانم سپین وەك ئەستێران، واتە ئازادن و لە جارییان نەبوون تا ڕەشی دایکیان بە میرات وەرگرتبێ، یان وەك کراسی سپی هیچ عەیب و ئیرادێکیان لێ ناگیرێ و پاکن. وە جاریەیێکی گۆرانیبێژ جاری وایە کراسی خەتخەتاوی جاری واشە ئی ڕەنگ زەعفەرانی لەبەردایە دێتەلامان. واتە ئێمە مەجلیسی بەزمی بوزرگەوارانەمان هەیە.

---

رَحِيبٌ قِطَابُ الْجَيْبِ مِنْهَا رَفِيقَةٌ      بِجَسِّ النَّدامىٰ بَضَّةُ الْمتَجَرَّدِ

---

«رحیب»: گوشاد.

«قطاب الجیب»: ئێخەی کراس.

«رفیقة»: میهرەبان.

«جسّ»: دەست لێدان.

«بضة»: نەرم و لەتیف.

«متجرد»: ڕووت.

دەڵێ: ئێخەی کراسەکەی گوشادە و میهرەبانە، ڕازییە بە وەی کە دەست بەرین بۆ ئێخەی کراسەکەی و دەست لەو بەندە نەرم و لەتیفە ڕووتەی بدەین.

إِذَا نَحْنُ قُلْنَا أَسْمِعِينَا انْبَرَتْ لَنَا عَلَىٰ رِسْلِهَا مَطْرُوقَةً لَمْ تَشَدَّدِ

«أسمعينا»: گۆرانیمان بۆ بلێ.

«انبرت»: دەست پێدەکا.

«على رسلها»: ئارام و لەسەر خۆ.

«مطروقة»: زەعیف و سست.

«لم تشدد»: خۆی ماندوو ناکا.

دەڵێ: کاتێ ئارەزووی گۆرانی گوتنی بێ بە دەنگێکی ئارام و نەرم و لەسەرخۆ و بێ خۆماندووکردن دەست بە گۆرانی گوتن دەکا.

إِذَا رَجَّعَتْ فِي صَوْتِهَا خِلْتَ صَوْتَهَا تَجَاوُبَ أَظْآرٍ عَلَىٰ رُبَعٍ رَدِي

«ترصيع صوت»: دەنگ بەرزکردنەوە.

«تجاوب»: وەڵامی یەکتردانەوە.

«أظآر»: جەمعی «ظئر»ە یەعنی ژنی منداڵدار، وشترێك یان ژنێك کە بە مناڵی یەکێکی تر سۆز و خۆشەویستی دەربڕێ.

«ربع»: بەو منداڵە دەڵێن کە سەری ساڵ لەدایك دەبێ.

«ردي»: بە هیلاك چو..

دەڵێ: کاتێ دەست بەگۆرانی بکا و دەنگ بەرز بکاتەوە دەنگی وەك دەنگی ئەو دایکە دەچی کە منداڵەکەی مردووە و دەیلاوێنێتەوە ئەوەندە مەحزوونە.

وَ مٰا زٰالَ تَشْرٰابِي الْخُمُورَ وَ لَذَّتِي     وَ بَيْعِي وَ إِنْفٰاقِي طَرِيفِي وَ مُتْلَدِي

«تشراب»: مەسدەرە و بە مەعنا خواردنەوەیە.

«انفاق»: خەرجکردن.

«طریف»: ماڵی تازە.

«متلد»: ماڵی کۆنە.

دەڵێ: ئـەمن هـەمیشە کـار و کـاسبیم بـادەنۆشـی و خـۆشگـوزەرانـی و فرۆشتنی ماڵی تازە و کۆن بووە.

إِلٰى أَنْ تَحٰامَتْنِي الْعَشِيرَةُ كُلُّهٰا     وَ أُفْرِدْتُ إِفْرٰادَ الْبَعِيرِ الْـمُعَبَّدِ

«تحامتني»: دووری و خۆپاراستن لە من.

«افردت»: بە تەنیا مامەوە.

«معبد»: بەرهەڵدایان کردم وەك بەرهەڵداکردنی وشتری گەڕ.

دەڵێ: کار و پیشەم ئەوە بوو تا خێڵ و تائیفە لێم دوور کەوتنەوە و وەك وشتری گەڕ بەتەنیا مامەوە.

رَأَيْتُ بَنِي غَبْرٰاءَ لٰا يُنْكِرُونَـنِي     وَ لٰا أَهْلُ هٰذٰاكَ الطِّرٰافِ الْمُمَدَّدِ

«بنی غبراء»: کوڕانی هەژار و بێ نەوا.

«هذاك»: «ها» حەرفی تەنبیهە و «ذا» ئیسمی ئیشارەیە و «ك» حەرفی خیتابە.

«طراف»: خێوەتی چەرمی.

«ممدّد»: گەورە.

دەڵێ: ئەگەر قەوم و قەبیلە منیان نەوێ و لەبەرم ڕا بکەن چ دەربەستم؛ خۆ هەژار و بێنەوا سەخاوەت و شوجاعەت و چاکە و پیاوەتی من دەناسن نەك هەر بەتەنێ ئەوان، بەڵکوو دەوڵەمەندە چادر نشینەکانیش ئاشنا و ڕەفیقمن. هەژارەکان لەبەر چاوەڕوانی بەخشش و دەوڵەمەندەکان لەبەر حەسەب و نەسەب و ئیفتیخاراتم.

**أَلَا أَيُّهٰذَا الزَّاجِرِي أَحْضُرُ الوَغـىٰ     وَأَنْ أَشْهَدَ اللَّذَّاتِ هَلْ أَنْتَ مُخْلِدِي**

«زاجر»: مەنعکەر و لۆمەکەر.

«أحضر»: حازربوون.

«وغی»: شەڕ.

«أشهد اللذات»: حازر بم لە مەجلیسی خۆشیدا و لەززەت بەرم.

«مخلد»: ئەبەدی.

دەڵێ: ئەی ئەو کەسەی کە سەرزەنشتم دەکەی کە دەچم بۆ شەڕ لە ترسی کوشتن و لۆمەم دەکەی لە عەییاشی و خۆشگوزەرانی و دەتهەوێ دەستم پێ لێ هەڵگری، بۆ ئەگەر دەست لەوانە هەڵگرم، ئەتۆ ناهێڵی بمرم؟. یان دەتوانی بە زۆر مەجبوورم کەی کە تەرکیان بکەم؟

**فَإِنْ كُنْتَ لَا تَسْطِيعُ دَفْعَ مَنِيَّتِي     فَدَعْنِي أُبَادِرُهَا بِمَا مَلَكَتْ يَدِي**

«لا تسطيع»: ئەگەر نەتوانی لە مەرگ ڕزگارم بکەی.

«دعنی»: لێمگەڕێ با ڕابوێرم.

دەڵێ: کەواتە کە ناتوانی لە مەرگ ڕزگارم بکەی، لێمگەڕێ با تا مەرگ نەبووە بە میوانم ئەوەی بۆم دەکرێ بیکەم و مادام هەر دەبێ بمرین با خۆش ڕابوێرم.

وَ لَوْلَا ثَلَاثٌ هُنَّ مِنْ عِيْشَةِ الْفَتىٰ　　　وَ جَدِّكَ لَمْ أَحْفِلْ مَتىٰ قَامَ عُوَّدِي

«ثلاث»: لە دوا «لولا» موبتەدایە و خەبەرەکەی مەحزووفە.

«وجدّك»: سوێندە، یەعنی سوێند بە بەخت و ئیقباڵت.

«لم احفل»: یەعنی موبالاتم نەکردووە.

«عوّد»: چوونە لای نەخۆش بۆ ئەحواڵپرسی.

دەڵێ: ئەگەر لەبەر خاتری سێ شت نەبوایە کە خۆشی و لەززەتی پیاوی ئازان سوێند بە بەخت و ئیقباڵت دەربەست نەدەبووم کەی ئەو کەسانەی دێن بۆ ئەحواڵپرسیم لە کاتی سەرەمەرگدا هەڵدەستن دەڕۆن. یەعنی دەربەست بە مردن نەدەبووم کەی دەگاتە سەرم؟

فَمِنْهُنَّ سَبْقُ الْعَاذِلَاتِ بِشُــرْبَةٍ　　　كُمَيْتٍ مَتىٰ مَا تُعْلَ بِالْمَاءِ تُزْبِدِ

«عاذلات»: جەمعی «عاذلة»، واتە ئەو ژنانەی لۆمەم دەکەن.

«شربة»: جارێك خواردنەوە.

«کمیت»: شەرابی سوور و مایل بە ڕەشی.

«تُعل»: تێکەڵ بە ئاو کرا.

«تزبد»: کەف دەکا.

دەڵێ: یەکێك لەو سێ شتە خۆشەویستانە ئەوەیە کە لە پێش هەستان و پەیدابوونی ژنانی لۆمەکەر پەرداخێك لە شەرابی یاقووتی ڕەنگ کە هەرچەند ئاوی تێکەن کەف بکا وەخۆم.

## وَكَرِّي إِذٰا نٰادَى الْمُضٰافُ مُجَنَّباً ... كَسِيدِ الْـغَضٰا نَـبَّهْتَهُ الْـمُتَوَرِّدِ

«کرّی»: غاردان و گەڕانەوەم.

«مضاف»: شێوان و ترسان.

«مجنب»: کەچیی پێی ئەسپ.

«سید»: گورگ.

«غضا»: نەوعە درەختێکە کە دارەکەی زۆر سەختە و ئاگرەکەی درەنگ خامۆش دەبێ. هەروەها ناوی جێگایەکیشە.

«نبهته»: وەخەبەرت هێنابێ.

«متورد»: چۆتە سەر ئاو.

دەڵێ: دووەم ئەوەیە کە ترس داوای لێکردم کە وەگێڕم بۆ لای ئەو ئەسپەی کە کەچی و خواری لە دەستانیدایە. کە ئەوەش نیشانەی ئەسپی چاکە. کە لە تیژ ڕۆیین و توند ڕۆییندا وەك گورگێ وایە کە خاوەنی سێ سیفەت بێ، لە بەینی درەختی «غضا»دا بێ کە لە دڕەندەترین گورگانە. گورگی «غضا» کاتێ تووڕە و تینووی بێ زۆر بە توندی دەڕوا و شاعیریش بە سورای ئەسپیدا چوست و چالاك بۆ یارمەتیدانی ئەوکەسەی لە ترسان پەنای بۆ دێنی غار دەدا.

وَ تَقْصِيرُ يَوْمِ الدَّجْنِ وَالدَّجْنُ مُعْجِبٌ    بِـبَهْكَنَةٍ تَـحْتَ الْـخِبْاءِ الْـمُعَمَّدِ

«تقصير»: کورتکردنەوە و بەسەربردن.

«يوم‌الدجن»: ئەو ڕۆژە کە هەور هەموو وڵاتی داپۆشیبێ.

«معجب»: بەلاتەوە سەیر و جوان.

«بهکنة»: ژنی جوان و نەرم و لەتیف و قەڵەو.

«خباء»: خیوەتی خوری، یان موو.

«معمد»: بەرزکرابێتەوە بە ئەستوونەکان.

دەڵێ: سێیەم کورتکردنەوەی ڕۆژی هەورکە زۆر خۆشە لەگەڵ ژنێکی جوان و نەرم و قەڵە و لەژێر خێووەتێکی بەرز بە جۆرێك غەرقی لەززەت و ڕابواردن بێ کە نەزانێ ئەو ڕۆژە چۆن زوو تێپەڕی.

كَأَنَّ الْبُرِينَ وَ الدَّمْالِيجَ عُلِّقَتْ    عَلَىٰ عُشَرٍ أَوْ خِرْوَعٍ لَمْ يُخَضَّدِ

«برین»: بەو ئەڵقە دەڵێن کە بە لووتی وشترەوە هەڵی دەواسن، بەڵام لێرەدا مەبەست دەستبەند و خڕخاڵە.

«دماليج»: یەعنی بازوبەند.

«عُشَر»: قامیشی شەکر.

«خِرْوَع»: ژنی نەرم و ناسك کە بە ئاسانی دانیشێ و ڕاست بـێتـەوە، یـان گیای نەرم.

«لم يُخضَدِ»: لەقەکانی نەشکابنەوە.

دەڵێ: ئەو ژنە ئەوەندە بەشان و شەوکەت بێ، کە دەستبەند و خرخاڵە و بازوبەندی وەك بە دارێکی بەرزی جوان و نەرمەوە هەڵاوەسرابن.

**كَرِيمٌ يُرَوِّي نَفْسَهُ فِـي حَـيَاتِهِ　　سَتَعْلَمُ إِنْ مُتْنَا غداً أَيُّنَا الصَّدِي؟**

«کریم»: خەبەرە بۆ موبتەدای مەحزووف کە «أَنَا»یە، واتـە ئـەمن ئـەهلی سەخاوەت و کەرەمم.

«یروّی»: خۆی تێراو دەکا.

«صدی»: تینوو.

دەڵێ: ئەمن ئەو پیاوە سەخییەم کە تاماوم خۆم لە شەراب تێراو دەکەم. ئەو وەختە کە مردین ئەی ئەو کەسەی کە لۆمەم دەکەی کامەمان تینووین؟ ئەمن تێراو لە بادە و ئەتۆش بە لێوی وشکەوە دەمرین.

**أَرَىٰ قَبْرَ نَحَّامٍ بَخِيلٍ بِـمَالِهِ　　كَقَبْرِ غَوِيٍّ فِي الْبَطَالَةِ مُفْسِدِ**

«نَحّام»: حەریس لەسەر کۆکردنەوەی ماڵی دنیا و نەدانی بە خەڵك.

«غوی»: گومڕا.

دەڵێ: گۆڕی پیاوی حەریس لەسەر کۆکردنـەوەی مـاڵی دنـیا وەك گـۆڕی پیاوێکی بێکارەی فاسید دەبینم. لەوانەشە مەبەستی پێ ئەوە بـێ کـە لەپـاش مردن لەبەینی ماڵپەرست و دوور لە بادەنۆشی و ئەو کەسەی کە عومر و ماڵی لە ئارەقخواردنەوەدا بەسەر بردبێ فەرق و جیاوازی نییە.

تَرىٰ جَثْوَتَيْنِ مِنْ تُرَابٍ عَلَيْهِمَا    صَفَائِحُ صُمٌّ مِنْ صَفِيحٍ مُـنَضَّدِ

«جثوة»: کۆمەڵێك گڵ یان بەرد.

«صفائح»: جەمعی «صفیحه» و بە مەعنا بەردی پانە.

«صمّ»: ڕەق و سەخت.

«منضد»: لەسەر یەك هەڵچندراوە.

دەڵێ: گۆڕی ماڵپەرست و بەخیل و گۆڕی ئەوکەسەی خۆش ڕادەبوێرێ و بەخشندەیە هەردوکیان تەپۆڵکە گڵێکن کە بەردی سەخت و ڕەقیان لە دەورە هەڵچندراوە.

أَرَى الْمَوْتَ يَعْتَامُ الْكِرَامَ وَ يَصْطَفِي    عَـقِيلَةَ مَـالِ الْـفَاحِشِ الْـمُتَشَدِّدِ

«یعتام»: هەڵدەبژێرێ.

«عقیلة»: لە ماڵ و ژن و هەرشتێك بە ئەرزشتر و باشتر بێ.

«فاحش»: بەخیل.

«متشدد»: بەخیل و سەختگیر.

دەڵێ: ئەمن دەبینم کە مەرگ پیاوی سەخی و بـەخشندە هـەڵدەبـژێری و دەیانکوژی و ماڵی بەنرخی بەخیلی سەختگیر بۆ مانەوە ئیختیار دەکا.

یان دەڵێ: عاقیبەتی پیاوی سەخی و پیاوی بەخیل هـەر مـەرگـە، کـەواتـە بەخیلی و تەماع بۆچی؟ بەڵام لێرەدا شاعیر باسی ماڵی بەخیلی کردووە، باسی بەخیلی نەکردووە.

أَرَى الْعَيْشَ كَنْزاً نٰاقِصاً كُلَّ لَيْلَةٍ        وَ مٰا تَنْقُصِ الْأَيّٰامُ وَ الدَّهْرُ يَنْفَدِ

«كنز»: گەنج، خەزێنە.

«ينفد»: تەواو ئەبێ.

دەڵێ: ژیانم وەك گەنجێك دێتە بەر چاو کە هەموو شەوێك لێی کەم دەبێتەوە و هەر شتێك کە ڕۆژگار و زەمانە لێی کەم وەکەن ئاخری دێ، بەخیلی شایستەی ئینسان و ئەو ژیانە کەم و کورتە نییە.

لَعَمْرَكَ إِنَّ الْمَوْتَ مٰا أَخْطَأَ الْفَتىٰ        لَكَالطِّوَلِ الْمُرْخىٰ وَ ثَنْيٰاهُ بِالْيَدِ

«عَمْر»: ماوەی ژیان.

«لكالطول» ـ لام جوابی «إنّ» و کاف بۆ تشبیهە. «طول»: گوریسی درێژ.

«مرخى»: درێژ کراو.

«ثنيا»: تسنییەی «ثني»ە بە مەعنا سەرەکەی.

دەڵێ: بەگیانی تۆ قەسەم مردن لەوکاتەدا کە نایێتە سەر ئینسان و درێژە بە ژیان دەدا، وەك گوریسێکی درێژی شلە کە لە دەستی حەیوانێك کراوە و سەرەکەی بە دەستی خاوەنەکەیەتی، یەعنی ئینسان گوریسی مەرگ و فەنای لە دەست و پێدایە وەك وڵاغێك کە تا ئەندازەیەك بە ئازادی دەلەوەڕێ، بەڵام سەرە گوریسەکە بە دەست خاوەنەکەیەتی و هەرکاتێ ویستی بۆ لای خۆی ڕایدەکێشێ. وەك لە هیندێك نوسخەدا ئەو شیعرەی لە دواوە دێ:

مَتیٰ مٰا يَشَأْ يَوْماً يَقُدْهُ لِـحَتْفِهِ        وَ مَنْ يَكُ فِي حَبْلِ الْمَنِيَّةِ يَنْقَدِ

«يقده»: ڕایدەکێشێ.

«حتف»: مرگ، مردن.

یەعنی هەر کاتێك ئارەزوو بکا بـۆلای مـەرگـی ڕادەکـێشـی و ئـەوەی بـە گوریسی مەرگەوە بێ موتیع و فەرمانبەردارە.

فَمٰالِي أَرٰانِي وَ ابْنَ عَمِّي مٰالِكاً        مَتیٰ أَدْنُ مِنْهُ يَنْأَ عَنِّي وَ يَـبْعُدِ

«أدن»: ـ شەرتە بۆ «متیٰ»ی جازیمە و مەجزوومە بە واوی «لام الفعل».

«ينأ»: ئەسڵەکەی «ينأى»یە و جەزای شەرتە و جەزمەی بە حەزفی ئەلفی «لام الفعل»ە.

«يَبعُدِ»: دوور دەکەوێتەوە.

دەڵێ: ئەوە چ وەزع و حاڵێکە هەیە لەگەڵ مالیکی ئامۆزام؟ هەرکـاتێ لێی نزیك دەبمەوە لێم دوور دەکەوێتەوە.

يَلُومُ و مٰا أَدْرِي عَلاٰ مَ يَـلُومُـنِي؟   كَمٰا لاٰمَنِي فِي الْحَيِّ قُرْطُ بْنُ مَعْبَدِ

«عَلاٰ مَ»: لە ئەسڵدا «علی ما» بووە.

«حي»: عەشیرە، تایفە.

«معبد»: ناوی کەسێکە

دەڵێ: مالیکی ئامۆزام سەرزەنشت و لۆمەم دەکا و نازانم بەهۆی چ بەڵگەیەکەوە؟ هەر وەك لەنێو تائیفەدا قەرتی کوری مەعبەد لۆمەی کردووم. هەردوکیان بێ بەڵگە و زاڵمانە لۆمەیان کردووم.

وَ أَيْأَسَنِي مِنْ كُلِّ خَيْرٍ طَلَبْتُهُ     كَأَنَّا وَضَعْنَاهُ إِلَىٰ رَمْسٍ مُلْحَدِ

«أيأسنى»: نائومێدی کردم.

«رمس»: قەبر و ناشتن.

«ملحد»: له قەبرنان.

دەڵێ: مالیك منی له هەر خێرێکی ویستم نائومێد کرد. وەك بڵێی ئەو داوا کردنەمان نابێتە ناوگۆری مردوێکەوە، واتە چاوەڕوانی چاکە له مالیك وەك ئەوە وایە کە ئومێد و چاوەڕوانی چاکەت له مردوێك بێ کە چاوەڕوانی له هەردوکیان بە خۆڕاییە.

عَلَىٰ غَيْرِ ذَنْبٍ قُلْتُهُ غَيْرَ أَنَّنِي     نَشَدْتُ وَ لَمْ أُغْفِلْ حَمُولَةَ مَعْبَدِ

«غير أننى»: ئیستیسنای مونقەتیعە و بە مەعنا «بەڵام»ە.

«نشدت»: له ون بووەکەم دەگەڕان.

«حمولة»: وشترێك کە توانای بار هەڵگرتنی هەبێ.

«معبد»: ناوی برای شاعیرە.

دەڵێ: ئەو هەموو لۆمەکردنە لەسەر هیچ گوناحێك نەبوو کە من سەبارەت

بە ئەو کردبێتم، یان قسەیەکم کردبێ. تەنیا داوای وشترە بارهەڵگرەکەی «معبد»م کردووە و دەستم لێ هەڵنەگرتووە.

وَ قَرَّبْتُ بِالْقُرْبىٰ وَجَدِّكَ إِنَّنِي ... مَتىٰ يَكُ عَهْدُ لِلنَّكِيثَةِ أَشْهَدِ

«قربی»: جەمعی «قرابت» بە مەعنا خزمایەتی.

«نکیثة»: مونتەهای کۆشش، یان کارەساتێك کە عەهد و پەیمانی تێدا شکابێ.

دەڵێ: بەهۆی خزمایەتییەوە خۆم هێناوەتە پێشەوە، سوێند بە بەخت و شانسی تۆ ئەگەر کارێك ڕوو بدا ئاخر دەرەجەی کۆشش بە خەرج دەدەم و لە ناخۆشترین کاتدا ئامادەی هاوکاری دەبم.

وَ إِن أُدْعَ لِلْجُلّىٰ أَكُنْ مِنْ حُمٰاتِهٰا ... وَ إِنْ يَأْتِكَ الْأَعْدٰاءُ بِالْجَهْدِ أَجهَدِ

«أُدع»: بانگهێشت بکرێم.

«جلّی»: ئیشی گەورە.

«حماة»: جەمعی «حامی» واتە: لایەنگر.

دەڵێ: ئەگەر بۆ کار و کارەساتێکی گەورە و ناخۆش بانگ بکرێم؛ ئەوە من لەلایەنگران و پاسەوانانی ئەوم. وە ئەگەر دوژمن بێتە سەرت بە هەموو توانامەوە دیفاعت لێ دەکەم.

وَ إِنْ يَقْذِفُوا بِالْقَذْعِ عِرْضَكَ أَسْقِهِم    بِشُرْبِ حِيَاضِ الْمَوْتِ قَبْلَ التَّهَدُّدِ

«قذف»: قسەی بێسەرو بەر.

«قذع»: جنێو و قسەی بێمەعنا.

«عرض»: ئابڕوو و حەسەب و نەسەب. جاری واشە مەبەست پێی نەفسە.

دەڵێ: ئەگەر دوشمنان خەریك بن ئابڕوو و شەرافەتی تۆ بەرن، ئەوە من لە پێش هەڕەشە و ئیعلانی شەڕ لەسەر چاوەی مەرگ تێراویان دەکەم.

بِلَا حَدَثٍ أَحْدَثْتُهُ وَ كَمُحْدِثٍ    هِجَائِي وَ قَذْفِي بِالشَّكَاةِ وَ مُطْرَدِي

«مُحدِث»: بەو کەسە دەڵێن کە دەست بۆ کارێکی بیدعەت و ناشرین بەرێ.

«شکاة»: شکایەتکردن.

«مطرد»: دەرکردن.

دەڵێ: بەبێ ئەوەی جینایەت و کارێکی خەراپم کردبێ، وەك کەسێك کە خەراپە و جینایەتی کردبێ قسەی ناشرینم پێ دەڵێن و لۆمەم دەکەن و لە خۆیانم دوور دەخەنەوە.

فَلَوْكَانَ مَوْلَايَ اِمْرَءاً هُوَ غَيْرُهُ    لَفَرَّجَ كَرْبِي أَوْ لَأَنْظَرَنِي غَدِي

«اِمرَء»: پیاو.

«**تفريج**»: یەعنی کەشف و لابردن و کردنەوە.

«**کرب**»: جەمعەکەی «کروب»ە و بە مەعنا حوزن و مەشەققەتە.

«**انظار**»: مولەتدان.

دەڵێ: ئەگەر ڕەئیس و گەورەم مالیك نەبوایە و یەکی‌دی بوایە ئەوە غەم و ناڕەحەتی و خەفەتی منی دەبرد، یان هیچ نەبێ چەند ڕۆژێك مۆڵەتی دەدام.

وَلٰكِنَّ مَوْلَايَ امْـرُءٌ هُـوَ خَـانِقِي　　عَلَى الشُّكْرِ وَالتَّسْآلِ أَوْ أَنَا مُفتَدِي

«**خانِق**»: خەفەکوننده، ڕێگای تەنگ و باریك.

«**تَسآل**»: پرسیار.

«**مفتد**»: تالبی ڕزگاربوون.

دەڵێ: بەڵام گەورەکەم ئەمنی خەفەکردووە، هەرچەند ئەمن تا ئێستا سپاسم کردووە. بەڵام ناچارم کە خۆم لە شەڕی وی ڕزگار بکەم.

وَ ظُلْمُ ذَوِي الْقُرْبىٰ أَشَدُّ مَضَاضَةً　　عَلَى الْمَرْءِ مِنْ وَقْعِ الْحُسَامِ الْمُهَنَّدِ

«**الحسام**»: شمشێری بڕندە.

«**مضاضة**»: سۆز و ژان و ناڕەحەتی.

«**وقع**»: برین و ئەسەر.

«**مهند**»: تیژ، یان دروستکراوی هیند.

دەڵێ: زوڵم و زۆری خزمان لەبرین و ئەسەری شیری بڕندە و شیری

هیندی سەختتر و دەردناکترە.

فَذَرْنِي وَ خُلْقِي إِنَّنِي لَكَ شَاكِرٌ وَ لَوْ حَلَّ بَيْتِي نَائِياً عِنْدَ ضَرْغَدِ

«نائی»: دوور.

«ضرغد»: ناوی کێوێکە.

دەڵێ: ئەمن حەواڵەی خوڵق و خووی خۆم بکە، چونکە ئەمن هەر سپاسگوزارم، ئەگەر چی ماڵیشم لە نزیك کێوی «ضرغد» بێ کە زۆریش دوورە.

فَلَوْشَاءَ رَبِّي كُنْتُ قَيْسَ بْنَ خَالِدٍ وَ لَوْ شَاءَ رَبِّي كُنْتُ عَمْرَو بْنَ مَرْثَدِ

«قەیس و عەمر»: لە پیاوەگەورە و سەروەرەکانی عەرەبن کە لە دەوڵەمەندی و نەجابەت و شەرەف و حەسەب و نەسەبدا مەشهوور بوون.

دەڵێ: ئەگەر خوا بیویستایە دەی‌بردمە ڕیزی قەدر و گەورەیی و شوهرەتی قەیسی کوڕی خالید و عەمری کوڕی مەرسەدی.

فَأَصْبَحْتُ ذَا مَالٍ كَثِيرٍ وَ زَارَنِي بَنُونَ كِرَامٌ سَادَةٌ لِمُسَوَّدِ

دەڵێ: ئەوکاتە دەبوومە خاوەنی سەروەتێکی زۆر و کوڕانی نەفس بەرز و گەورە و بوزرگەوار کە کوڕی پیاوان بوزورگەوار بوون دەهاتن بۆ دیدەنیم.

أَنَا الرَّجُلُ الضَّرْبُ الَّذِي تَعْرِفُونَـهُ   خَشَـاشٌ كَـرَأْسِ الْـحَيَّةِ الْـمُتَوَقِّدِ

«ضرب»: کەم گۆشت و کز و لاواز.

«خشاش»: بەو کەسە دەڵێن کە لە کارەکانیدا زۆر سەریع و جیدی بێ.

دەڵێ: ئەمن ئەو پیاوە سووك و کزەم کە دەمناسی، بەواسیتەی قەڵەویـیەوە قورس و تەنبەڵ نیم، وریا و چابوك و بیر تیژم، وەك سەری ماری هەڵسووڕاوم.

فَآلَيْتُ لَا يَنْفَكُّ كَشْحِي بِطَانَةً   لِعَضْبٍ رَقِيقِ الشَّفْرَتَيْنِ مُهَنَّدِ

«آلیت»: سوێندم خوارد.

«لاینفك»: دوور نەکەویتەوە، جیانەبووەتەوە.

«کشح»: تەنیشت.

«بطانة»: داوێن.

«عضب»: شیری تیژ.

«شفرتین»: دوو دەمی شەمشیر.

دەڵێ: سوێندم خواردووە کە تەنیشتم هەمیشە ئاستەری شیری بڕندەی دوو دەمی هیندی بێ و هەمیشە شیرێکی وام هەبێ.

حُسَامٍ إِذَا مَا قُـمْتُ مُـنْتَصِراً بِـهِ   كَفَى الْعَوْدَ مِنْهُ الْبَدْءُ لَيْسَ بِمِعْضَدِ

«منتصر»: تۆڵە ستێنەر.

«معضد»: بە شیری کول دەڵێن کە دارانی پێ لەت دەکەن لەبەر کولیانی.

دەڵێ: شیرەکەم ئەوەندە تیژە کە بۆ تۆڵەکردنەوە جارێك لە دوژمنی ڕاکێشم کاری خۆی دەکاو پێویست ناکا دووبارە لێی بدەمەوە، وەك شیری داربڕینەوە نییە.

أَخِي ثِقَةٍ لاَ يَنْثَنِي عَنْ ضَرِيبَةٍ        إِذَا قِيلَ مَهْلاً قَالَ حَاجِزُهُ قَدِي

**«أخي ثقة»**: برای ڕاست و جێگای باوەڕە.

**لا ينثني**: نا چەمێتەوە، نا نووشتێتەوە.

**«ضريبة»**: یەعنی بەسە.

**«حاجزه»**: دەمی شیر.

**«قدي»**: بەسە بۆ من.

دەڵێ: ئەو شیرە جێگای باوەڕە، لە هەر شتێکی بدەی کول نابێ و هەر کاتێ بڵێن بەسە، خاوەنەکەی دەڵێ: بەسە، چونکە بە یەکەم زەربەکاری خۆی دەکا و پێویست بە دووبارە لێدان ناکا.

إِذَا ابْتَدَرَ الْقَوْمُ السِّلاحَ وَجَدْتَنِي        مَنِيعاً إِذَا بَلَّتْ بِقَائِمِهِ يَدِي

**«ابتدر القوم»**: پێش دەستی بکەن.

**«منیع»**: سەرکەوتن.

**«بلت»**: زەفەر بەری و سەرکەوی.

**«قائم»**: قەبزەی شمشێر.

دەڵێ: کاتێ قەوم پێش دەستی بکەن و بە پەلە دەست بۆ ئەسڵەحە بەرن،

ئەمن هەر دەستم بگاتە قەبزەی شمشێر بە سەرکەوتوویيم دەبينی و ناشكێم.

وَ بَرْكٍ هُجُودٍ قَدْ أَثَارَتْ مَخَافَتِي بَوَادِيَهَا أَمْشِـي بِـعَضْبٍ مُـجَرَّدِ

«برك»: يەك دەستەی زۆر لە وشتران كە لەسەر زەوی نوستوون.

«هُجُود»: جەمعی «هاجد»، يەعنی نوستووە.

«مخافتي»: ترسی وان لە من.

«بوادي»: جەمعی «بادی»ە، يەعنی ئاشكرا بووەكان.

«عضب»: شيری تيژ.

«مُجَرَّد»: لە كالان هێندراوەتەدەر.

دەڵێ: ئای كە چەند دەستە وشتری نوستوو كـە لە تـرسـی مـن ئـەوانـەی پێشەوەيان لە خەو ڕاپەڕيون لەو كاتەيەدا كە بـە شـمشێری ڕووتـەوە بـەلايانداڕۆيشتووم؛ چونكە عادەتم گرتووە بە سەربڕين و كوشتنەوەيان.

فَمَرَّتْ كَهَاةٌ ذَاتُ خَيْفٍ جُلالَةٌ عَقِيلَةُ شَيْخٍ كَـالْوَبِيلِ يَـلَنْدَدِ

«كهاة و جلالة»: وشتری گەورە و قەڵەو.

«خيف»: چەرمی مەمكان و گوانانە.

«وبيل»: عەسايەكی گەورە.

«يلندد»: سەختگير و داخ لە دڵ.

دەڵێ: ڕابـرد وشـترێكـی گـەورە و قـەڵەوی گـوان گـەورە لە وشـترەكـانی پيرەمەردێكی پێست چرچی بەدەن زەعيف، وەك دار عەسايەكی ئـەستوور و قينی لە دڵدا. دەبـێ مـەبەستی بێـباوكـی بـێ كـە زۆر جـار وشـتری وی بـۆ

هاوڕێکانی سەر بڕیوە.

| يَقُولُ وَ قَدْ تَرَّ الْوَظِيفُ وَ ساقُها: | أَلَسْتَ تَرىٰ أَنْ قَدْ أَتَيْتَ بِمُؤْيَّدِ |
|---|---|

«ترّ»: کەوتەسەر عەرز.

«مؤْيد»: کاری گەورە موسیبەت.

دەڵێ: لەکاتێکدا کە دەست و پێی وشترەکە کەوتە سەر ئەرز ئەو پیرەمێردە گوتی: ئەتۆ نابینی تووشی چ موسیبەتێکت کردین. ئەو وشترە چاکەت کوشت.

| وَ قالَ أَلا ماذا تَرَوْنَ بِشارِبٍ | شَدِيدٍ عَلَيْنا بَغْيُهُ مُتَعَمِّدِ |
|---|---|

«ترون»: بیر و ڕادەرئەبڕن.

«بغی»: بێ دادی، زوڵم.

دەڵێ: ئەو پیرەمەردە گوتی: بە حازرییان لەگەڵ ئەو ئارەقخۆرە دەبێ چ بکەی؟ کە بە عەمدی ئەو زوڵمەی لەسەر ئێمە بەڕەوا زانی.

| وَ قالَ ذَرُوها إِنَّما نَفْعُها لَهُ | وَ إِلّا تَكُفُّوا قاصِيَ البَرْكِ يَزْدَدِ |
|---|---|

«ذر»: واتە لێی گەڕێ.

«قاصي»: دوورکەوتوو.

دەڵێ: ئەو پیاوە پیرە گوتی: ئەی خەڵکینە! لە تورفە گەڕێن، بەڕاستی قازانجی ئەو وشترە بۆ ئەوە، وە ئەگەر ئەو وشترانە کە دوورکەوتوونەتەوە لە وشترە

خەوتووەکان، نەیانهێننەوە، تورفە زۆریان لێ دەکوژێ.

فَظَلَّ الْإِمٰاءُ يَمْتَلِلْنَ حُوارَهٰا     وَ يُسْعىٰ عَلَيْنٰا بِالسَّدِيفِ المُسَرْهَدِ

«إماء»: جەمعی «امة» یەعنی کەنیزەکان.

«یمتَللنَ»: لە «ملة»ە و بە مەعنا خەڵووز و پەشکۆ و خۆڵەکە کەبابی لەسەر دەکەن.

«حوار»: بەچکە وشتر.

«سدیف»: تۆپەڵەی پشتی وشتر.

«مُسَرْهَد»: لەت لەت بووە.

دەڵێ: جارییەکان دەستیان کرد بە کەبابکردن لە گۆشتی ئەو بەچکەی کە لە زگیدا بوو لەسەر خەڵووز و پشکۆ و خۆڵەمێشی گەشاوە و لەگۆشتی پشتی وشترەکەشیان بۆ ئێمە کرد بە کەباب و ئەوی دیکەشیان بۆ خۆیان کرد.

فَإِنْ مُتُّ فَانْعَيْنِي بِمٰا أَنٰا أَهْلُهُ     وَ شُقِّي عَلَيَّ الْجَيْبَ يَا ابْنَةَ مَعْبَدِ

«نعي»: خەبەردانی مردنی کەسێك.

«اهل»: شایان وەك لە ئایەتی بیست و شەشی سوورەتی «فتح»دا دەفەرمووی؛ ﴿كٰانُوا أَحَقَّ بِهٰا وَ أَهْلَهٰا﴾ یەعنی شایان و سزادار.

«ابنة معبد»: کچی مەعبەدی برای.

دەڵێ: لەپاش ئەوەی ئەو شتانەی کە شانازی پێوە دەکردن هەمووی باسکردن وەسیەتی بۆ برازاکەی کرد و گوتی: کاتێ مردم زۆر بە باشی هەواڵی مردنەکەم بڵاو بکەوە. بەو جۆرە دەست بکە بە گریان و پێهەڵدا گوتن و ئێخە و

بە ڕۆك دادڕین و یاسای تازییەباریم بۆ دانێ.

وَ لا تَجْعَلِينِي كَامْرِئٍ لَـيْسَ هَـمُّهُ   كَهَمِّي وَ لا يُغْنِي غَنَائِي وَ مَشهَدِي

«هم»: لە ئەسڵدا بە مەعنا قەسرە و لێرەدا بە مەعنا داوای ئەو شتانە کە دەبنە هۆی فەخر پێ کردن.

«غنا»: کیفایەت و لیاقەت.

«مشهد»: حازر بوون بۆ کاری موهیم و موشکیل.

دەڵێ: ئەمن وەك پیاوێك حیساب مەکە توانا و لیاقەت و ئامادەگی بۆ کاری موهیم و حازر بوونی بۆ مەیدان جەنگ نەبێ. وەك مردنی کەسێکی وا سووك تازێە باریم بۆ دامەنێ.

بَطِيءٍ عَنِ الْجُلّىٰ سَرِيعٍ إِلَى الْخَنَا   ذَلُـولٍ بِأَجْـمَاعِ الرِّجَـالِ مُـلَهَّدِ

«بَطِيء»: لە کاراندا سست.

«جلی»: کاری گەورە و موهیم.

«خنا»: نالایق.

«ذلول»: ڕام و فەرمانبەر.

«أجماع»: بە فەتحەی هەمزەکەی جەمعی کەلیمەی «جمع»ە و بە مەعنا کەفە. بەبۆری جیمەکە و سکونی میمەکە بە مەعنا مستە.

«ملهد»: مست لێدان.

دەڵێ: ئەی کچی مەعبەدی برام! ئەمن لەگەڵ ئەو کەسە بەرامبەر مەکە کە

لە کاری گەورەدا سست بێ و لە جنێودان و کاری ناشیریندا بەپەلە بێ و لە بەرامبەر مستی پیاواندا خۆڕانەگر بێ و بە مستان دەری بکەن، یەعنی ئەو دەرکراو و زەلیل و ترسنۆك و ئەمن ئازاو ڕەشید.

فَلَوْ كُنْتُ وَغْلاً فِي الرِّجَالِ لَضَرَّنِي     عَدَاوَةُ ذِي الأَصْحَابِ وَالْمُتَوَحِّدِ

«وغل»: لە ئەسڵدا یەعنی زەعیف و دەنی، بەڵام لێرەدا بۆ مەعنای «لئیم» بەکار براوە.

دەڵێ: ئەگەر ئەمن کەسێکی نەناسراو و بێناو و بێتوانا بوومایە، ئەوە دوژمنی خاوەن دار و دەستە و نەفەرێکیش زەرەریان پێ دەگەیاندم، بەڵام لەبەر ناسراو و سەختی و بەتوانا بوونم لە دوژمنی هیچکەس باکم نەبووە و شکستم نەهێناوە.

وَلٰكِنْ نَفىٰ عَنِّي الرِّجَالَ جَرَاءَتِـي     عَلَيْهِم وَإِقْدَامِي وَصِدْقِي وَمَحْتِدِي

«جرأة و جَرَاءَة»: جەسارەت و بێباکی.

«محتد»: ئەسڵ و نەسەب.

دەڵێ: بەڵام شوجاعەت و ئیقدام و ڕاستی و ئەسڵ و نەسەبم خەڵکی لە پەلاماردانمدا دوور خستۆتەوە.

لَعَمْرُكَ مَا أَمْرِي عَـلَيَّ بِـغُمَّةٍ     نَهَارِي وَلَا لَيْلِي عَلَيَّ بِسَرْمَدِ

«غمة»: و غەم ـ یەك مەعنایان هەیە و لە ئەسڵدا «غەم» بە مەعنا داپۆشینە و لەبەر ئەوەیە هەورکە ئاسمانی داپۆشی دەڵێن: «غمامة» وکە دڵ و فکریش نارەحەت بوو دەڵێن غەمبارە.

«سرمد»: دایم.

دەڵێ: بە گیانی تۆ قەسەم لە ڕۆژدا بەهیچ کارەسات و بەسەرهاتێك ناخەجڵێم و بە شەویش کارەکانم وەدوا ناخەم تا شەوەکەم بەلاوە درێژ وەبێ. واتە لە حەوادیس و بەسەرهاتدا هەر لەسەرخۆ و ئارامم.

وَ یَوْمَ حَبَسْتُ النَّفْسَ عِنْدَ عِراكِها　　حِفاظاً عَلیٰ عَوْراتِـهِ وَ التَّـهَدُّدِ

دەڵێ: زۆر جاران لە مەیدانی شەڕدا خۆم ڕاگرتووە و شەڕم کردووە و ڕام نەکردووە لەبەر خاتری شەرافەت و نامووس و ئیفتیخاری گەلەکەم بۆ ئەوەی ئابڕووی نەچێ و دوژمن زەفەری پێ نەبا.

عَلیٰ مَوْطِنٍ یَخْشَی الْفَتیٰ عِندَهُ الرَّدیٰ　　مَتیٰ تَعْتَرِكْ فِیهِ الْفَرائِـصُ تَـرْعَدِ

«موطن»: جێگا.

«ردی»: هیلاك.

«اعتراك»: یەعنی زەد و خورد و شەڕ و هەرا.

«فرائص»: گۆشتی بەینی تەنیشت و شان کە لەکاتی ترسدا دەست دەکا بە لەرزین.

«ترعد»: دەلەرزی.

دەڵێ: لە چەندین شەڕی وادا موقاوەمە و پایەداریم کردووە کە جەنگ ئاوەری زۆر ئازا ترساوە بە هیلاك بچی و لەکاتی شەڕدا گۆشتی تەنیشت و شانانی دەستی کردووە بە لەرزین لە ترسان.

وَ أَصْفَرَ مَضْبُوحٍ نَـظَرْتُ حِـوٰارَهُ   عَلَى النّٰارِ وَ اسْتَوْدَعْتُهُ كَفَّ مُجْمِدِ

«اصفر»: ڕەنگ زەرد.

«مضبوح»: ئەوەی لەئاگری نزیك دەکەنەوە تا گەرمدا بێ.

«نظر»: بە مەعنا «انتظار» وەك لە ئایەتی سێزدەی سووڕەتی «حدید»دا دەفەرموێ؛ ﴿أُنْظُرُونٰا نَقْتَبِسْ مِنْ نُورِكُمْ﴾ ئێوە لامان لێ بکەنەوە تا ترووسکێك لە ڕووناکیتان وەرگرین.

«حوار»: لێرەدا مەعنای موڕاجەعەت دەگەیێنێ.

«مُجمِد»: ناکام.

دەڵێ: ئای کە تا ئێستا چەندین تیری زەرد کە خراونە ناو ئاگرەوە و چاوەڕوانی نەتیجەی بردنەوە و دۆڕاندی قوماری لێ کراوە. مەبەستی ئەوەیە دەڵێ: عادەتی پیاوی سەخی و گەورەکانی عەڕەب بۆ قازانجی بێنەوایان لە ئەسەری بێموبالاتییان بە ماڵی دنیا وەسائیلی قوماریان داوە بە پیاوێکی بەدشانس.

أَرَى الْمَوْتَ أَعْدٰادَ النُّفُوسِ وَ لٰا أَرىٰ   بَعِيداً غَداً أَقْرَبَ الْـيَوْمَ مِـنْ غَـدِ

«اعداد»: جەمعی «عِد»ە بە مەعنا ئاوی جاری وەك ئاوی سەر چاوە.

دەڵێ: ئەمن مەرگ وەك ئاوی جاری دەبینم کە هەموو کەس ناچارە بچێتە سەری و سبەینێ بە دوور نازانم و ئەورۆ تا سبەینێ چەند نزیکە.

واتە: سبەینێی ڕۆژی مەرگ لە ئێستاوە زۆر نزیکە، چونکە هەموو ڕۆژێك لەوانەیە ئینسان تێیدا بمرێ.

سَتُبْدِي لَكَ الْأَيَّامُ مٰا كُنْتَ جَاهِلاً   وَ يَأْتِيكَ بِالْأَخْبٰارِ مَنْ لَمْ تُـزَوِّدِ

«ستبدی»: لێرە بەدواوە ئاشکرای دەکا.

«تُزَوِّد»: لە ئەسڵدا «تُزَوِدهُ» بووە، زەمیرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ «مَـنْ» و لە «زاد»ی بە مەعنا توێشووە.

دەڵێ: بەو زوانە ڕۆژگار ئاگادارت دەکاتەوە لەو شتانەی کە نەتزانیون و لێیان غافڵ بووی، واتە خود بە خود عاقیبەت و غەفڵەتی دەورانی عومری خۆت دەزانی و مرووری زەمان هەموو ئەسرار و ئەخبارێك ئاشکرا دەکا.

وَ يَأْتِيكَ بِالْأَخْبٰارِ مَنْ لَمْ تَبِعْ لَهُ   بَتٰاتاً وَ لَمْ تَضْرِبْ لَهُ وَقْتَ مَوْعِدِ

«تبع»: بە مەعنا کڕین هاتووە وەك لەو شیعرەدا.

«بتاتاً»: لێرەدا بە مەعنا توێشوو و وەسائیلی سەفەرە.

«تضرِب»: لە «ضرب»ە و بە مەعنا تەعیین و بەیانە، وەك لە ئایەتی بیست و

چواری سوورەتی ئیبراهیمدا دەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ اللّٰهُ مَثَلاً﴾: یەعنی میسالی هێنایەوە و بەیانی فەرموو.

دەڵێ: کەسێك خەبەرت بۆ دێنێ کە توێشوو و وەسائیلی سەفەرت بۆ نەکڕیوە و کات و وەختێکت بۆ دیاری نەکردووە.

## موعەللەقەی سێیەم

«مُعَلَّقه»ی سێیەم هی زوهەیری کوڕی ئەبی سولمایە و لە بەرواری «٥٣٠ - ٦٢٧ ز»، لە تیرەی «مەزینە» و لە قەبیلەی «مضر» و لە نەجدی حیجاز هاتۆتە دنیاوە و دایکی «غەتافانی» بووە. لەو ڕووەوە لەلای پیاوێکی عاقڵ و دەوڵەمەند بە ناوی «شامە»ی شاعیر کە خاڵی باوکی بووە وەك شاگرد خەریکی فێربوونی شیعرگوتن و حیکمەت بووە و لەپاشان لەلای «ئەوسی کوڕی حەجە» کە پێشەوای مەدرەسەی شیعری ئەوسی بووە ڕێبازی شیعرگوتنی ئەوی گرتۆتەبەر.

«زوهەیر» لە عەسری جاهیلییەت بە عینوانی پیاوێکی گەورە و دەوڵەمەند و لەسەرخۆ و وازیح ناوبانگی دەرکردبوو، تەواوی تەمەنی خۆی لە دڵسۆزی و پەند و ئامۆژگاری و حەقگۆیی و خێرومەندی و دیانەتدا گوزەراندووە و لە شیعرەکانیدا مەعانی حیکمەتی زۆرن، بۆیە ناسراوە بە شاعیری حەکیم.

«معلقه»کەی لە بەحری تەویل و قافیەی میم و شێست و دوو شیعرە و بەزمان لاتینی و فەرانسەوی و ئینگلیسی تەرجەمە کراوە. هۆی دانانیشی کۆتای هاتنی شەڕی بەینی تائیفەی «عبس» و «ذبیان» بووە کە لە مەدحی ئەو کەسانەدا دایناوە کە بوونە هۆی سوڵح و ئاشتی و دۆستی و دەست هەڵگرتن لە شەڕ و کوشتار. زوهەیر ئەو کەسەیە کە قەسیدەی بەئاخر دەرەجە گەیاندووە.

| أَمِنْ أُمِّ أَوْفىٰ دِمْنَةٌ لَمْ تَكَلَّمِ | بِحَوْمٰانَةِ الدَّرّٰاجِ فَـالْمُتَثَلَّمِ |
|---|---|

«ام اوفی»: نازناوی خۆشەویستەکەیەتی.

«دمنة»: چەند مەعنای هەیە، بەڵام لێرەدا بە مەعنا ئاساری ڕەش بوونەوەی مەنزڵە.

«لم تکلم»: ئەسڵەکەی تتکلم بووە.

«حومانةالدراج» و «متثلم»: ناوی دوو جێگان.

دەڵێ: ئایا لە مـەنزڵەکـانی یـاری عـەزیزم «أم أوفـی» لەو دوو جـێگـایەدا ئاسارێك باقی ماوە؟ کە بە زمانی حاڵ قسە بکا؟. مەبەستی ئەوەیە کە بەهۆی دووری وەخت و گۆڕانی ئەو ئاسارانـەوە بـە یـەقین نـایان نـاسێتـەوە و یـادی ناکەونەوە. کەواتە وەك بڵێی بەڕاستی ئاساریان نەماوە.

| وَ دٰارٌ لَـهٰا بِـالرَّقْمَتَيْنِ كَأَنَّـهٰا | مَراجِيعُ وَشْمٍ فِي نَوٰاشِرِ مِعْصَمِ |
|---|---|

«دار»: خانوو.

«رقمتان»: دوو جێگا کە بەردەکانیان وەك سووتـابن ئـەوەنـدە ڕەشـن، کـە یەکیان لە نزیك «بەسرە»یە و ئەوی دیکەیان لە نزیك «مەدینە»یە. مەبەستی دوو مەنزڵ لەو دوو جێگایەیە، چونکە دوو مەنزڵ لە جێگایەکدا نابێ.

«کَأَنَها»: لە ئەسڵدا «کَأَن رسومها» بووە.

«مراجیع»: دووبارە بۆوە.

«وَشم»: کوترانی خاڵ.

«نواشر معصم»: ڕەگی جمگەی دەست.

دەڵێ: لە هەریەك لەو دوو جێگایە مەنزڵێکی هەیە، کە ئاسارەکەیان دەڵێی کوترانی دووبارەی خاڵی جمگەی دەستە، واتە هەر وەك خاڵی کوتراوی کۆن دووبارە تازە دەکەنەوە، ئاساری ئەو دوو مەنزڵەش ون بووە و داپۆشراوە و دووبارە بە هۆی باو و سێلاو و کەش و هەواوە ئاشکرا و تازە دەبنەوە و دەردەکەونەوە.

**بِهَا الْعِيْنُ وَ الْأَرْآمُ يَمْشِينَ خِلْفَةً وَ أَطْلاؤُها يَنْهَضْنَ مِنْ كُلِّ مَجْثِمِ**

«**بهاالعين**»: لەو مەنزڵانەدا گاکێوی چاو زل هەن.

«**خلفة**»: دەستە لە دوای دەستە دەڕۆن.

«**اطلاء**»: جەمعی «طلا»، یەعنی بەچکەی ئاسك و گای کێوی لە کاتی لەدایکبوونیان تایەك دوو مانگ.

«**مجثم**»: جێگای دانیشتن.

دەڵێ: لەو مەنزڵانە گاکێوی چاو زل و ئاسکی ڕەنگ سپی خالیس دەستە بە دەستە لەدوای یەکتر دەڕۆن و بەچکە شیرەخۆرەکانیان لە جێ خەوەکانیان هەڵدەستن و وەڕێ دەکەون.

**وَقَفْتُ بِهَا مِنْ بَعْدِ عِشْرِينَ حِجَّةً فَلَأْياً عَرَفْتُ الدَّارَ بَعْدَ تَوَهُّمِ**

«**حِجة**» بە کەسرەی «حا» بە مەعنا ساڵە.

«**لأي**»: زەحمەت.

«**توهم**»: گومان.

دەڵێ: لەپاش بیست ساڵ دووری لە مەنزڵی یار ڕاوەستاوم و بە بیرکردنەوە و زەحمەتێکی زۆر تا ناسیمەوە، لەبەر ئەوەی درێژی زەمانە ئاسارەکانی لەبەین بردبوو.

أَثافِيَّ سُفْعاً فِي مُعَرَّسِ مِرْجَلِ وَ نُؤْياً كَجِذْمِ الْحَوْضِ لَمْ يَتَثَلَّمِ

«أَثافي»: ئەو بەردانەی کە دیزەیان وەسەر دەنێن بۆ کوڵاندن.

«سُفع»: یەعنی سەر ئاورەی سێ کوچکە، بە شتێك ئەڵێن کە ئاگر ڕەشی کردبێتەوە.

«معرس»: جێگای وەسەر نانی دیزە.

«مرجل»: مەنجەڵ.

«نؤی»: جۆگەلە ئاو کە لە دەوری چادر و ڕەشماڵ دەیکەنن بۆ ئەوەی ئاو نەچێتە ماڵەوە.

«جذم»: ئەسڵ.

«لم یتثلم»: خەراب نەبووە.

دەڵێ: ئەو سێ بەردە ڕەشەم ناسینەوە کە کاتی خۆی دیزەی وەسەر دەنان و جۆگەلە هەڵکەندراوەکانی ئاو کە وەك خۆیان مابوونەوە و وەك ئەسڵ و ئەساسی حەوزێك دەچوون.

فَلَمّا عَـرَفْتُ الدّارَ قُـلْتُ لِـرَبْعِها أَلا أَنْعِمْ صَباحاً أَيُّها الرَّبْعُ وَ اسْلَمِ

ربع: مەنزڵ.

عادەتی عەرەبەکان وا بووە لەکاتی ئەحواڵپرسیدا گوتوویانە: «انعم صباحاً» واتە: ڕۆژ و بەیانیت باش. بەتایبەتی بەیانیان گوتوویانە، چونکە بە زۆری لەکاتی بەیانیدا بەسەر یەکتریاندا داوە و ئەووەڵی ژیانی ڕۆژانەیە.

دەڵێ: کاتێ ماڵ و مەنزڵم ناسییەوە بە مەنزڵەکەم گوت: ڕۆژ باش ئەی مەنزڵ و سەلامەت بی.

تَبَصَّرْ خَلِيلِي هَلْ تَرىٰ مِنْ ظَعَائِنٍ     تَحَمَّلْنَ بَالْعَلْيَاءِ مِنْ فَوْقِ جُرْثُمِ

**«ظعائن»** جەمعی «ظعینة» واتە ژنی کۆچکردوو.

**«علیاء»**: شوێنێکی بەرز.

**«جرثم»**: ناوی کانیاوێکە.

دەڵێ: بە دۆستەکەم گوت: بڕوانە داخۆ ئەو ژنە کۆچکردوانە دەبینی کە لە کەژاواندا و لەو جێگا بەرزە بەلای ئاوی جورسوومدا دەڕۆن؟. شاعیر لە شیددەتی شەوقی یار و دیارەکەی وەزعی بیست ساڵ لەمەوپێشی لە زیهن و خەیاڵ و ڕۆحی خۆیدا هێناوەتەوە بەر چاو و نائاگاهانە ئاوا قسە لەگەڵ هاوڕێکەی دەکا. دەنا چۆن دەبێ بەسەرهاتی ڕابردوو ئاوا ببینێ؟.

جَعَلْنَ الْقَنَانَ عَنْ يَمِينٍ وَ حَزْنَهُ     وَكَمْ بِالْقَنَانِ مِنْ مُحِلٍّ وَ مُحْرِمِ

**«جعلن»**: زەمیرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ «ظعائن».

**«القنان»**: کێویکە لە خاکی بەنی ئەسەد.

**«حزن»**: زەوی دەشت و سەخت.

**«محل و محرم»**: ئیحرام بەستوو و بێ ئیحرام، دوست و دوژمن.

دەڵێ: ئەو ژنە کەژاوە نشینانە کێوی قەنان و ئەو زەمینە دەشت و سەختە کەوتە لای ڕاستیان و ڕابردن. وە تا ئێستا چەندین عاشقی جۆراو جۆر بەو جێگایەدا ڕۆیشتوون. لەبەر ئەوەی گوزەرگای ژنان بووە لەوێدا خۆیان مەلاس داوە و بەسەریان بردووە.

یان مەعنای وایە دەڵێ: تا ئێستا چەندین دوژمن کە کوشتنیان بۆ ئێمە حەلاڵ بووە و چەندین دۆست کە کوشتنیان حەرام بووە لەو کێوەدا نیشتەجێ بوون.

---

عَلَوْنَ بأَنْماطٍ عِـتَاقٍ وَكِـلَّةٍ وِرادٍ حَواشِيها مُشاكِهَةِ الدَّمِ

---

**«بأنماط»**: «بێ» کە حەرفی تەقدیمە و «انماط» جەمعی «نمط»ە و بە مەعنا لبادە کە لە خوری دروست دەکرێ و بەسەر کەژاوەیدا دەدەن.

**«عتاق»**: جەمعی «عتیق» و بە مەعنا قیمەتی و بەنرخ.

**«کلة»**: پەردەی ناسك.

**«وراد»**: سوور و مایل بە زەردی.

**«مشاکهة»**: وەك، وێنەی.

**«دم»**: ڕۆنیاس، گیایەکە کە بۆ ڕەنگکردن بەکار دێ.

دەڵێ: سەر و ڕووی کەژاوەکانیان بە لبادی خوری بەنرخ و پەردەی ناسك داپۆشی بوو کە قەراخەکانی وەك خوێن و وەك ڕۆنیاس سوور بوو.

وَ وَرَّكْنَ فِي السُّوبانِ يَعْلُونَ مَتْنَهُ      عَلَيْهِنَّ دَلُّ النَّاعِمِ الْمُتَنَعِّمِ

«وركن»: لە «ورك»ە و بە مەعنا سەرین، یا ڕانە. واتە: سواری وەڵاغەکان بوون.

«السوبان»: عەرزی بڵند.

«متن»: پشت.

«دلّ»: ناز و عیشوە.

دەڵێ: کاتێ گەیشتنە سەر «السوبان» و سواری وشترەکان بوون و ناز و عیشوە و خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندییان بە سەر و سیماوە دیار بوو.

بَكَرْنَ بُكُوراً وَ اَسْتَحَرْنَ بِسُحْرَةٍ      فَهُنَّ وَ وَادِي الرَّسِّ كَالْيَدِ لِلْفَمِ

«بکر و بکور»: ئەووەڵی ڕۆژ.

«سحر و سحرة»: بەری بەیانی.

«وادی الرس»: ناوی جێگایەك.

دەڵێ: لە ئەووەڵی ڕۆژ و بەری بەیاندا بە نیازی «وادی الرس» کەوتنە ڕێگا و یەکسەرە بۆ لای وێ چون، وەك دەستێك کە بۆ دەمی بەری و بەولاوەتری نەبەن.

وَ فِيهنَّ مَلْهىً لِلَّطِيفِ وَ مَنْظَرِ      أَنِيقٌ لِعَيْنِ النَّاظِرِ الْمُتَوَسِّمِ

«مَلْهیً»: شوێنی یاری و لەهو لەعب.

«لطیف»: زەریف و خۆش تەبع.

«انيق»: عەجایب و جوان.

«متوسم»: وشیار، وەك لە ئایەتی حەفتاو پێنجی سوورەتی «حیجر»دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ﴾ واتە: بەڕاستی لەم ڕوداوەدا زۆر بەڵگە هەن بۆ ئەوانەی کە وشیارن.

دەڵێ: لە وەزعی لیباس و ئەوزاعیاندا سەرگەرمی لەززەت بوو بۆ ئینسانی خۆش تەبع و نوکتەباز و دیمەنێکی جوان و دڵڕفێن بوو بۆ پیاوی زرینگ و وریا.

كَأَنَّ فُتَاتَ الْعِهْنِ فِي كُلِّ مَنْزِلٍ  نَزَلْنَ بِهِ حَبُّ الْفَنَا، لَمْ يُحَطَّمِ

«فُتات»: وردەی هەر شتێك.

«عهن»: خوری ڕەنگ کراو.

«فنا»: ترێ ڕێویلکە.

«لم يحطم»: نەشکابێ.

دەڵێ: وردەی خوری ڕەنگ کراو لە هەر مەنزڵێکدا کە لێی دابەزی بن، وەك دەنکە ترێ ڕێویلکە نەشکاو لەسەر عەرز کەوتبوون.

فَلَمَّا وَرَدْنَ الْمَاءَ زُرْقاً جِمَامُهُ  وَضَعْنَ عِصِيَّ الْحَاضِرِ الْمُتَخَيِّمِ

«زرق»: جەمعی «ازرق»ە واتە شین و ساف.

«جمام»: ئەو ئاوەی کە لە چاڵاو و حەوزدا کۆ دەبێتەوە.

«عصى»: دار عەسای دەست.

«متخيم»: ئەو کەسەی کە چادر و خێوەت هەڵدەدا.

دەڵێ: کاتێ گەیشتنە سەر ئاوەکە، ئەو ئاوەی لە چاڵاو و حەوزەکاندا کۆ ببۆوە، زۆر ساف و سارد و خۆش بوو. عەسای سەفەریان فڕێدا وەك ئەو کەسەی خێوەت هەڵدەدا و واز لە سەفەر دێنی.

ظَهَرْنَ مِنَ السُّوبانِ ثُمَّ جَزَعْنَهُ     عَلىٰ کُلِّ قَیْنِيٍّ قَشِیبٍ وَ مُفْأَمِ

«جزع»: یەعنی لەوێ تێپەڕین.

«قین»: ئاسنگەر.

«قشیب»: تازە.

«مفأم»: گوشاد.

دەڵێ: لە «سوبان» سەرکەوتن و دووبارە پێیدا ڕۆیشتن، چونکە لەسەر ڕێگایان بوو، لە کاتێکدا کە هەموو ئەسبابی سەفەرەکەیان تازە بوو.

فَأَقْسَمْتُ بِالْبَیْتِ الَّذِي طافَ حَوْلَهُ     رِجالٌ بَنَوْهُ مِنْ قُرَیْشٍ وَ جُرْهُمِ

«قریش»: ناوی کوڕی «نَضر»ی کوڕی کەنانە بووە و تائیفەی مەشهووری قوڕەیشی ئەولادی ئەون.

«جرهم»: تائیفەیەکی قەدیم بووە کە حەزرەتی ئیسماعیل ژنی لێ هێناون و لەپاش وەفاتی و بێ دەسەڵاتی ئەولادەکانی ئیدارەی کعبە و حەرەمیان بە دەستەوە گرتووە و لە پاش ئەوانیش کەوتۆتە دەست تائیفەی خوزاعە و ئاخری سەرپەرستی کەعبە و حەرەم گەڕاوەتەوە بۆ قوڕەیشییەکان.

دەڵێ: قەسەم بە خانەی «کەعبە» کە تەوافیان بە دەورەدا کرد ئەو کەسانەی کە دروستیان کرد لە قورەیشی و جورهومی.

یَمِیناً لَنِعْمَ السَّیِّدٰانِ وُجِدْتُمٰا عَلیٰ کُلِّ حٰالٍ مِنْ سَحِیلٍ وَ مُبْرَمِ

«یمیناً»: مەفعوولی موتڵەقە بۆ «اقسمت» لە شیعری پێشەوەدا.

«السیدان»: مەبەستی پێ هەرەمی کوڕی سەنان و حاریسی کوڕی عەوفە، کە بوونە هۆی ئاشتی لە بەینی دوو تائیفەی «عەبس» و «ذەبیان»دا و خوێنی کوژەراوەکانیان بەپیاوەتی خستە سەر ئەستۆی خۆیان.

«سحیل»: پەتی زەعیف.

«مبرم»: دوو جار چندراوە، مەبەست قەوییە.

دەڵێ: بە تەئکید سوێندم خوارد کە ئێوە دوو کەسی گەورە و سەروەرن، لە حاڵی دەسەڵات و بێدەسەڵاتیدا خاوەنی کەرامەت و شەرەفن و لە ناخۆشی و ئاسایشدا پشت و پەنای خەڵك بوون و فریای خەڵك دەکەون.

تَدٰارَکْتُمٰا عَبْساً وَ ذُبْیٰانَ بَعْدَ مٰا تَفٰانُوا وَ دَقُّوا بَیْنَهُمْ عِطْرَ مَنْشِمِ

«تدارك»: فریا.

«تفانوا»: یەکتریان لەبەین برد.

«منشم»: ناوی ژنێکی عەترفرۆش بووە، شوشەیەکیان لێ کڕیوە و قامکیان تێناوە و سوێندیان خواردووە کە تا دەکوژرێن شەڕ بکەن.

دەڵێ: ئێوە فریای تائیفەی «عەبس» و «زوبیان» کەوتن لە دوا ئەوەی کە شەڕ زۆربەی پیاوەکانی لەبەین بردن کە سوێندیان خواردبوو تا دەکوژرێن شەڕ بکەن. جا عەتری ئەو ژنانەیان بە فاڵی بەد و شووم لە قەڵەم داوە و بۆتە زەربولمەسەل.

**وَ قَدْ قُلْتُمٰا: إِنْ نُدْرِكِ السِّلْمَ وٰاسِعاً    بِمٰالٍ وَ مَعْرُوفٍ مِنَ الْقَوْلِ نَسْلَمِ**

«سلم»: سوڵح.

«ندرك و سلم»: دوو فیعلی شەرتن و جەزان بۆ «إن» و مەجزووم بە سکوون بوون و لەبەر وەزنی شیعر مەکسوور کراون.

دەڵێ: بەڕاستی و دروستی گوتتان: ئەگەر سوڵح و ئاشتی بە خەرجکردنی ماڵی دنیا و چاکە و ئامۆژگاری بەرقەرار بکەین ئەوە لە کوشتار و نابوودی خێڵەکان بەدوور دەبین.

**فَأَصْبَحْتُمٰا مِنْهٰا عَلىٰ خَيْرِ مَوْطِنٍ    بَعِيدَيْنِ فِيهٰا مِنْ عُقُوقٍ وَ مَأْثَمِ**

زەمیری «مِنها» ڕاجیعە وەلای «أسلم» لە شیعری پێشودا.

«عقوق»: بێئەمری و گوناحبارییە. وەك لە حەدیسی شەریفدا هاتووە کە دەفەرموێ؛ «لٰا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عٰاقٌ لِأَبَوَيْهِ»، یەعنی: ئەولادێك کە دڵی دایك و بابی بێشێنی ناچیتە بەهەشت.

«مأثم»: گوناح.

دەڵێ: بەهۆی ئەو سوڵح و سەفا و ئاشتییەوە پیاوەتییان نیشاندا و لە خەراپە

لەگەڵ خزمان خۆتان بە دوور گرت بۆ ئەوەی دڵی دۆستێك بێشێنن، یان زوڵم لە کەس بکەن.

عَظِيمَيْنِ فِي عُـلْيَا مَـعَدٍّ هُـدِيتُمَا    وَمَنْ يَسْتَبِحْ كَنْزاً مِنَ الْفَخْرِ يَعْظُمِ

«عظیمین»: حاڵە لە زەمیری «أَصبَحتُما».

«علیا»: بڵند.

«معد»: ناوی یەکێك لە باپیرەکانی قورەیشە.

«هدیتما»: جوملەیێکی دوعائییەیە.

«استباحه»: موباحکردن.

دەڵێ: سوڵح و ئاشتیو بەرقەرارکرد لە حاڵی بوزورگەواریدا و خواگەورەترین دەرەجەی شەرەف و نەسەبی «معد»ی کوڕی عەدنانتان بەنسیب کاو هەر کەسێك گەنج و خەزنەیەکی بوزورگەواری هەبێ بیدا بە خەڵك، لای خەڵك گەورەتر و خۆشەویستتر دەبێ.

تُعَفَّى الْكُلُومُ بِالْمِئِينَ فَأَصْبَحَتْ    يُنَجِّمُهَا مَنْ لَيْسَ فِيهَا بِـمُجْرِمِ

«تعفی»: لە «تَعفِيَة»ە و ئەویش لە «عفو» بە مەعنا لابردن.

«کلوم»: جەمعی «کلم»ە بە مەعنا برین.

«مئین»: یەعنی سەتان.

«ینجم»: لە «نجوم»ە و بە مەعنا بەشە.

دەڵێ: برینی دڵی خاوەن کوژراوەکان، یان ئی کوژراوەکان بە سەتان وشتر سارێژ دەکرێ و ئەو وشترانەش کەسێك بەقیست دەیاندا کە هیچ جورم و خەتاییێکی نەکردووە.

واتە ئێوە لەگەڵ ئەوەی لە شەڕ و کوشتار دوور بوون تاوانەکەو خستە سەر شانی خۆتان و بۆ بەرقەراری سوڵح و سەفا و ئاشتی لە ماڵی خۆتان خوێنی کوژراوەکان وەك عورف و عادەتی نێو عەرەبانە بە بەش بەشی دیاریکراو دەدەن.

---

یُنَجِّمُهَا قَوْمٌ لِقَوْمٍ غَرَامَةً وَ لَمْ یُهْرِیقُوا بَیْنَهُمْ مِلْأَ مِحْجَمِ

---

«اراق»: لە «ریقه»ە و بە مەعنا ڕژتن.

«محجم»: شاخی کەڵە شاخگرتن.

دەڵێ: کەسانێك ئەو وشترانە لە تۆڵەی جینایەتدا دەدەن کە بە قەدەر پڕکردنی شاخی کەڵەشاخگرتن خوێنیان نەڕژتووە.

---

فَأَصْبَحَ یَجْرِي فِیْهِمْ مِنْ تِلَادِکُمْ مَغَانِمُ شَتَّی مِنْ إِفَالٍ مُزَنَّمِ

---

«تلاد»: ماڵی قەدیمی میراتی.

«مغانم»: جەمعی «مغنم»ە بە مەعنا تاڵان.

«شتی»: جەمعی «شتیت»ە بە مەعنا بڵاو.

«إفال»: جەمعی «افیل» واتە وشتری کەم ساڵ و جوان.

«مزنم»: ئەو نەختە پێستەیە کە لە گوێی وشتر، یان مەڕ دەی بڕن و هەڵی دەواسن.

دەڵێ: لەنێو واندا لە ماڵی میراتی ئێوە تاڵانی پەرت و بڵاو لە وشتری جوانی نیشانەدار کەوتە حەرەکەوە، یەعنی وشتری گرانبەها و ئەسیلتان دا بە واریسی کوژراوەکان و ئەو ماڵەو بە خۆڕایی وەك تاڵان لە بەینیاندا دابەشکرد.

أَلا أَبْلِغِ الْأَحْلافَ عَنِّي رِسالَةً وَ ذُبيانَ هَلْ أَقْسَمْتُمْ كُلَّ مُقْسَمِ

«أحلاف»: جەمعی حلیف. یەعنی دراوسێو، هاوسوێندو دۆست.

«هل»: بە مەعنا «قد»ە وەك لە ئایەتی سوورەتی «دهر»دا دەفەرمووی: ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسانِ﴾ کە بە مەعنا «قد أتی»یە.

«مقسم»: مەسدەرەی میمیە و بە مەعنا سوێندخواردنە.

دەڵێ: ئاگادار بە پەیامی من بە تائیفەی «ذبیان» و هاوپەیمانەکانیان ڕابگەیێنە ئێوە کە سوێندتان خوارد کە لە سوڵحدا بەردەوام بن. ئەی بۆچی سوێند خواردنەکەتان شکاند و عەمەلتان پێ نەکرد؟

فَلا تَكْتُمُنَّ اللّهَ ما فِي نُفُوسِكُمْ لِيَخفىٰ وَ مَهْما يُكْتَمِ اللّهُ يَعْلَمِ

«تكتُمَنَّ»: بە زەمەی میمەکە لە ئەسڵدا «تَكتُمُون» بووە و لە دوا پێوەلکاندنی نوونی تەئکیدی سەقیلە نوونی ئیعراب لەبەر جەزمە و واوی زەمیری لەبەر ئیلتیقائولساکنەین قوت کراوە.

دەڵێ: ئەوەی کە لە دڵتاندایە لە غەدر و پەیمانشکاندن لە خوای مەشارنەوە و وا بزانن کە خوا ئاگای لێ نییە، خوا ئاگای لە هەموو شتێك هەیە.

يُؤَخَّرْ فَيُوضَعْ فِي كِتَابٍ فَيُدَّخَرْ لِيَوْمِ الْحِسَابِ أَوْ يُعَجَّلْ فَـيُنْقَمِ

زاهیرەن جەزمەی هەر پێنج فیعلە موزاریعەکە لەو شیعرەدا بە هۆی جەزای فیعلی ئەووەڵ و عەتفی ئەوانی دی بۆ سەر وی بۆ شەرتی مەحزووف بێ، وەك: «مَهْمَا يَكُنْ ذَنْبٌ» واتە: هەر گوناحێك بکرێ.

دەڵێ: هەر گوناحێك و کردەوەیەکی موخالیف کە ئینسان دەیکا لە نامەی عەمەلێدا دەنووسرێ و هەڵدەگیرێ، یان هەر لەدنیا تۆڵەی لێدەکرێتەوە، واتە عیقابی گوناح حەتمی و قەتعییە لە دوارۆژدا، یان لە دنیادا.

وَ مَا الْحَرْبُ إِلَّا مَا عَلِمْتُمْ وَ ذُقْتُمْ وَ مَا هُوَ عَنْهَا بِالْحَدِيثِ الْمُرَجَّمِ

لە «عَلِم و ذاق»دا مەفعوولو بیهی ڕاجیع بە «ما»ی مەوسولەی حەزفکراوە و مەبەست لە «ذوق» لێرەدا تاقیکردنەوە و تەجرەبەیە، چونکە چێشتن لە شەڕدا نییە.

«مرجم»: لە ڕەجمە و بە مەعنا لە ڕووی گومانەوە قسەکردنە.

دەڵێ: شەڕ ئەوەیە کە زانیت و تەجرەبەت کرد، سەرنویشتی شەڕ قسەیێك نییە لە ڕووی گومانەوە بێت، بە چاوی خۆت عـاقیبەت و نـەتیجەی شـوومی شەڕت دی و تاڵی و ناخۆشی ئەوت چێشت و کێشات.

مَتَىٰ تَبْعَثُوهَا تَبْعَثُوهَا ذَمِـيمَةً وَ تَضْرَ إِذَا ضَرَّيْتُمُوهَا فَتَضْرَمِ

«بعث»: یەعنی هەڵایساندن.

«ذمیمه»: هەڵگیرساندن.

«تضریة»: واتە تەشویق و هەڵنانی سەگ بۆ گرتنی نێچیر.

«ضرم»: هەڵکردنی ئاور.

دەڵێ: هەر کاتێك شەڕ هەڵایسێنی لۆمەی تۆ دەکرێ، واتە شەڕ دایمە ئامادەی هەڵگیرساندنە و کاتێ ئاگرەکەی داگیرسا زۆر بە زەحمەت و درەنگ خامۆش دەکرێتەوە، کەواتە قەت سوڵح و سەفاو ئاشتی لەدەست مەدەن.

---

فتَعْرُکُکُمْ عَرْكَ الرَّحیٰ بِثِفالِهٰا وَ تَلْقَحْ کِشافاً ثُمَّ تُنْتَجْ فَتُتْئِمِ

---

بەهۆی عەتف بۆ سەر «تضرم» لە شیعری پێشەوەدا هەر چوار فیعلەکە مەجزوومن.

«بثفال»: دەستهاڕ. «با»کەی بە مەعنا مەعەیە، واتە لەگەڵ.

«تلقح»: ئاوس دەبێ.

«کشاف»: زایینی مەڕ ساڵێ دوو جار.

«تنتج»: واتە دەزێ.

«تتئم»: جوتیلە و دوقلو.

دەڵێ: وەك ئاش وردتان دەکاو دەتانهاڕێ و دوو جار ئاوس دەبێ و بە جوتیلە دەزێ.

یەعنی لە وەگەڕخستنی ئاشی شەڕدا خەڵك وەك دانەوێڵە ورد و نابووت دەبن و ئاساری شوومی شەڕ زۆر زۆرە.

فَتُنْتِجْ لَكُمْ غِلْمانَ أَشْأَمَ كُلُّهُمْ ‌ ‌ ‌ ‌ كَأَحْمَرِ عادٍ، ثُمَّ تُرْضِعْ فَتَفْطِمِ

**«غلمان»**: جەمعی «غلام»ە و بە مەعنا کوڕ.

**«أشأم»**: شوومتر.

**«احمر عاد»**: «دروست ئەحمەری سەموودە، واتە قیداری کوڕی سالف کە وشترەکەی حەزرەتی ساڵح پێغەمبەری سەر بڕی».

دەڵێ: ئەو کوڕانەی کە لەپاش شەڕ دەتان بن هەموویان لەو پیاوە ڕەنگ سوورەی قەومی سەموود شوومتر دەبن. مەبەستی پێ ئەوەیە بە واسیتەی ڕق و کینە و خووڕەوشتی شەڕەوە ئەو کوڕانەی دەوبن وەك کوشندەی وشترەکەی ساڵح پێغەمبەر کە لە هەموانیان خەراپتر بوو، لەو شوومتر و خەراپتر دەبن. چونکە خووڕەوشتی شەڕ و خوێنڕێژی لە ئێوەرا بە میرات دەبەن.

فَتُغْلِلْ لَكُمْ ما لا تُـغِلُّ لِأَهْـلِها ‌ ‌ ‌ ‌ قُرىً بِالْعِراقِ مِنْ قَفِيزٍ وَ دِرْهَمِ

**«تغلل»**: یەعنی لێی پەیدا دەبێ.

**«قفیز»**: عەیارێکە و لە زەویشدا ١٤٤ گەزە.

دەڵێ: شەڕ بۆ ئێوە بەرهەم و حاسڵاتێکی لێ پەیدا دەبێ کە دێهاتی عێراقی بە پێوانە و پارە نایدەن بە خەڵکی عێراقێ.

واتە لەباتی پووڵ و گەنم و قازانجی وەڵاتانی دیکە ئێوە لە شەڕدا عاقیبەتێکی خەراب و زەرەرێکی زۆر دەبینن.

لَعَمْرِي لَنِعْمَ الْحَيُّ جَرَّ عَلَيْهِمُ ... بِمَا لا يُؤَاتِيهِمْ حُصَيْنُ بْنُ ضَمْضَمِ

«جر»: لە «جريرة»ە و بە مەعنا جینایەت.

«مواتاة» موافەقەت.

«حُصَين بن ضمضم»: یەکێك بوو لە سەردارانی تائیفەی «ذبیان»، لەبەر ئەوەی کە «وەردی» کوڕی «حابس» لە خێڵی «عەبس» براکەی کوشتبوو، لە پەیمانی سوڵحدا بەشداری نەکرد، لەبەر ئەوەی بڕیاری دابوو کە یان قاتیلەکە، یان یەکی دیکەکە وەك کوژراوەکە بێ بکوژێتەوە، چاوەڕوانی فرسەتێك بوو تا لە ئاخیردا پیاوێکی لە خێڵی «عەبس»کوشت و دەستی لە شەڕ و کوشتار هەڵگرت.

دەڵێ: سوێند بەگیانی خۆم تائیفەیەکی زۆر باش بوو ئەو کەسانەی کە «حەسینی» کوڕی «ضمضم» جنایەتی دەرحەق کردن بە خیلافی مەیل و ئارەزووی ئەوان بوو.

وَكَانَ طَوَى كَشْحاً عَلَى مُسْتَكِنَّةٍ ... فَلا هُوَ أَبْدَاهَا وَ لَمْ يَتَقَدَّمِ

«طَوَى كَشحَه عَلَى كَذا»: یەعنی فلان کاری لە دڵی خۆیدا ڕاگرت و ئاشکرای نەکرد. بەڵام لە ئەسڵدا مەعنای وایە ڕووی وەرگێڕایە.

«استکنان»: بە مەعنا شاردنەوەیە.

«إبداء»: ئاشکرا.

دەڵێ: «حُصَیْن» ڕق و کینە و نیەتی خەراپی لە دڵی خۆیدا ڕاگرت و ئاشکرای نەکرد و هەنگاوی بۆ نەهاویشت تا فرسەتی بۆ نەڕەخسا.

وَ قالَ سَأَقْضِي حاجَتِي ثُمَّ أَتَّقِي      عَدُوِّي بأَلْفٍ مِنْ وَرائِي مُلْجَمِ

«اتقی»: موزاریعی موتەکەلیمی وەحدەهویە و لە بابی «افتعال»ە و لە «وقی»یە و بە مەعنا بەرەو پیلی دوژمن دەچم، یان خۆم لە دوژمن دەپارێزم.

«الف»: واتە هەزار ئەسپی لەغاو کراو و ئامادەی سوار بوون.

دەڵێ: گوتی: ئەوەی لە دڵمدایە جێ بەجێی دەکەم و تۆڵەی خوێنی براکەم دەکمەوە و لە پاشان لەگەڵ هەزار سوار ڕووبەڕووی دوژمن دەبمەوە ئەگەر ویستی شەڕ بکا، یان خۆم لە شەڕی وی دەپارێزم.

فَشَدَّ وَ لَمْ یُفْزِعْ بُیُوتاً کَثِیرَةً      لَدَی حَیْثُ أَلْقَتْ رَحْلَها أُمُّ قَشْعَمِ

«شَدَّ»: یەعنی حەملەی کرد.

«أمّ قشْعم»: نازناوی مەرگە.

دەڵێ: تەنیا پەلاماری ئەو کەسەیدا کە براکەی کوشتبوو، ماڵی دیکەی نەترساند و کاری بەسەر کەسی دیکەوە نەبوو. واتە مەرگی نەبردە ماڵی یەکێکی دیکە.

لَدَیْ أَسَدٍ شاکِي السِّلاحِ مُقذَّفٍ      لَـهُ لِـبَدٌ أَظْـفارُهُ لَـمْ تُـقَلَّمِ

«لدی أسد»: لەلای شێرێك کە مەبەست پیاوێکی ئازا و دلێرە.

«شاکي السلاح»: یەعنی پڕ چەك و بەتوانا.

«مقذف»: زۆر خراوەتە مەیدانی شەڕەوە.

«لبد»: یەعنی یاڵ.

«اظفار»: جەمعی «ظفر»ە واتە: نینۆکەکان.

«لم تقلم»: نەکرابوون.

دەڵێ: لای شیرێکی پڕ چەکی خۆشی و ناخۆشی دیوی جەنگ دیدەی خاوەن یاڵی نینۆك نەکراو، واتە «حُصَیْن» لە شوجاعەت و جەنگئاوەریدا وەك شێری یاڵ درێژی نینۆك تیژ وایە و ئەنواعی چەکی هەیە و شەڕیشی زۆر دیون.

جَرِيءٍ مَتىٰ يُظْلَمْ يُعَاقِبْ بِظُلْمِهِ  سَرِيعاً وَ إِلَّا يُبْدَ بِالظُّلْمِ يَـظْلِمِ

«جرءة»: شوجاعەت.

«اِلا یبد»: لە ئەسڵدا «إن لایبدء» بووە لە «بدء» و بە مەعنا دەست پێکردن.

دەڵێ: دلێر و بێباکێکە ئەگەر زوڵمی لێبکرێ فەوری تۆڵەی خۆی دەکاتەوە و ئەگەر زوڵمیشی لێنەکرێ ئەو زوڵم دەکا. واتە جەسارەت و شوجاعەتی تەنیا لەکاتی تۆڵە ستاندنەوەدا نییە، بەڵکوو خەڵك لە دەست زوڵمی وی لە ئەماندا نین. لەبەر ئەوەی ئەوەندە ئازاو ڕەشید و ترسناك و بێباکە.

رَعَوا ظِمْأَهُمْ حَتّىٰ إِذٰا تَمَّ أَوْرَدُوا  غِمٰاراً تَفَرّىٰ بِـالسِّلٰاحِ وَ بِـالدَّمِ

«رعوا»: لەوەڕاندن.

«ظمأ»: تینوایەتی و دوو جار ئاودان.

«اوردوا»: چوونە سەر ئاو.

«غمار»: ئاوی زیاد.

«تفری»: پڕ بوو، بەری بەر بوو.

دەڵێ: وشترەکانیان لەکاتی تینوایەتیدا لەوەڕاندن تا بە تەواوی تینوویان بوو، ئەوجا بردیاننە سەر ئاو، ئاوێکی زۆر بوو. ئەو ئاوە بەری بوو لە چڵك و خوێن.
واتە ماوەیەك دەستیان لە شەڕ و کوشتار هەڵگرت تا وشترەکانیان بلەوەڕن و دووبارە دەست بکەنەوە بە شەڕ و خوێنڕێژی و دووبارە وشترەکان بەرنەوە لەوەڕگا و دەست بکەنەوە بە شەڕ و ئەو ئاوەی کە چوونە سەری خوێناوی بوو.

فَقَضَّوْا مَنٰایا بَیْنَهُمْ ثُمَّ أَصْدَرُوا      إِلیٰ کَـلَإٍ مُسْـتَوْبِلٍ مُـتَوَخِّمِ

«قضوا»: مەحکەم و تەواویان کرد.

«مَنٰایا»: جەمعی «منیة»، واتە مەرگ.

«أَصدُرُوا»: ـ وشترەکانیان لەسەر ئاوێ بردنەوە لەوەڕاندن.

«کلأ»: گیای وشك و تەڕ.

«مستوبل و متوخم»: هەردوکیان بە مەعنا ناسازگار و بەد عاقیبەت.

دەڵێ: لە بەینی خۆیاندا باسی مەرگ و کوشتاریان ئەنجامدا و تەواویان کرد لە بەینی خۆیاندا یەکتریان کوشت و لەپاشان وشترەکانیان بۆ لەوەڕگایەکی ناسازگار و وەخیم و بەدعاقبەد وەڕێ خستن.

واتە کاتێ دەستیان لە شەڕ هەڵگرت و وشترەکانیان بۆ لەوەڕگا ڕەوانە کردن. دووبارە خۆیان ئامادە کرد بۆ کوشتار و خوێنی یەکتر. نەك بۆ سوڵح و ئاشتی و شەڕ نەکردن.

لَعَمْرُكَ ما جَرَّتْ عَلَيْهِمْ رِماحُهُم      دَمَ ابْنِ نَهِيكٍ أَوْ قَتِيلِ الْمُثَلَّمِ

«لعمرك»: قەسەم بەگیانی تۆ.

«رمح»: ڕم، نێزە.

«مثلّم»: ناوی شوێنێکە.

دووبارە گەڕاوەتە سەر مەدحی ئەو کەسانە کە سوڵح و ئاشتییان بەرقەرار کرد و خوێنی کوژراوەکانیان دا.

دەڵێ: بەگیانی تۆ قەسەم ئەو پیاوە گەورانە کە بوونە باعیسی سوڵح و سەفا نێزەکانیان خوێنی کوڕی «نەهیك» و کوژراوەکانی «مثلم»یان نەڕشتووە و بە نێزەی وان خوێنی ئەو کوژراوانە نەڕژاوە.

وَ لا شارَكُوا فِي الْحَرْبِ فِي دَمِ نَوْفَلٍ      وَ لا وَهَبٍ فِيها وَ لَا ابْنَ الْمُخَزَّمِ

دەڵێ: ئەوان لەکوشتنی «نوفل» و «وهب» و «ابن المخزم»یشدا بەشدار نەبوون.

فَكُلّاً أَراهُمْ أَصْبَحُوا يَعْقِلُونَهُ      صَحِيحاتِ مالٍ طالِعاتٍ بِمَخْرَمِ

«كُلّا»: مەنسووبە بە «اراهم» و زەمیری «صحوا» ڕاجیعە وەلای خوێندەرەکان.

«مال»: بریتییە لە وشتر.

«مخزم»: ڕێگای کوێستان.

دەڵێ: هەموو کوژراوەکان دەبینم کە خوێندەرەکان وشترانی ساغ و سەلیم بەو ڕێگاکوێستانییەدا سەر دەخەن بۆوەی لە خوێنی ئەو کوژراوەیانیان بدەن.

لِحَيٍّ حِلالٍ يَعْصِمُ النّاسَ أَمْرُهُم إِذا طَرَقتْ إِحْدَى اللَّيالِي بمُعْظَمِ

**«لِحَي»**: جار و مەجرور «متعلق»ە بە «يعقلونه» لە شیعری پێشەوەدا.

**«حلال»**: جەمعی «حالل»ە و بە مەعنا هاتنە خواربوونە.

**«طروق»**: هاتن لە شەودا.

**«بمعظم»**: «بیّ» کە بە مەعنا «مع»یە. «مَعظم» سیفەتە بۆ ئەمرێکی موقەددەر.

دەڵێ: خوێنی کوژراوەکان دەدەن لەبەر خاتری ئەو خێڵەی کە دەچن بۆلایان و لەکاتی بەسەرهاتی خەتەرناکی ڕۆژگار و زەمانەدا قسە و فەرمانی ئەوان خەڵك مەحفووز دەکا.

كِرامٍ فَلا ذُو الضِّغْنِ يُدْرِكُ تَبْلَهُ وَ لَا الْجارِمُ الْجانِي عَلَيْهِمْ بِمُسْلَمِ

**«كِرام»**: جەمعی کەریمە.

**«ضغن»**: کینە و دوژمن.

**«تبل»**: حیقد و بوغز و تۆڵە.

**«جارم»**: خاوەن جورم.

دەڵێ: قەومێکی ئەوەندە بوزورگەوارن، ئەوەی ڕقی لەوان بێ قەت ناتوانێ ڕق و کینەی خۆیانی پێ بڕێژی، وە ئەگەر کەسێکیش سەبارەت بەوان

جینایەتێك ئەنجام بدا ئەوە نایگرن تا تۆڵەی لێ بکەنەوە، بەڵکوو لە گوناحی خۆش دەبن و ئازادی دەکەن و دەیبەخشن.

سَئِمْتُ تَكَالِيفَ الْحَيَاةِ وَ مَنْ يَعِشْ ثَمَانِينَ حَوْلاً لَا أَبَا لَكَ يَسْأَمِ

«سأمة»: مەلالەت و ماندوو بوون.

«تكاليف»: ئەزیەت و ناڕەحەتی.

«لا أبالكَ»: بەزاهیر کەلیمەیەکی ناخۆشە، بەڵام مەبەست ئەوەیە واتە وشیار بەو بۆ ئاگادارییە.

دەڵێ: لە زەحمەت و ناڕەحەتی ژیان ماندوو بووم ئەوەی کە هەشتا ساڵ بژی بزانە و ئاگادار بە بێزار و ماندوو دەبێ.

وَ أَعْلَمُ مَا فِي الْيَوْمِ وَ الْأَمْسِ قَبْلَهُ وَ لٰكِنَّنِي عَنْ عِلْمِ مَا فِي غَدٍ عَمِ

«عم»: سیفەتی «دڵە».

دەڵێ: ئاگام لە کارەساتی ڕابردوو و ئێستایە، بەڵام لە ئەحواڵی ئایندە نەزان و بێ ئاگام.

ندانـد بـجز ذات پـروردگار　　که فردا چه بازی کند روزگار

رَأَيْتُ الْمَنَايَا خَبْطَ عَشْوَاءَ مَنْ تُصِبْ تُمِتْهُ، وَ مَنْ يُخْطِئْ يُعَمَّرْ فَيَهْرَمِ

«خبط»: دەستکوتان بە عەرزدا.

«عشواء»: بە مەعنا وشترێکە کە بەر پێی خۆی نەبینی.

«خبط عشواء»: کینایەی نەزانین لە کاراندایە.

دەڵێ: مردن دەبینم کە بەبێ نەزم و حیساب و زانیاری وەك دەستکوتانی وشتری کوێر، کە وەبەر هەر کەسێك بکەوی لەبەینی دەبا و ئەوەی کە وەبەریشی نەکەوت زۆر دەژی و پیر دەبێ.

واتە بۆ مەرگی خەڵك قاعیدە و قانوون و حیسابێك نییە.

---

**وَ مَنْ لَمْ یُصَانِعْ فِي أُمُورٍ کَثِیرَةٍ        یُضَرَّسْ بِأَنْیَابٍ وَ یُوطَأْ بِمَنْسِمِ**

---

«مُصَانَعَة»: مودارا و سازش.

«ضرس»: گازگرتن.

«منسم»: قەراغی سمی وشتر.

دەڵێ: هەر کەسێك مودارا نەکا لە زۆر کاردا بە ددانی نووك تیژ گازی لێ دەگیرێ و لەبەین دەچێ و دوچاری بەسەرهاتی ناخۆش و گرفتاری زۆر دەبێ.

---

**وَ مَنْ یَجْعَلِ الْمَعْرُوفَ مِنْ دُونِ عِرْضِهِ    یَفِرْهُ، وَ مَنْ لا یَتَّقِ الشَّتْمَ یُشْتَمِ**

---

«یَفِر»: زیاد دەبێ.

دەڵێ: هەرکەس لەبەر حیفزی ئابرووی ماڵی دنیا بدا و چاکە بکا، ئەوە ئابروو و شەرافەت و کەرامەتی خۆی زیاد دەکا و ئەوەی خۆی لە جنێودان نەپارێزی، ئەوە جنێوی پێ دەدرێ.

واتە پیاوی سەخی موحتەرەم و ئابڕوومەند و پیاوی بەخیلیش بەدناو و نەفرەت لێکراوە.

وَ مَنْ يَكُ ذٰا فَضْلٍ فَيَبْخَلْ بِفَضْلِهِ    عَلىٰ قَوْمِهِ يُسْتَغْنَ عَنْهُ وَ يُذْمَمِ

دەڵێ: ئەو کەسەی خاوەنی فەزڵ و ماڵ بێ و بەخیلی پێوە بکا لەگەڵ قەومەکەی، ئەوە لێی بێنیاز دەبن و لۆمەی دەکەن.

وَ مَنْ يُوفِ لاٰ يُذْمَمْ، وَ مَنْ يُهْدَ قَلْبُهُ    إِلىٰ مُطْمَئِنِّ الْبِرِّ لاٰ يَتَجَمْجَمِ

دەڵێ: هەرکەسێك وەفا بە عەهد و پەیمان بکا، ئەوە قەت لۆمەی ناکرێ و خەڵك بە خەراپی باسی ناکا. وە ئەوەی دڵی بۆ کاری خێر لێبدا ئەوە دەستی لێ هەڵناگری و وەدوای ناخا.

وَ مَنْ هٰابَ أَسْبٰابَ الْمَنٰايٰا يَنَلْنَهُ    وَ إِنْ يَرْقَ أَسْبٰابَ السَّمٰاءِ بِسُلَّمِ

«أسباب»ی یەکەم: بە مەعنا سەبەب و وەسیلەیە و ئەوەی دووەم مەبەست پێی بڵندی کەناری ئاسمانە.

دەڵێ: ئەوەی لەو شتانە بترسی کە دەبنە سەبەب و هۆی مردن ئاخری تووشیان دەبێ و ناتوانی لەبەر دەستیان ڕابکا ئەگەر بە هۆی پەیژەوەش بچێ بۆ قەراغی ئاسمان.

**وَ مَنْ يَجْعَلِ الْمَعْرُوفَ فِي غَيْرِ أَهْلِهِ    يَكُـنْ حَـمْدُهُ ذَمّاً عَـلَيْهِ وَ يَـنْدَمِ**

دەڵێ: ئەوەی چاکە لەگەڵ ئینسانی بەد و نائەهلدا بکا، لەباتی ئەوەی تەعریفی بکەن و چاکەی بگوترێ، ئەوە لۆمەی دەکرێ و پەشیمان دەبێتەوە.

شێخی سەعدی دەڵێ:

**نکویی با بَدان کردن چنان است    که بَـدکردن بـەجای نـیکمردان**

**وَ مَنْ يَعْصِ أَطْرافَ الزِّجاجِ فَإِنَّهُ    يُطِيعُ الْعَوالِي رُكِّبَتْ كُلَّ لَـهْذَمِ**

«زجاج»: جەمعی «زج» بە مەعنا لای خوارەوەی نێزەیە.

«عوالی»: جەمعی «عالی»ە و بە مەعنا لای سەرەوەیەتی.

«لهذم»: دەمە تیژەکەی.

دەڵێ: هەر کەسێك لە پێشدا بە سوڵح و ئاشتی ڕازی نەبێ، ئاخری شەڕ وادار بە تەسلیم بوونی دەکاو ڕایدێنێ.

لێرەدا ئیشارەت بۆ عادەتی عەرەبان دەکا کە لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن بە نیشاندانی بنی نێزەکە داوای ئاشتییان دەکرد، کە دەیانزانی سوڵح ناکرێ نووکی نێزەکانیان بەکار دەهێنا.

**وَ مَنْ لَمْ يَذُدْ عن حَوْضِهِ بِسِلاحِهِ    يُهَدَّمْ، وَ مَنْ لا يَظْلِمِ النَّاسَ يُظْلَمِ**

«ذود»: ڕاگرتن و مەنعکردن.

«حوض»: کینایەی حەقە.

دەڵێ: ئەو کەسەی بە چەکی خۆ دیفاع لە حەقی خۆی نەکا ئەوە لە بەینی دەبەن و ئەوەی زوڵمیش نەکا زوڵمی لێ دەکرێ، واتـە ئـەوەی بـە ئـازایـەتی و مەردایەتی دیفاع لە حەقی خۆی نەکا، حەقەکەی دەفەوتێ و بوونی بەرەو نەمان دەڕوا.

وَمَن يَغْتَرِبْ يَحْسِبْ عَدُوّاً صَدِيقَهُ ‌ ‌ ‌ وَ مَـنْ لَا يُكَـرِّمْ نَـفْسَهُ لَا يُكَـرَّمِ

دەڵێ: ئەوەی چوو بۆ غەریبی دوژمن بە دۆست لە قەڵەم دەدا، لەبەر ئەوەی تەجرەبەی نییە و خەڵك ناناسێ، وە ئـەوەی ئـیحتیڕام و شـەخسیەتی خـۆی نەپارێزی لای خەڵك موحتەرەم نابێ.

وَ مَهْمَا تَكُنْ عِنْدَ امْرِئٍ مِنْ خَلِيقَةٍ ‌ ‌ ‌ وَ إِنْ خَالَهَا تَخْفَىٰ عَلَى النَّاسِ تُعْلَمِ

«خليقة»: خوڵق و خوو.

«خال»: وەدەزانی.

دەڵێ: هەر ئینسانێك هەر خووڕەوشت و ئەخلاقێکی هەبێ و وەبزانی کە خەڵك ئاگایان لە خوڵق و خووەکەی نییە، ئەوە بـە هـەڵەدا چـووە و ئـەوە لێی ئاشکرا دەبێ و دەزاندرێ.

وَكَائِنٍ تَرىٰ مِنْ صَامِتٍ لَكَ مُعْجِبٍ ‌ ‌ ‌ زِيَـادَتُهُ أَوْ نَـقْصُهُ فِـي التَّكَـلُّمِ

دەڵێ: ئەتۆ زۆر کەسی خامۆش وکەم دوێ دەبینی کە بەلاتەوە زۆر عەجایبن. بەڵام ئەوە بزانە کە زۆری و کەمی قەدری ئینسان لە قسەکردنیدا دەردەکەوێ.

شێخی سەعدی دەڵێ:

**تا مرد سخن نگفته باشد　　　عیب و هنرش نهفته باشد**

---

**لِسانُ الْفَتیٰ نِصْفٌ وَ نِصْفٌ فُؤادُهُ　　　فَلَمْ یَبْقَ إلّا صَورَةُ اللَّحْمِ وَ الدَّمِ**

---

دەڵێ: ئینسان دوو بەشە، زمان و دڵە و باقی لە خوێن و گۆشت بەولاوە نییە. وەك گوتراوە «اَلْمَرءُ بِأَصْغَرَیْهِ»، واتە: ئینسانیەت و شەخسیەتی ئینسان لە دوو ئەعزای بچووکیدایە، کە زمان و دڵن. مەبەست ئەوەیە کە ئیمتیازی بەشەر فەهم و زانیاری و عەقڵ و قسەگوتن و بەیانیەوەیەتی، نەك بە قیافە و شکڵ و سووڕەتی زاهیرییەوە، وەك شێخی سەعدی دەڵێ:

**اگر آدمی به چشم است و زبان وگوش و بینی**

**چه میان نقش دیوار و میان آدمیت**

---

**وَ إِنَّ سَفاهَ الشَّیْخِ لا حِلْمَ بَعْدَهُ　　　وَ إِنَّ الْفَتیٰ بَعْدَ السَّفاهَةِ یَحْلُمِ**

---

دەڵێ: کە پیاو پیر بوو تازە سەبر و ویقار و حەوسەڵەی بەدواوە نابێ، لەبەر ئەوەی لە دوا پیری مەرگ نەبێ هیچ ئومێدێك نامێنی. بەڵام گەنجی سەفیە لەوانەیە ڕۆژێك بێتەوە سەر خۆ و سەبر و حەوسەڵەی هەبێ. وەك شێخی سەعدی دەڵێ:

**چوبِ تر را چنانکه خواهی پیچ　　نشود خشک جز به آتش راست**

**سَأَلْنا فَأَعْطِيتُمْ، وَ عُدْنا فَعَدْتُمُ　　وَ مَنْ أَكْثَرَ التَّسْآلَ يَوْماً سَيُحْرَمِ**

دەڵێ: داوامان لە ئێوە کرد و داتاینێ، دووبارە داوامان کردەوە و ئێوەش داتاینەوە، بەڵام ئەوەی زۆر جار داوا بکا ڕۆژێك جوابی نادرێتەوە.

وەك شێخی سەعدی دەڵێ:

**طمع را نباید که چندان کنی　　که صاحب کرم را پشیمان کنی**

# موعەللەقەی چوارەم

«معلقە»ی چوارەم ئـی ئـەبوو عـەقیل لەبیدی کـوڕی ڕەبـیعەی عـامیری موزەرییە. لە ساڵی «٥٦٠» تا «٦٦١»دا ژیاوە و یەکێك لە ئەشراف و پاڵەوان و پیاوماقووڵی گەلەکەی بووە.

دەستی داماوانی گرتۆتەوە و زۆری ڕێز لە میوانان گرتـووە. لەگـەڵ وەفـدی بەنی عامیری بە خزمەت پێغەمبەری ئـیسلام گـەیشتووە و ئـیمانی هـێناوە و قورئانی لەبەر کردووە و دەستی لە شیعرگوتن هەڵگرتووە و لە زەمانی خەلیفەی دووەم حەزرەتی عومـەردا چـۆتـە «کـووفـە» و لەوێ مـاوەتـەوە. تـا لە زەمـانی حوکومەتی حەزرەتی «موعاویە»دا لە ساڵی چل و یەکی کـۆچـیدا لە تـەمەنی زیاتر لەسەت ساڵیدا وەفاتی کردووە و قەسیدە ناسراوەکەی کە ئەو «معلقە»یە لە بەحری کامیلە و هەشتاو هەشت شیعرە و لە یادی مەنزڵی خۆشەویستەکەیدا وەسفی وشتر و یاری و کەرەمی خۆی فەخر بەخۆی و قەومەکەیدا دایناوە، وەك عادەتی شوعەڕای زەمانی جاهیلیەت.

عَفَتِ الدِّيَارُ مَحَلُّهَا فَمُقَامُهَا      بِمِنىً تَأَبَّدَ غَوْلُهَا فَرِجَامُهَا

«عفت»: وێران بوو.

«محل»: مەنزڵی کاتی بۆ چەند ڕۆژ.

«مقام»: بەو مەنزڵە دەڵێن؛ کە زۆری لێ وەمێنی.

«منی»: ناوە بۆ جێگایەك غەیری «منی»ی مەککە.

«تأبد»: لە «أبد»ە و بە مەعنا وەحشەتە.

«غول و رجام»: دوو کێوی مەشهوورن.

دەڵێ: ئاساری مەنزڵگای خۆشەویستەکەم لە «منی» لەبەین چووە و مەنزڵەکەشی لەو دوو کێوانە چوڵ و خاڵی و وەخشەتزەدەن.

فَمَدَافِعُ الرَّيَّانِ عُرِّيَ رَسْمُهَا      خَلَقاً كَمَا ضَمِنَ الْوُحِيَّ سِلَامُهَا

«مدافع»: جەمعی «مدفع» و بە مەعنا مەجرای ئاو و جێگای جاریبوونی سێڵاو.

«الريّان»: ناوی کێوێکە.

«خلقاً»: کۆن و ڕزیو.

«وحی»: نووسین، کتێب.

«سلام»: جەمعی «سلمە» و بە مەعنا بەردە.

دەڵێ: مەنزڵەکەی لای سێڵاوی کێوی ڕییانیش سامناك و خاڵی و چۆڵ و وێران بووە، بەڵام سێڵاو ئاساری پاك کردۆتەوە و وەدەری خستووە، وە نەبێ بە

مرووری زەمان بە تەواوی لەبەین چوبێ وەك نەخشی نووسین لەسەر بەرد باقی ماوەتەوە.

دِمَنٌ تَجَرَّمَ بَعْدَ عَهْدِ أَنِيسِهَا    حِجَجٌ خَلَوْنَ حَلالُهَا وَ حَرَامُهَا

«دِمَن»: جەمعی «دِمنَة» واتە ئاساری ڕەش بۆوەی مەنزڵ.

«تَجَرَّم»: كامیل بووە.

«عَهد»: لیقا.

«حجج»: ساڵ.

«حلال و حرام»: ساڵ كە هەشت مانگ شەڕیان تێدا حەڵاڵ بووە و چوار مانگ شەڕیان تێدا حەرام بووە.

دەڵێ: بەعزە كەسێك خۆ دەپارێزن كە لە مانگە حەڵاڵەكاندا بچنە ناو ئەو مەنزڵانە، بەڵام لەو مانگانەی كە شەڕیان تێدا حەرام كراوە دەچن، چونكە ئەمینن و ناترسن.

دەڵێ: بەڵام ئەو مەنزڵانەی یار نە ئەو كەسەی كە ئەمینە و نە ئەوەی دەترسی ناچنە ناویان، چونكە وێران بوون.

رُزِقَتْ مَرَابِيعَ النُّجُومِ وَ صَابَهَا    وَدْقُ الرَّوَاعِدِ، جَودُهَا فَرِهَامُهَا

«مرابیع»: جەمعی «مرباع» واتە: مەنزڵەكانی ڕۆژ لە بەهاردا.

«صاب»: هەدەفی پێكا.

«ودق»: باران.

«جَوْد»: بارانی زۆر.

«رهام»: جەمعی «رهمة» نەرمە باران.

دەڵێ: بەنسیب ئەو مەنزڵانە بوو بارانی کاتی بەهاری لە هەوری پڕ و برووسکە و بەرقاوی و ئیقلیمگیرەوە و نەرمەبارانی ئارام و لەسەرخۆ. لەبەر ئەو بارانانە ئەو مەنزڵانە خۆش و سەر سەوز و پڕ گوڵ و گیان.

---

مِن كُلِّ سٰارِيَةٍ وَ غٰادٍ مُدْجِنٍ  وَ عَشِيَّةٍ مُتَجٰاوِبٍ إِرْزٰامُـهٰا

---

«سارية»: ئەو هەورەی لە شەودا بارانی لێ دەبارێ.

«غاد»: لە «غدوة»ە و بە مەعنا هەوری کاتی نیوەڕۆیە.

«مُدجن»: هەوری پڕ و ئیقلیمگیرە.

«عشية»: هەوری ئێواران.

«ارزام»: دەنگ لێهاتوو، واتە ڕەعد و بەرق.

دەڵێ: تەواوی ساڵ ئەو هەورانە بارانیان باراند بەسەر ئەو مەنزڵانەدا لە هەور و بارانی شەوانی زستان و لەو هەورانەی کە بەیانییان عاسمانیان تاریك دەکرد و ئێواران بە برووسکە و بەرق دنیایان ڕووناك دەکردەوە.

---

فَعَلا فُرُوعُ الْأَيْهَقٰانِ وَ أَطْفَلَتْ  بِالْجَلْهَتَيْنِ ظِبٰاؤُهٰا وَ نَـعٰامُهٰا

---

«ايهقان»: ئەو گیا و سەوزەی لە قەراغ ئاو دەڕوێن.

«**اطفلت**»: بەچکەی بوو.

«**نعام**»: هێلکان دەکا.

دەڵێ: سەوزە و گیا لە قەراغ جۆگەی ئاوەکان سەوز بووە و سەری وەدەرناوە، ئاسکان بەچکەیان بووە و نەعامە هێلکەی کردوون و جووجیلەی هەڵێناون.

مەبەستی پێ ئەوەیە دەڵێ: کە ئەو مەنزڵانە چۆڵ بوون و کەسیان تێدا نەماوە، لەبەر ئەمینیان حەیوانی کێوی و باڵندەی لێ زۆر بوون.

---

**وَ الْعَيْنُ ساكِنَةٌ عَلىٰ أَطْلائِها        عُوذاً تَأَجَّلُ بِالْفَضاءِ بِـهامُها**

---

«**عين**»: چاوگەورە.

«**أطلاء**»: جەمعی «طلا»، واتە بەچکەی ساوا.

«**عوذ**»: تازە لە دایك بووە.

«**تأجل**»: واتە دەستەیەك گاکێوی.

«**فضاء**»: سەحرا.

«**بهام**»: بەچکەی گاکێوی.

دەڵێ: گا وەحشییەکانی چاوگەورە بێترس و لەسەرخۆ بەچکە تازەبووەکانیان وەپێش خۆ داوە و دەستە بە دەستە لەگەڵیان دەگەڕێن، یەعنی لەپاش کۆچکردنی یار و خەڵکەکەی بۆتە مەسکەنی وەحشییان.

---

**وَ جَلَا السُّيُولُ عَنِ الطُّلُولِ كَأَنَّها        زُبُـرٌ تُـجِدُّ مُـتُونَـها أَقْـلامُها**

---

«جلاء»: ئاشکراکردن.

«طلول»: جەمعی «طللْ»، لێرەدا بە مەعنا ئاساری مەنزڵە.

«زُبُر»: جەمعی «زَبور»ە، یەعنی کتێب.

«تُجِد»: تازە دەکاتەوە.

«متون»: ناوەڕاستەکان.

دەڵێ: سێڵاو کە ئاسارە ونبووەکانی وەدەر خستۆتەوە وەك ئەو قەڵەمانە دەچێ کە بە سەر خەتی کۆنیاندا دەبەن و تازەیان دەکەنەوە.

واتە سێڵاو هەستان بۆتە هۆی وەدەرکەوتنەوەی ئاسارە داپۆشراوەکان لەژێر لم و خۆڵدا وەك چۆن قەڵەم داهێنان بە سەر خەتی کۆنەدا نووسراوەکە وەدەر دەخاتەوە.

---

أَوْ رَجْعُ وَاشِمَةٍ أُسِفَّ نَؤُورُهَا      كِفَفاً تَعَرَّضَ فَوْقَهُنَّ وِشَامُهَا

---

«رجع»: تازەکردن و دووبارەکردنەوەی.

«واشمة»: ژنی خاڵ کوتراو، ژنی خاڵ کوت.

«إسفاف»: بەسەرداکردن.

«نؤور»: کل و دووکەڵی چرا و ئاور.

«کفف»: جەمعی «کفه»، خڕ وەك دایرە.

«وشام»: جەمعی «وشم»ە واتە خاڵ.

دەڵێ: یان ئاشکراکردنی ئاساری مەنزڵ دەڵێی تازەکردنەوەی خاڵکوتراوەکە دووبارە کل و دووکەڵی ڕەشی بە سەر خاڵەکەیدا کردۆتەوە و چاکتر وەدەرکەوتۆتەوە.

واتە تازە دەرکەوتنەوەی ئاسار وەك تازەکردنەوەی خاڵی کۆنە.

فَوَقَفْتُ أَسْأَلُهٰا وَ كَيْفَ سُؤٰالُنٰا صُمّاً خَوٰالِدَ مٰا يَبِينُ كَـلاٰمُهٰا

«صم»: جەمعی «اصم»ە، لێرەدا بە مەعنا سەخت و بێدەنگ.

«خوالد»: جەمعی «خالدة». یەعنی باقی و پایەدار.

«بان»: هەمیشە لازمە و یەعنی زاهیر بوو.

دەڵێ: وەستام و لەو ئاسارانە لە بارەی دانیشتوانی ئەو وڵاتە پرسیارم کـرد، بەڵام چۆن ئەکرێ لەو بەردە ڕەق و بێدەنگە پرسیار بکرێ.کە هیچ قسەیەك ناکەن.

عَرِيَتْ وَ كٰانَ بِهَا الْجَمِيعُ فَأَبْكَرُوا مِنْهٰا وَ غُـودِرَ نُـؤْيُهٰا وَ ثُـمٰامُهٰا

هەموو زەمیرەکان بۆ «طلول» دەگەڕێنەوە.

«عریت»: خاڵیبوون لەکاتی بەیانیدا.

«مغادرة»: تەرك کرا و بەجێ هێشترا.

«نۆی»: بەو جۆگەلە چووکـەڵە دەڵێن کـە لە دەورەی، ڕەشـماڵی لێدەدەن بۆوەی ئاو نەچیتە ژورەوە.

«ثمام»: گیایەکی کورت و زەعیفە کە لە ڕۆژنەی خانوو و کونـە دیـوارانـی دەخنن، بۆ ئەوە باران و ئاو نەچێتە ژوورەوە.

دەڵێ: باریان کرد و لە بەری‌بەیانیدا ڕۆیشتن و چۆڵیان کرد و خاڵی بوون و هیچی لێ نەما، جۆگەلە ئاوەکە و گیا وردەکە و ئەو شتانە نەبێ کە هەڵناگیرێن.

شَاقَتْكَ ظُعْنُ الْحَيِّ يَوْمَ تَحَمَّلُوا　　فَتَكَنَّسُوا قُطُناً تَصِرُّ خِيَامُهَا

«ظَعن»: جەمعی «ظعية» بە مەعنا ژنی کەژاوە نشین.

«تکنس»: چوونە ناو کەژاوەوە.

«قطن»: جەمعی «قطین» و بە مەعنا جەماعەت.

«صریر»: دەنگی دەرگا و خێوەتە بارکراوەکان.

دەڵێ: ئەتۆی ئارەزومەند و غەمناك کرد ژنە کۆچکردووەکان لەوکاتەیەدا کە باریان کرد و چوونە ناو کەژاوەکانیانەوە و دەستە بە دەستە خۆیان لە پێش چاوان ون کرد و دەنگی خێوەتە بارکراوەکان دەهات لەبەر تازەبوونیان و وێککەوتنی دارەکان.

مِنْ كُلِّ مَحْفُوفٍ يُظِلُّ عِصِيَّهُ　　زَوْجٌ عَلَيْهِ كِلَّةٌ وَ قِرَامُهَا

«محفُوف»: داپۆشراو.

«یظلّ»: لە «ظلّ»ە و بە مەعنا سێبەرە.

«عصی»: جەمعی «عصا»یە و لێرەدا مەبەست پێی داری خێوەتەکانە.

«زوج»: لێرەدا مەبەست پەردەی سەر کەژاوەکانە.

«کلة»: پەردەی ناسك.

«قِرام»: ئەو پارچەیە کە ژن و پیاو لە ناو کەژاوەدا لەسەری دادەنیشن.

دە لێ: لە هەر کەژاوەیەکی سەرداپۆشراو کە داری کەژاوەکەیان بە سێبەر داپۆشیبوو، پەردەی ناسکی گرانبەهایان بەسەردا دابوو تا کەژاوەنشینەکان هەتاو نەیانبا.

زُجَلاً كَأَنَّ نِعَاجَ تُوضِحَ فَوْقَهَا وَ ظِبَاءَ وَجْرَةَ عُطَّفاً أَرْآمُهَا

«زجل»: جەمعی «زجلة» یەعنی جماعات.

«نِعاج»: جەمعی «نعجة»ە و مەبەست پێی مانگای کێوییە.

«تُوضِح و وَجرَة»: ناوی دوو جێگان.

«عُطفاً»: ئاوڕدانەوە بۆ سەر خۆشەویست.

«أرآم»: ئاسکی سپی خالیس.

دەڵێ: کۆچیان کرد و سوار بوون، دەڵێی مانگای کێوی «توضح»ن لە چاو جوانی و ڕۆیشتندا و وەك ئاسکەکانی «وَجرة»ن کە بە ڕوحمەوە ئاوڕ دەدەنەوە سەر بەچکەکانیان.

چاو جوانی و گەردنی ژنانی تەشبی کردووە بە چاو و گەردنی مانگا کێویان. یا ئاسکان لە حاڵەتێکی تایبەتیدا.

حُفِزَتْ وَ زَيَّلَهَا السَّرَابُ كَأَنَّهَا أَجْزَاعُ بِيشَةَ أَثْلُهَا وَ رِضَامُهَا

«حُفِزَ»: لێخوڕین.

«زیَّل»: بڵاوبوونەوە و وەحەڕەکەت کەوتن.

«أجزاع»: جەمعی «جزع»، بە مەعنا کەچی و خواری شیو.

«بیشة»: ناوی شیوێکی ناسراوە.

«أثل»: نەوعە دارێکی گەورەی دیاریکراوە لە داری گەز گەورەترە.

«رِضام»: جەمعی «رضمة»ە، واتە بەردی گەورە.

«سراب»: تراویلکە، تیشکی ڕۆژە کە لە عەرزی دەدا و وەك ئاو دەچی.

دەڵێ: وشترەکانیان لێ‌خوڕین و سەراب بڵاوەی پێ‌کردن، دەتگوت خواری شیوی بێشەن. واتە گەورەیی ئەو وشترانەی کەژاوەیان بەسەرەوە بوو، وەك گەورەیی ئەو دار و بەردانەی ئەو شیوە بوون.

بَلْ مٰا تَذَكَّرُ مِنْ نَوٰارَ وَ قَدْ نَأَتْ          وَ تَقَطَّعَتْ أَسْبٰابُهٰا وَ رِمٰامُهٰا

«تَذکر»: ئەسڵەکەی «تتذکر» و ڕووی قسەی لەگەڵ دڵی خۆیەتی.

«نوار»: ناوی دۆستەکەی خۆیەتی.

«نأی»: دووری.

«رِمٰام»: پارچە گوریسێکی کۆنی زەعیفە.

دەڵێ: ئەی دڵ دەست هەڵگرە لە باسی مەنزڵی یار و تازە یادی چی دەکەیەوە لە «نەوار» لە کاتێکدا دوور کەوتۆتەوە و وەسائیل و بەڵگەی بەقووەت و زەعیفی بەو گەیشتن لە دەستدا نەماون.

مُرِيَّةٌ حَلَّتْ بِفَيْدَ وَ جٰاوَرَتْ          أَهْلَ الْحِجٰازِ فَأَيْنَ مِنْكَ مَرٰامُهٰا

«مَرية»: واتە لە خێڵی «مُره»یە.

«فید»: ناوی شوێنێکە.

«مرام»: مەتڵەب.

دەڵێ: «نوار» لە خێڵی «مرە»یە و مەنزڵ و مەسکەنی هێندێك جار لە «فید»ە و جاریواشە لە حیجازە، کەواتە ئەتۆ لە کوێ دەتوانی بەوی بگەی؟ چونکە مەنزڵی تۆ لەگەڵ مەنزڵەکانی ئەو زۆر لێك دوورن.

بِمَشارِقِ الْجَبَلَيْنِ أَوْ بِمُحَجَّرٍ فَتَضَمَّنَتْها فَرْدَةٌ فَرُخامُها

مەبەست لە «جبلين»: دوو کێوی «طی»ن، بەناوی «اجا» و «سلمی».

«مُحَجَّر»: کێوێکە.

«فردَة»: کیوێکی بە تەنهایە.

«رُخام»: عەرزی نزیك کێوی «فردە»یە.

دەڵێ: مەنزڵگای «نوار» لە «فید» بریتییە لە لای ڕۆژهەڵاتی ئەو دوو کێوە، یان کێوی «محجر» و کێوی «فردة» و ئەو عەرزی نزیك، ئەو لەوێدا نیشتەجێ بووە.

فَصُوائِقٌ إِنْ أَيْمَنَتْ فَمَظِنَّةٌ فِيها رِخافُ الْقَهْرِ أَوْ طِلْخامُها

«صوائق» و «رخاف القهر» و «طلخام»: ناوی سێ جێگای ناسراون.

«أَيْمنَ»: چووە «یەمەن».

«مَظَنَّة»: جێگایەك کە گومانی شتێکی لێ ببرێ.

دەڵێ: ئەگەر بچێ بۆ «یەمەن» گومانی لێدەکرێ کە لە «صوائق»، یان لەو دوو شوێنە ناسراوانەدا جێنشین بێ.

فَاقْطَعْ لُبانَةَ مَنْ تَعَرَّضَ وَصْلُهُ وَ لَضَبْرُ واصِلِ خُلَّةٍ صَرامُها

«لبانة»: حاجەت.

«تعرض»: گۆڕا، خەراب بوو.

«خلَة» خۆشەویستی.

«صرام»: سیفەتە موبالەغەی «صرم»ە و بە مەعنا قەتع و دەست هەڵگرتن.

دەڵێ: مادام وایە دەست لە نیاز و ئارەزووەکانی خۆت هەڵگرە و قەتعی ئومێد بکە، چونکە باشترین دۆست ئەو کەسەیە کە زانی دۆستەکەی داوا لێکردنی لەسەر شانی گرانە و پێی ناخۆشە دەست هەڵگرێ و داوای لێ نەکا تا مابەینیان تێك نەچێ.

وَ أَحْبُ الْمُجَامِلَ بِالْجَزِيلِ و صَرْمُهُ ... بَاقٍ إِذَا ظَلَعَتْ وَ زَاغَ قِوَامُهَا

«حباء»: عەتا و بەخشش.

«مجامل»: سازشکار.

«جزیل»: خۆشەویستی کامیل و تەواو.

«ظلعت»: زەمیری «ظلعت» و «قوام» دەگەڕێنەوە بۆ «خلة»ی شیعری پێشوو. «ظلع» بە مەعنا لەنگی چوارپێیانە، بەڵام لێرەدا مەبەست خەلەل و سستی لە خۆشەویستیدایە.

«زیغ»: مەیل و کەچی.

«قوام»: ڕاگرتن.

دەڵێ: ئەتۆ موحیبەتی تەواو دەرحەق بەو کەسە بکە مودارا و سازشت لەگەڵ دەکا. چونکە هەرکاتێ کە بۆت دەرکەوت کە خەلەل و سستی لە دۆستاتییەکەیدا هەیە تۆش دەتوانی ڕووی لێ وەرگێڕی.

واتە هەتا بێمیهری و بێوەفایی دۆست ئاشکرا نەبێ، نابێ لەگەڵی بێمیهر و وەفا بێ.

بِطَلِيحِ أَسْفارٍ تَـرَكْـنَ بَـقِيَّةً مِنها فَأَحْنَقَ صُلْبُها وَ سَنامُها

«طليح»: «فـيعل»ی بـه مـەعنا «مـەفعول»ە و لە «طـلح»ە و بـە مـەعنا ماندووکردنی وشتر لە ڕێگا ڕۆیشتندا.

«اسفار»: جەمعی سەفەرە.

«اَحناق»: کزبوون.

«صلب»: پشت.

«سنام»: بەرزایی پشتی وشتر.

«بێ» لە «بطليح»دا پەیوەندی بە جوملەی «صرمُهُ باق» ئی شیعری پێشەوەیە.

دەڵێ: لە حاڵێکدا سستی و خواری و بێموبالاتیت لە دۆستەکـەت دی، سواری وشتری ماندووبووەکەت ببی کە بەهۆی سەفەرکردنی زۆرەوە کەمتوانا بووە و پشت و بەرزایی پشتی کز و لاواز بووە عەلاقەی لەگەڵدا ببڕی و لێی دوور وەکەوی.

فَإِذا تَغالىٰ لَحْمُها وَ تَحَسَّرَتْ وَ تَقَطَّعَتْ بَعْدَ الْكَلالِ خِدامُها

«تغالی»: لە «غلاء»ی بە مەعنا گرانی و زیادبوون و بەرز بوونەوەی نرخـی شتە.

«تَحسَّرَت»: واتە گۆشتی پێوە نەماوە.

«خدام»: جەمعی «خَدم» و ئەویش جەمعی «خدمة»، بەو چەرمە دەڵێن کە لە پێی وشتری قایم دەکەن.

دەڵێ: بە سواری وشترێکی ڕێ‌تەیکەر کە کاتێ لەبەر کزی گۆشتەکەی بۆ سەر ئێسقان وگۆشتی بە بەدەنەوە نەمابوو، چەرمی سمەکانی دڕا بوو، دووبارە لە کەماڵی نیشاتدا بە ڕێگەدا دەڕوا، وەك لەو شیعرەی دواییدا دەڵێ:

فَلَهٰا هِـبابٌ فِـي الزِّمٰـامِ كَأَنَّـهٰا صَهْبٰاءُ خَفَّ مَعَ الْجُنُوبِ جَهٰامُهٰا

«هِبابٌ»: نیشات.

«صهباء»: سوور، بەڵام لێرەدا مەبەست هەوری ڕەنگ سوورە.

«خَفَّ»: توند ڕۆیی.

«جِهام»: بە هەورێك دەڵێن کە ئاوەکەی باراند بێ.

دەڵێ: لە ڕۆیشتندا ئەوەندە بە کەیفە، لەو کاتەیدا کە هەوسارەکەی ڕادەکێشی وەك هەوری سووری بێ‌بارانە کە بە نەرمە بایەك دەڕوا.

أَوْ مُلْمِعٌ وَسَقَتْ لِأَحْقَبَ لاٰحَـهُ طَرْدُ الْفُحُولِ وَ ضَرْبُهٰا وَ كِدٰامُهٰا

«مُلْمِع» مایین، یان ماکەرێك کە خەریکە ئاوس ببێ و سەری مەمکانی ڕەش بووبێ.

«وسقت»: ئاوس بوو.

«احقب»: کەرە کێوی نێر کە دوو کەفەڵی سپی بێ.

«لاحه»: ئەوی گۆڕیوە.

«فحول»: جەمعی «فحل»ە.

«كِدام»: گازگرتن.

دەڵێ: یان لە ڕۆیشتن و سورعەتدا وەك ماکەرە کێویێکی ئاوس لە کەرە کێوییێکی کەفەڵ سپی، کە ئەویش بەهۆی ڕاونان و لەقە لێدان و گاز لێگرتنی کەرە کێوییان کز و گۆڕابێ.

بەهۆی غیرەتی بەسەر ئەو ماکەرە ئاوسەوە توند وە پێش خۆی دەدا و بەلەقەلێدان و گازگرتن کەرە کێوییەکانی لێ دوور دەخاتەوە و ئەویش لەوان گازو لەقە دەخوا.

---

**یَعْلُو بِهٰا حَدَبَ الْإِکٰامِ مُسَجَّجٌ قَدْ رٰابَهُ عِصْیٰانُهٰا وَ وِحَامُهٰا**

---

«حدب»: قورت و پێچ.

«اکام»: تەپۆڵکە.

«مُسَجَّج»: بە گاز لێگرتن بریندار بووە.

«وحام»: بێزوو.

دەڵێ: ئەو ماکەرەی بە قورت و پێچی ئەو تەپۆڵکەدا بردە سەرێ ئەو کەرە گاز گیراوە. کە ئەو ماکەرە بەهۆی بەقسە نەکردن و بێزووی ئاوس بوونەوە خستوویەتیە شکەوە.

---

**بِأَحِزَّةِ الثَّلَبُوتِ یَرْبَأُ فَوْقَهٰا قَفْرَ الْمَرٰاقِبِ خَوْفُهٰا آرٰامُهٰا**

---

با لە «بأحزة»دا دەگەڕێتەوە بۆ «یعلو» لە شیعری پێشوودا و «احزة»: جەمعی «حزیز» و بە مەعنا عەرزی سەختە.

«ثلبوت»: ناوی جێگایەکە.

«يَربَأ»: سەردەکەوێ.

«قفر»: خاڵی.

«مراقب»: جێگای دیدەوانی و ئێشك‌گرتن، بەڵام لێرەدا بە مەعنا جێگای بڵندە.

«آرام»: جەمعی «ارم»ە و بەو بەردانە دەڵێن کە لەسەر ڕێگایان هەڵیان دەنێن بۆوەی ڕێگای پێ بزانن.

دەڵێ: ماکەرەکە دەباتە سەر ئەو تەپۆڵکانە لە عەرزی سەخت و عەستەمی «ثلبوت»دا و دەچێتە سەرێ، لە کاتێکدا ئەو جێگایە خاڵی و خامۆشە. بەڵام لەو بەردانە دەترسن کە بۆ شارەزایی وەسەر یەك نراون و نێرەکەرەکە لە ترسی ڕاوچییان لە جێگای بەرز خەریکی ئێشك‌گرتنە مەبادا زەرەرێك بە ماکەرەکە بگا.

---

حَتّٰى إِذَا سَلَخَا جُـمَادىٰ سِـتَّةً　　جَزَءا، فَطَالَ صِيَامُهُ وَ صِيَامُهَا

---

«سلخا»: بە ئاخریان گەیاند.

«جمادی»: زستان.

«ستة»: شەش مانگ.

«جزءا»: ئەو نێر و مێیە لە ئاو خواردنەوە بە گیای تەڕ قەناعەتیان کرد.

«صیام»: لێرەدا مەبەست ئاو نەخواردنەوەیە.

دەڵێ: لەوێ مانەوە تا شەش مانگ زەمانی سەرما و سۆڵە بە سەرچوو. بەهار هات و لەو ماوەیدا ئاویان نەخواردەوە ئاو نەخواردنەوەکەیان توولی کێشا.

رَجَعا بِأَمْـرِهِمٰا إِلىٰ ذِي مِـرَّةٍ        حَصِدٍ وَ نُجْحُ صَرِيمَةٍ إِبْرٰامُهٰا

«رَجَعا»: ئەگەر لە «رجوع»ی بە مەعنا گەرانەوە بێ «با»ی «بأمـرِهما» بۆ تەعدییەیە. بەڵام ئەگەر بۆ حەواڵەکردن بێ ئەوە زائیدە.

«ذی مرة»: خاوەن عەزم و جەزمی بەقووەت.

«حصد»: مەحکەم.

«نجح»: بە ئاوات گەیشتن.

«صريمة»: عەزم و ئیرادە.

«إبرام»: مەحکەمکردن.

دەڵێ: لەپاش بە سەرچووی سارد و سەرمای زستانێ کاری خۆیان دایە دەست ئیرادەیەکی قەوی و چونە ئەو جێگایەی کە لەوەڕ و ئاوی لێیە.

وَرَمیٰ دَوابِرَهَا السَّفٰا وَ تَـهَيَّجَتْ        رِيحُ المَصٰايِفِ سَوْمُهٰا وَ سِهٰامُهٰا

«دوابر»: پاژنەی سمی حەیوانات.

«السَّفا»: دڕکی گیای «بەهیمی» کە وەك جۆ دەچێ.

«مصايف»: جەمعی «مصيف»، یەعنی هاوین.

«سوم»: هاتن و ڕابردن.

«سِهام»: گەرمای بەشیددەت.

دەڵێ: دڕکی گیای «بَهمی» دەئاسمانی هەڵچوو و بای هاوین هات و گەرما دەستی پێکرد و هەوا گەرم بوو پێویستی بە ئاو پەیدا بوو.

فَتَنٰازَعٰا سَبْطاً يَـطِيرُ ظِـلٰالُهُ     كَدُخٰانِ مُشْعَلَةٍ يَشُبُّ ضِرٰامُهٰا

«تنازَعا»: کێشایان.

«سبط»: تۆز و غوباری زۆر.

«مشُعلة»: ئاگری هەڵایساو.

«یشُبُّ»: داگیرسێ و بەرزەوە بێ.

«ضرام»: جەمعی «ضرم»، دەستەچیلەی ئاگر پێکردنەوە.

دەڵێ: لە ڕاکردن بۆ لای ئاو بە دوا خۆیاندا تۆز و غوبارێکی درێژیان ڕاکێشا وەك دووکەڵی ئاگرێك کە بە دەستەچیلەی وشکی ورد ئەو ئاگرە داگیرسابێ.

مَشْمُولَةٍ غُلِثَتْ بِنٰابِتِ عَرْفَجٍ     كَدُخٰانِ نٰارٍ سٰاطِعٍ أَسْنٰامُهٰا

«مشمولة»: سیفەتە بۆ «مشملة»، یەعنی بای شەماڵ لێیدا بێ.

«غلث»: تێکەڵ.

«نابت»: تەڕ و تازە.

«عرفج»: گیایەکە.

«اسنام»: جەمعی «سنام»، بەرز بوونەوەی بڵێسەی ئاگر.

دەڵێ: ئاگرێك کە بای شەماڵ لێی دابێ و تێکەڵاوی گیای تەڕی «عرفج» بووبێ، وەك دووکەڵی ئاگرێك کە لە لای سەرەوە ڕۆشن بێ.

فَمَضىٰ وَ قَدَّمَهٰا وَكٰانَتْ عٰادَةً     مِنْهُ إِذٰا هِيَ عَرَّدَتْ إِقْدٰامُـهٰا

«قدمّها»: پێشی خست.

«عرّدت»: ڕێگەکەی تەڕ کرد.

«إقدام»: پێشخستن.

دەڵێ: نێرەکەرەکە ماکەرەکەی وەپێش خۆی دا بۆ سەر ئاوەکە. هەر وەك عادەتی وایە لە ترسی ئەوەی دوا نەکەوی هەمیشە وەپێش خۆی دەدا.

فَتَوَسَّطا عُرْضَ السَّرِيِّ وَ صَدَّعا مَسْجُورَةً مُتَجاوِراً قُلّامُها

«عُرضَ»: ناحیە، لە لای.

«سري»: جۆگە ئاوێکی بچووك.

«صدع»: دڕاندن.

«مسجورة»: سەرچاوەی پڕ لە ئاو.

«قُلام»: گیایەکە.

دەڵێ: لە لای جۆگەلە ئاوێکی چووکەوە داخڵ بوون و چوونە ناو سەرچاوێکی پڕ لە ئاو و گیاوە، دڕیان پێداو چوونە ناوی کە پڕاوپڕ لە ئاو و گیای زۆری لە نەوعی «قلام» لە دەور و بەری ڕوا بوو.

مَحْفُوفَةً وَسْطَ الْيَراعِ يُظِلُّها مِنْهُ مُصَرَّعُ غابَةٍ وَ قِيامُها

«محفوفة»: وەك «مسجورة» سیفەتی سەرچاوەیە، واتە دەوران دەوری قامیشەلانە.

«يراع»: قامیش. زەمیری «منهُ» بۆ «يراع» دەگەڕێتەوە.

«مصرع»: واتە خستن، لە عەرزێ دان.

«غابة»: بێشە.

«قيام»: جەمعی «قائم»، واتە بە پێوە وەستاوە و زەمیرەکەی بۆ «غابة» دەگەڕێتەوە.

دەڵێ: ئەو سەرچاوە لە ناوەڕاستی قامیشەڵانێك واقیع بووە کە قامیشە بەلادا هاتووەکان و بەرزەکان سێبەریان لێ کردووە.

---

أَفَتِلْكَ أَمْ وَحْشِيَّةٌ مَسْبُوعَــةٌ خَذَلَتْ وَ هٰادِيَةُ الصِّوٰارِ قِوٰامُهٰا

---

«أَفتلك»: هەمزەکەی بۆ ئیستیفهامە و «تلك» ئیسمی ئیشارەی موفرەدی موئەنەسە و لە ئەسڵدا «تی» بووە وکافەکە بۆ خیتابە و لامەکە بۆ ئیشارە بۆ دوورە.

«وحشية»: واتە: مانگای وەحشی.

«مسبوعة»: دڕندەیەك ورگی بەچکەکەی دڕی بێ.

«هادية»: پیشکەوتوو، پێشڕەو.

«صوار»: مێگەلێك گاکێوی.

«خذلت»: لە هاوڕێکانی دواکەوتبێ.

دەڵێ: ئایا وشترەکەی من وەك ئەو ماکەرە دەچی؟ یان وەك مانگاکێوییەك کە بە هۆی وەدواکەوتنی گاکێوییەك کە لە پێشیەوە دەڕوا مێگەلەکەی بەجێ هێشتبێ و وەدوا گاکە کەوتبێ و دڕەندە بەچکەکەی خواردبێ و بەغاردان بگەڕێتەوە بۆ لێگەڕانی؟ دیارە مانگایەکی وا لەو حاڵەدا زۆر بە توندی بۆ دۆزینەوەی بەچکەکەی ڕادەکا. یەعنی وشتری شاعیر وەك ئەو بە گورجی دەڕوا.

خَنْساءُ ضَيَّعَتِ الْفَرِيرَ فَلَمْ يَـرِمْ     عُرْضَ الشَّقَائِقِ طَوْفُهَا وَ بُغَامُهَا

**«خنساء»**: مانگاكێوییەك كە لوتی بۆ دواوە گەڕابێتەوە لەگەڵ كەمێك بەرزی قەراغی لوتی كە هەموو گاكێوی لووتیان وایە.

**«فریر»**: بەچكە، جا بەچكەی مەڕ بێ، ئی بزن بێ، ئی مانگاكێوی بێ.

**«لم یرم»**: دەست هەڵناگری.

**«شقائق»**: واتە عەرزێكی بەرداوی لە بەینی دوو جێگای لم و خۆڵەپەتێدا.

**«طوف»**: گەڕان و ڕاكردن.

**«بغام»**: دەنگی نەرم و ناسك.

دەڵێ: مانگایەكی وەحشی لووت بڵند كە بـەچكەكـەی لە دەست داوە لە دەور و بەری بەردەڵانێك بە دوایدا ڕادەكا و دەناڵێنێ و بە سەرلێ‌شێواوی و بە توندی بەملا و ئەو لادا ڕادەكا.

لِـــمُعَفَّرٍ قَـهْدٍ تَـنَازَعَ شِـلْوَهُ     غُبْسٌ كَوَاسِبُ مَا يُمَنُّ طَعَامُهَا

لامی «لِمَعفَّر» موتەعەلیقە بە «فلم یرم»ی شیعری پێشەوە و «عفر»: بە مەعنا خاكە و «معفر» بە مەعنا لەسەر عەرز كەوتووە كە سیفەتی بەچكەی مانگای وەحشییە.

**«قهد»**: سپی.

**«شِلوه»**: ئەندام، یان باقی جەسەد.

**«غبس»**: گورگ، یان سەگ.

«كواسب»: واتە حەیواناتی ڕاوكەر.

«مَنّ»: قەتع.

دەڵێ: لەوەدواكەوتن و غاردان و ناڵاندنی لەبەر خاتری دینەوەی ئەو بەچكە ڕەنگ سپیەی كە لەسەر عەرز كەوتووە كە گورگانی ڕەنگ خۆڵەمێشی ڕاوكەر كە ئەندامەكانیان لەت لەت كردووە و لە بەینی خۆیاندا ڕایان كێشاوە.

وە ئەگەر مەبەست سەگی ڕاوكەر بێ، مەعنای واتە: دەڵێ: خاوەن سەگە ڕاوكەرەكان لەبەر ڕاوپێكردن خواردنیان دەدەنێ و برسیان ناكەن.

---

| | |
|---|---|
| صَادَفْنَ مِنْهَا غِرَّةً فَأَصَبْنَهَا | إِنَّ الْمَنَايَا لَا تَطِيشُ سِهَامُهَا |

«غِرَّة»: غەفڵەت.

«تطيش»: تەجاوەزكردن.

«المنايا»: قەزا و قەدەر.

«سهام»: جەمعی «سهم» بە مەعنا تیر.

دەڵێ: كە لە بەچكەكەی غافڵ بوو دڕندەكان فرسەتیان لێ هێنا و خۆیان گەیاندە بەچكەكەی و خواردیان. واتە هیچ شتێك بێ قەزا و قەدەر نابێ و كە خواش ئەمری پێ كرد سەبەبی بۆ پەیدا دەبێ و تیری قەزا بە هەدەر ناچێ و سەبەبی خواردنی بەچكەكەی غافڵبوونی دایكەكەی بوو.

---

| | |
|---|---|
| بَاتَتْ وَ أَسْبَلَ وَاكِفُ مِنْ دِيمَةٍ | يُرْوِي الْخَمَائِلَ دَائِماً تَسْجَامُهَا |

«**باتت**»: شەوی گوزەران.

«**أسبل**»: ـ ڕژا، جاری بوو.

«**واكف**»: بارین.

«**يروى**»: تێراو دەكا.

«**ديمة**»: بارانی بەردەوام.

«**خمائل**»: ڕملّی بە گیا داپۆشراو.

«**تَسجام**»: ڕژان و جاریبوونی ئاوی باران.

دەڵێ: شەوی گوزەران و بارانێكی زۆر بۆ ئەوەی كە خاكە ڕملاویيە گيا زۆرەكەی تێراو بكا و دايم ببارێ و ئاو جاری بێ دەستی بە باران كرد.

**يَعْلُو طَرِيقَةَ مَتْنِهَا مُـتَوَاتِـرٌ فِي لَيْلَةٍ كَفَرَ النُّجُومَ غَمَامُهَا**

«**طريقة متن**»: ئەو خەتە كە لە كلكييەوە ڕاكشاوە بۆ پشت مل.

«**متواتر**»: سيفەتی بارانە، واتە لەسەر يەك.

«**كفر**»: داپپۆشی.

«**غمام**»: هەور.

دەڵێ: ئەو شەوە تا بەيانی بارانی بەسەر پشتيدا باری و هەور ئەستێرەكانی داپۆشی بوو.

**تَجْتَافُ أَصْلاً قَالِصاً مُتَنَبِّذاً بِعُجُوبِ أَنْقَاءٍ يَمِيلُ هُيَامُهَا**

«تجتاف»: دەچیتە ناو زگ و دەروونەوە.

«اصل»: ڕەگ و ڕیشەی درەخت.

«قالص»: تێکەڵاو.

«متنبذ»: دەور و بەر و قەراغ.

«اعجوب»: جەمعی «عجب»ە واتە بن کلك. بن.

«نقا»: تەپۆڵکەی ڕمڵ.

«هیام». ڕمڵێك کە خۆی ڕانەگری و بێتە خوارێ.

دەڵێ: ئەو مانگایە چووە بن دارێکی تەنیای دوور لە داران کە لقەکانی تێك چڕژابوون و ئەو دارەش لە بن تەپۆڵکەیەکی لم بوو کە بە هۆی با و بارانە دەڕووخا و دەهاتە خوارێ.

واتە لەبەر سەرما و باران پەنای بردۆتە بەر ئەو بنداره، بەڵام لەبەر ڕووخانی لمەکە نە حەوایەوە.

وَ تُضِيءُ فِي وَجْهِ الظَّلَامِ مُنِيرَةً　　كَجُمَانَةِ الْبَحْرِيِّ سُلَّ نِظَامُهَا

«أضاء، أنار»: ڕووناکی.

«وجه الظلام»: ئەووەڵی تاریکی.

«جمانة»: مرواری ناو سەدەفی بەحری.

«سل»: هێندرابێتە دەر.

«نظام»: پەتی پێوەکردن.

دەڵێ: لە ئەووەڵی تاریکی شەودا دەدرەوشێتەوە و وڵات ڕووناك دەکاتەوە وەك مرواری سەدەفی دەریایی، یان وەك مرواری پیاوێکی مەلەوان کە لە بەحر

دەری هێنابێ و بە پەتیەوە کردبێ و پەتەکە پچڕابێ و کەوتبێتە خوارەوە.

یەعنی بەدەنی سپی گای وەحشی لە ئەووەڵی تاریکی شەوداکە دەجووڵێ و دەدرەوشـێتـەوە دەڵێی ئـەو دەنکـە مـرواریـیەیە کـە پـەتەکـەی پسـابێ و لە گەردنبەندەکەی جیا بوویێتەوە، کە لەسەر عەرز دەلەرێتو دەدرەوشێتەوە وایە.

---

**حَتّىٰ إِذٰا حَسَرَ الظَّلامُ وَ أَسْفَرَتْ　　　بَكَرَتْ تَزِلُّ عَنِ الثَّرىٰ أَزْلامُهٰا**

---

«حسر»: لاچوو.

«أسفار»: ڕووناك بوو.

«بكرت»: بەیانی زوو دەچیتەدەر.

«تَزِلُّ»: هەڵدەخلیستکێ.

«أزلام»: تیری بێپەڕ، بەڵام لێرەدا بە مەعنا دەست و پێی وەك تیرە.

دەڵێ: تا ئـەوە بـوو تـاریکی شـەو نەمێنـی و ڕۆژ ڕوونـاك وەبـێ و زوو لە جێگاکەی بێتە دەرێ و دەست و پێی لە گڵدا بخزێ، چونکە بارانـی شـەوێ تەڕی کردووە و خۆساوەتەوە.

---

**عَلِهَتْ تَرَدَّدُ فِي نِهٰاءِ صُعٰائِدٍ　　　سَبْعاً تُـؤاماً كـامِلاً أَيّـامُهٰا**

---

«علە»: جەزەع و فەزەع و داد و هاوار.

«تردد»: سەرگەردان و حەیران.

«نِهاء»: حەوز و گۆلاو.

«صعائد»: ناوی جێگایەك.

«سَبعاً»: حەوت شەو.

«تؤام»: جەمعی «تۆام» واتە دووقلوو، دوانە، جووتیلە.

دەڵێ: داد و هاواری کرد و سەرگەردان ما بە دوا بەچکەکەیدا حەوت شەو و حەوت ڕۆژ لەسەر یەك لە گۆلاو و حەوزی «صمائد»دا لە گەرمای هاویندا.

حَتَّىٰ إِذٰا يَئِسَتْ وَ أَسْحَقَ خٰالِقٌ　　　لَمْ يُبْلِهِ إِرْضٰاعُهٰا وَ فِطٰامُهٰا

«أسحَقَ»: وشك و چرچ.

«حالق»: مەمکی پڕ شیر.

«لم یبله»: زەمیرەکەی بۆ «حالق» دەگەڕێتەوە، واتە: مەمکی وشك و کۆن و چرچ نەکردووە.

دەڵێ: تا لە دۆزینەوەی بەچکەکەی خاتر جەم نەبوو مەمکە پڕ شیرەکانی وشکیان نەکرد بە شیر پێدان و لە شیر بڕینەوەی وشکیان نەکرد، بەڵکوو لە دەستدانی بەچکەکەی بوو بە هۆی وشککردنیان و لەوەڕ نەخواردنی.

فَتَوَجَّسَتْ رِزَّ الْأَنِيسِ فَرٰاعَهٰا　　　عَنْ ظَهْرِ غَيْبٍ وَ الْأَنِيسُ سَقٰامُهٰا

«تَوَجُّس»: گوێڕاگرتن.

«رِزّ»: سەدای پەنهان.

«أنیس»: خەڵك.

«راعها»: ئەویان ترساند.

«عن ظهر غیب»: غائیبانە، بە بێ ئەوەی خاوەنی دەنگەکە ببینێ.

«سقام»: دەرد و نەخۆشی.

دەڵێ: گوێی بۆ دەنگی نەهێنی خەڵك ڕاگرت و ئەو دەنگە نەهێنییە ئەوی ترساند بێ ئەوەی خاوەنی دەنگەکە ببینێ، چونکە خەڵك بۆ وی دەرد و ئافەتە.

واتە حەیوانی وەحشی بە چاوپێکەوتنی خەڵك وەك نەخۆش دوچاری سستی و ناڕەحەتی دەبێ.

---

**فَغَدَتْ كِلَا الْفَرْجَيْنِ تَحْسِبُ أَنَّهُ مَوْلَى الْمَخَافَةِ خَلْفُهَا وَ أَمَامُهَا**

---

«غدا» **بِهَمِّه عَنّا**: « أي صار»، واتە: وای لێ هات.

«كلا»: هەردوو.

«فرج»: جێگای ترس.

زەمیری «أنه» بۆ «كلا» دەگەڕێتەوە.

«مولى»: شایانی تر.

«مخافة»: بە قەولی ئەسمەعی مەبەست لە مخافة: سەگی ڕاو پێکردن و «مولى»: خاوەنەکانیانە.

دەڵێ: نەیدەزانی کە خاوەنی دەنگەکە لەکام لای ئەوە و زۆر ترسناك بوو. بەڵام زیاتر وایدەزانی کە ترسە لە لای پێش و پاشەوەیەتی و ڕێگای دەربازبوون و چاڵی هیلاك و لەناوچونی خۆی لێك نەدەکردەوە.

---

**حَتّٰى إِذٰا يَئِسَ الرُّمٰاةُ وَ أَرْسَلُوا غُضْفاً دَوٰاجِنَ قٰافِلاً أَعْصٰامُهٰا**

---

«غُضف»: سەگی گوێ هەڵخستوو.

«دواجن»: تەعلیم دراو.

«قافل»: وشك

«أعصام»: بەو قایشە دەڵێن کە لە ملی سەگی دەکەن.

دەڵێ: تا وەختێکی کە ڕاوچییەکان نائومێد بوون لەوەی تیری باوێژنێ، سەگە گوێ قوڵاخ و تەعلیمدراو و ناوقەد باریکەکانیان بەرهەڵداکرد و تێیان بەردان.

| فَلَحِقْنَ وَ اعْتَكَرَتْ لَهٰا مَدْرِيَّةٌ | كَالسَّمْهَرِيَّةِ حَدُّهٰا وَ تَـمٰامُهٰا |
|---|---|

«لحقن»: سەگەکان وە دوای کەوتن.

«اعتکرت»: گەڕایەوە.

«مدریة»: شاخی تیژ.

«سَمهریة»: بەو نێزە دەڵێن کە پیاوێکی «سمهر» ناوی خەڵکی دێیەکی بەحرەین دروستی دەکردن زۆر نێزەی چاك بوون.

دەڵێ: کاتێ سەگەکانی گەیشتێ بۆیان گەڕایەوە و بە شاخە تیژەکانی کە وەك نێزەی «سمهری» تیژ بوون پەلاماری دان.

| لِتَذُودَهُنَّ وَ أَيْقَنَتْ إِنْ لَـمْ تَـذُدْ | أَنْ قَدْ أَحَمَّ مِنَ الْحُتُوفِ حِمٰامُهٰا |
|---|---|

«ذود»: دوور خستنەوە.

«أحم»: نزیك بۆتەوە.

«حتوف»: واتە مەرگ و هیلاك.

«حمام»: مەرگ.

دەڵێ: بۆ ئەوەی کە دیفاع لە خۆی بکا و وەیانگێڕی و دەریان بکا. چونکە لێی یەقین بوو ئەگەر دەریان نەکا مەرگی نزیکە و ئەگەر دیفاعی نەکردایە تاژییەکان دەیانکوشت.

---

**فَتَقَصَّدَتْ مِنْهَا كَسَابِ فَضُرِّجَتْ    بِدَمٍ، وَ غُودِرَ فِي الْمَكَرِّ سُخَامُهَا**

---

«تقصدت»: کوشتی.

«کساب»: مەبنیە لەسەر کەسرە و ناوی تاژییەکە.

«ضرجت»: تێکەڵاوبوو.

«غودر»: تەرك کرا.

«مکرّ»: جێگای پەلاماردان و گەڕانەوە.

«سخام»: ناوی تاژییەکە.

دەڵێ: لەو تاژییانە «کساب»ی کوشت و خوێناوی بوو. وە لە شوێنی گەڕانەوەی «سخام» لە تاژییەکان بەجێ ما و لاشەی لەوێ کەوت.

---

**فَبِتِلْكَ إِذْ رَقَصَ اللَّوَامِعُ بِالضُّحَىٰ    وَ اجْتَابَ أَرْدِيَةَ السَّرَابِ إِكَامُهَا**

---

«رقص»: کەوتە حەرەکەوە.

«لوامع»: جەمعی «لامع»ە و لە «لمعان» و بە مەعنا درەوشانەوەیە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی سەرابە، واتە ئەو عەرزەی کە لە بەرتینی گەرما و تیشکی

ڕۆژ لە دوورەوەڕا وا دەزانی ئاوە.

**«اجتاب»**: لە «جوب»ە و بە مەعنا لەبەری کرد.

**«اردية»**: جەمعی «رداء»ە و بەو عەبا و جوبانە دەڵێن کە لەسەر لیباسەوە لەبەر دەکرێن.

**«إكام»**: کێوی بچووك.

دەڵێ: بە وشترێکی وا لەکاتی لەرین و درەوشانەوەی سەراب لە چێشتەنگاودا و زۆربەی تەپۆڵکەکانی پۆشاك و لیباسی سەرابیان پۆشی بوو، ئەمن سوار بووم و وەدواکارەکانی خۆم کەوتم.

حەڕەکەتی سەراب و پۆشینی کێوەکان کینایەیە لە شیددەتی گەرمای ئەو ڕۆژە کە خۆی و وشترەکەی لەکاتێکی وادا لە هاتوچۆ و حەڕەکەتدا بوون.

---

أَقْضِي اللُّبَانَةَ لَا أُفَرِّطُ رِيبَةً　　　أَوْ أَنْ يَلُومَ بِحَاجَةٍ لُوَّامُهَا

---

**«اللُّبانة»**: کار و حاجەت.

**«تفريط»**: درێخی و تەقسیر و کۆتاهی.

**«ريبة»**: شك و دوودڵی.

**«لوام»**: جەمعی «لائم»، یەعنی لۆمەکەر.

دەڵێ: نیازی خۆم دێنمە جێ و کۆتاهی ناکەم و جێگای شك ناهێڵمەوە، یان بە هۆی دوودڵی و دڵەڕاوکێ کاتی خۆم بە فیڕۆ نەداوە و درێخیم نەکردووە، مەگەر لۆمەکەران لە کارێکدا سەرزەنشتم بکەن.

واتە عەیب و تەقسیرم هەر ئەوەبێ کە لۆمەیان کردووم یان دەست لەو کارە هەڵگرم تا لۆمەم نەکەن.

أَوَ لَمْ تَكُنْ تَدْرِي نَوَارُ بِأَنَّنِي      وَصَّالُ عَقْدِ حَبَائِلٍ جَذَّامُـهَا

**«نوار»**: ناوی ژنێکە.

**«حبائل»**: جەمعی «حبالة»ە و لە ئەسڵدا بە مەعنا دوای ڕاوە، بەڵام لێرەدا بۆ عەهد و پەیمان بەکار براوە.

**«وصال و جذام»**: سیفەت موبالەغەی «وصل» و «جذم»ن و بە مەعنا: قەتعەنن.

دەڵێ: گەڕامەوە بۆ سەر یادی گەنجی و غەزەلگوتن و دەڵێ: ئایا «نەوار» نازانێ کە ئەمن توانای ویسال و دووریم هەیە و لەگەڵ هەرکەسێکدا وا ڕەفتار بکەم کە شایانی شانی بێ؟ لەگەڵ وەفادار بە عەهد و پەیمانم و لە جەفاکار دوور و بێزارم.

تَـرَّاكُ أَمْكِـنَةٍ إِذَا لَـمْ أَرْضَـهَا      أَوْ يَعْتَلِقْ بَعْضَ النُّـفُوسِ حِـمَامُهَا

**«تراك»**: سیفەتە موبالەغەی «ترك»ە.

**«امكِنَة»**: جەمعی مەکانە.

**«أَو»**: بە مەعنا «إلا»یە.

**«بعض النفوس»**: مەبەست خۆیەتی.

دەڵێ: زۆر تەرکی ئەو جێگایانە دەکەم کە لێیان شاد و بە کەیف و ڕازی نەبم. مەگەر مەرگ بگاتە سەرم و ئەمان و مۆڵەتم نەدا.

| بَلْ أَنْتِ لا تَدْرِينَ كَمْ مِنْ لَيْلَةٍ | طَلْقٍ لَذِيذٍ لَهْوُها وَ نِـدامُـها |
| --- | --- |

«طلق»: نەگەرم و نە سارد.

«ندام»: جەمعی «ندیم»ە بە مەعنا هاودەم.

دەڵێ: (لە خەبەردان ڕا دەڕۆم بۆ خیتاب و قسەکردن) ئەتۆ ئەی «نـوار» نازانی کە چەندین شەوی ئارام و بێدەردیسەر و ئازار و بەلەزەتم لەگەڵ هاوڕێ و هاونشینان گوزەراندووە.

| قَدْ بِتُّ سامِرَها وَ غايَةَ تاجِرٍ | وافَيْتُ إِذْ رُفِعَتْ وَ عَزَّ مُدامُها |
| --- | --- |

«بِتُّ»: شەوم گوزەراند.

«سامر»: قسەکەری شەو.

«غایة»: ئاڵای شەرابفرۆش کە بۆ ناسینی دوکانەکەی هەڵی دەدا.

«تاجر»: شەڕابفرۆش.

«وافیت»: هاتم.

«رُفِعَت»: هەڵکرا.

«مدام»: ئەو شەڕابەیە کە زۆر لە کوویەیدا وەمێنی.

دەڵێ: لەو شەوانەدا ناتیق و قسەکەری مەجلیسەکان خۆم بووم و زۆر جار کە ئاڵای شەرابفرۆشەکە هەڵکراوە چوومە وێو شەرابەکەی نایاب و گران قیمەت بووە.

لەو شیعرەدا بەیانی ناتیقی و بەخشین و خەرجی خۆی دەکا.

أُغْلِي السِّبٰاءَ بِكُلِّ أَدْكَنَ عٰاتِقٍ        أَوْ جَوْنَةٍ قُدِحَتْ وَ فُضَّ خِتٰامُهٰا

**«أغلي»**: لە «غلاء»ە، واتە بە گران دەیکرِم.

**«سباء»**: کرِین.

**«أدکن»**: واتە خیگە شەرابی مایل بە رِەشی.

**«عاتق»**: کۆن، یان خالیس.

**«جونة»**: کووپە شەرابی سەر بە قیرگیراو.

**«قدحت»**: لە کاسە کرابێ

**«فض»**: شکابێ.

**«ختام»**: مۆر.

دەڵێ: شەراب بە گرانی دەکرِم و پارەی زیادی پێ دەدەم بە هەخێگە شەرابێکی کۆن، یان شەرابی خالیس کە سەری بەقیر گیرابێ و مۆرەکەی لەسەر لابرابێ و دەپیاڵە کرابێ.

بِصَبُوحِ صٰافِيَةٍ وَ جَذْبِ كَرِينَةٍ        بِـمُوَتَّرٍ تَأْتٰالُهُ إِبْهٰامُهٰا

**«صبوح»**: هەر شتێك بەیانی زوو بخورێ، یان وەخورێ، بەڵام لێرەدا مەبەست شەرابی بەیانیانە.

**«کرینة»**: ژنی عوود لێدەر.

**«مؤتر»**: عوود.

**«اِئتِیال»**: لێرەدا بە مەعنا لێدانە.

دەڵێ: لەگەڵ خواردنەوە و بەسەرەوەنانی شەرابی خالیسی بەیانیان و عوودلێدانی ئەو کەنیزە کە عوود لێدەرە بەسەر پەنجەکانی، لەزەتم بردووە.

بَادَرْتُ حَاجَتَهَا الدَّجَاجَ بِسُحْرَةٍ    لِأُعَلَّ مِنْهَا حِينَ هَبَّ نِيَامُهَا

زەمیری «حاجتها» بۆ ئارەق دەگەڕێتەوە، واتە پێویستیم بەوە.

«دجاج»: لێرەدا کەڵەشێرە و مەبەست بانگدانیەتی.

«إعلال»: شەراب خواردنەوەی لەسەر یەك.

«نیام»: جەمعی «نائم»، یەعنی نوستووەکان.

دەڵێ: پەلە دەکەم لە وەدەستخستن شەراب لەپێش بانگدانی کەڵەشێری بەیانیدا تا لەسەر یەك بمدەنێ لەو کاتەیەدا کە خەڵك لە خەو هەڵدەستن.

وَ غَدَاةِ رِيحٍ قَدْ وَزَعْتُ وَ قِرَّةٍ    قَدْ أَصْبَحَتْ بِيَدِ الشِّمَالِ زِمَامُهَا

«وَزَعتُ»: مەنعمکرد و لامبرد.

«قِرَّة»: سەرما.

دەڵێ: ئای چەند بەیانی ڕۆژی سەرما و "با"کە جڵەوی بە دەست «با»ی شەماڵ بووە بە هۆی خواردنەوەی شەراب بەرگریم لێ کردووە.

یان وەك زەوزەنی دەڵێ: یان بەهۆی خواردنی گەرم بە گەلەکەم سەرمام لە کۆڵ کردنەوە.

وَلَقَدْ حَمَيْتُ الْحَيَّ تَحْمِلُ شِكَّتِي     فُرُطٌ وِشَاحِي إِذْ غَدَوْتُ لِجَامُهَا

**«شكة»**: سیلاح.

**«فرط»**: ئەسپی سووك و خۆشڕەو.

**«وشاح»**: شتێکە وەك گەردەنبەند کە ژنان وەخۆی دەخەن.

دەڵێ: ئاگاداری تائیفەکەم کردووە لە کاتێکدا کە ئەسپە توندڕەوەکەم چەکەکەمی هەڵگرتبوو، بەیانی زوو لەغاوەکەم وەك گەردەنبەند بە شانیدا دابوو. تا هەمیشە سوار و ئامادەی شەڕ لەگەڵ دوژمنان بم.

یان لەوانەیە مەعنای وابێ دەڵێ: هەمیشە لەباتی خشڵ و زیو، لەغاوەکەم بەشانیا داوە.

فَعَلَوْتُ مُرْتَقَباً عَلَىٰ ذِي هَبْوَةٍ     حَرِجٍ إِلَىٰ أَعْلَامِهِنَّ قَتَامُهَا

**«مُرتقب»**: جێگای بلندی ئێشکگرتن.

**«ذی هبوَة»**: کێوی خاوەن گەرد و تۆز و خاك.

**«حرج»**: زۆر تەنگ.

**«قتام»**: تۆز و خۆڵ.

دەڵێ: لەسەر کێوی خاوەن تۆز و خۆڵ و تەنگ کە تۆز و خۆڵەکەی دەگەیشتە سەر کێوان و ئاڵای دەستەی دوژمن، ئێشکم گرتووە.

حَتَّىٰ إِذَا أَلْقَتْ يَداً فِي كَافِرٍ     وَأَجَنَّ عَوْرَاتِ الثُّغُورِ ظَلَامُهَا

زەمیری «القت» بۆ ڕۆژ دەگەڕێتەوە بە قەرینەی بـای شـەو «و القاء يد»: یەعنی دەست پێکردن.

«کافر»: داپۆشەر، مەبەست پێی شەوە کە بە تاریکیی شت دادەپۆشی.

«أجنّ»: پەنهان و داپۆشی.

«عورات»: جێی ترس و ڕەخنەی دوژمن.

«ثغور»: جێگای ترسی ڕەخنەی دوژمن.

دەڵێ: تا کاتێك ڕۆژ خەریك بوو ئاوا ببێ و تاریکی شەو هەموو سەر حەد و جێگا مەترسییەکانی لە پێش چاو ونکرد، ئەمن خەریکی ئێشکگرتن بووم.

---

أَسْهَلْتُ وَ انْتَصَبَتْ كَجِذْعِ مُنِيفَةٍ      جَرْدَاءَ يَحْصَرُ دُوُنَهَا جُـرَّامُـهَا

---

«أسهلتُ»: هاتمە خوار بۆ دەشتایی.

«و انتصبت»: گەردنی بڵند کرد.

«جذع»: قەدی دارخورما.

«منیفة»: بڵند و درێژ.

«جرداء»: کملق و گەڵا.

«حصر»: تەنگە نەفەسی.

«جُرّام»: جەمعی «جارم» بەو کەسە دەڵێن کە خورما لێدەکاتەوە.

دەڵێ: وەختێك ڕۆژ ئاوا بوو شەو تاریك بوو لە سەنگەری ئێشکگرتنەکە هاتمە خوارێ بۆ سەرزەمینێکی نەرم و دەشت و هەموار و ئەسپەکەم گەردنی بەرز کردبۆوە دەتگوت دارخورمای بڵند و درێژە کە باغەوان دەستی بـەسەردا ڕاناگا.

—

رَفَّــعْتُهٰا طَـرْدَ النَّـعٰامِ وَ شـلَّهُ    حَتّىٰ إِذٰا سَخِنَتْ وَ خَفَّ عِظٰامُهٰا

«طرد»: هەستاندن و وەدوا ڕاوکەوتن.

«شلّ»: دوور خستنەوە و لێخوڕینی وشتر.

«سخنت»: گەرم بوو.

دەڵێ: هەڵم هەستاند و وەغارم نا وەك غاردانی «نەعامە»، واتە وشترمورغ، یان غاردانێك کە بتوانێ بگاتە «نەعامە»، تا ئەوەبوو لە ڕۆیشتنندا گەرم داهات و زۆر بە توندی غاری دا و ئێسقانەکانی سووك ببوون، دەتگوت دەفڕێ.

قَلِقَتْ رِحٰالَتُهٰا وَ أَسْبَلَ نَحْرُهٰا    وَ ابْتَلَّ مِنْ زَبَدِ الْحَمِيمِ حِزٰامُهٰا

«قلق»: بێ ئارامی و جووڵان.

«رحالة»: وەك زین وایە کە لە پێستی مەڕ یان لە خورییەکەی دروستی دەکەن تا بە کەڵکی هاتوچۆ بێ و قورس نەبێ.

«اسبل»: باراندی.

«زبد»: کەف.

«حمیم»: ئارەق.

«حزام»: تەنگە، قەیاسە.

دەڵێ: بەهۆی توندڕۆیشتنی کورتانەکەی تەکانی دەخوارد و ئارەقی بە سینگیدا دەهاتە خوارێ و تەنگەکەی بەهۆی کەفی ئارەقەوە خووسابوو.

تَرْقىٰ وَ تَطْعَنُ فِي الْعِنٰانِ وَ تَنْتَحِي     وِرْدَ الْـحَمٰامَةِ إِذْ أَجَـدَّ حَـمٰامُهٰا

«ترقی»: هەڵدەستێ و بۆڵای سەرەوە دەڕوا.

«تطعن فی العنان»: لەغاوەکەی ڕادەکێشێ و هەنگاوی توندی نا.

«انتحاء»: قەسدکردن.

«ورد»: چوونە سەر ئاو.

دەڵێ: ملی بەرز ڕادەگرێ و هەنگاوی گوشاد داوێ، وا دەڕوا دەڵێی کۆتری مێی تینووە، کۆترە نێرەکە وەپێش خۆی داوە و پەلەی لێ دەکا.

یان وەك کۆترێکی تینوو لە ناو دەستەیەك کۆتری توند فڕین دا.

وَ كَثِيرَةٍ غُـرَبٰاؤُهٰا مَـجْهُولَـةٍ     تُرْجىٰ نَوٰافِلُهٰا وَ يُخْشىٰ ذٰامُهٰا

«و کثیرة»: واوی «وکثیرة» بەدەلە لەبری «رُبَّ».

«نوافل»: جەمعی «نافلة» واتە بەخشش.

«ذام»: عەیب و لۆمە.

دەڵێ: فەخر دەکا بەگفتوگۆ و نیزاعێك کە لەگەڵ ڕەبیعی کوڕی زیاد لە مەجلیسی نوعمانی کوڕی مونزیری پاشای عەرەبدا کردی، کە چەندین ماڵ و مەنزڵ پڕ بوون لە عەرەب کە زۆربەیان یەکتریان نەدەناسی و چاویان لە عەتا و بەخششی پاشاو ترسی عەیبە و لۆمەکردنیش لە ئارادا بوو، کە لەو جێگایانەدا قسەی کردووە و دادی سوخەنوەری دا.

غُلْبٍ تَشَذَّرُ بِالذُّحُولِ كَأَنَّهَا جِنُّ الْبَدِيِّ رَوَاسِياً أَقْدَامُهَا

«**غلب**»: بە قەولی زەوزەنی: ئەشخاسی گەردن بەرز و قەوی.

«**تشذر**»: واتە هەڕەشەیان لە یەکتر دەکرد و ئامادەی شەڕ و پێکدادانن.

«**ذحُول**»: جەمعی «ذحل»ە، یەعنی کینە و تۆڵە.

«**البدی**»: جێگایەکە.

«**رواسی**»: یەعنی سابت.

دەڵێ: ئەو کەسانەی لەو مەجلیسانەدا بوون هەموویان مل قەوی و زۆر بلێ و ئامادەی شەڕ و دەعوا بوون کە یەکتریان بە ڕقەبەری و عەداوەت تەهدید دەکرد. وەك جینییەکانی «بدی»ن لە خۆڕاگری و بەردەوامی و حەریس لەسەر جەنگ و عەداوەتدا.

أَنْكَرْتُ بَاطِلَهَا وَ بُؤْتُ بِحَقِّهَا عِنْدِي وَ لَمْ يَفْخَرْ عَلَيَّ كِرَامُهَا

«**أنكرتُ**»: ڕەدم کردەوە.

«**بؤتُ**»: دانم پیا نا.

دەڵێ: دەعوا بەتاڵەکانیانم ئینکار کرد و دانم بە حەقەکانیاندا نا بە باوەڕ و دڵی خۆم و گەورە و پیاوماقوڵەکانیان فەخرفرۆشی و تەکەبوریان بەسەر مندا نەکرد.

لەوانەشە مەبەستی پێ ئەوە بێ بڵێ: قسەی حەقم قەبووڵ کردووە و ناحەقیشم ڕەد کردۆتەوە.

وَ جَزُورِ أَيْسَارٍ دَعَوْتُ لِحَتْفِهَا بِمَغَالِقَ مُتَشَابِهٍ أَجْسَامُهَا

«جزور»: مەڕ یان وشترێك كە سەر دەبڕێ.

«ایسار»: جەمعی «یسر»، واتە جەماعەتی قومارباز.

«مغالق»: تیری تیژ.

دەڵێ: زۆرم لەو وشترانەی كە بۆ وەی دەبوون قوماریان لەسەر بكرێ لە ماڵی تایبەتی خۆم بە قورعە لەسەر هاویشتنی دەرچوون و سەرم بڕیون بۆ هاوڕێ و میوانانم.

أَدْعُو بِهِنَّ لِعَاقِرٍ أَوْ مُطْفِلٍ بُذِلَتْ لِجِيْرَانِ الْجَمِيعِ لِحَامُهَا

زەمیری «بهن» بۆ «مغالق» دەگەڕێتەوە.

«عاقر»: نەزۆك.

«مطفل»: بەچكەدار.

«لحام»: جەمعی «لحم» واتە گۆشت.

دەڵێ: داوای تیرانم دەكرد بۆ كوشتنی وشتری نەزۆك و بەچكەدار و گۆشتەكەم بەسەر هەموو دۆست و هاونشینانندا دەبەخشیەوە، خاوەن عائیلە و سەڵتاندا.

فَالضَّيْفُ وَ الْجَارُ الْجَنِيْبِ كَأَنَّمَا هَبَطَا تَبَالَةَ مُخْصِباً أَهْضَامُهَا

«جنیب»: بێگانە.

«تبالة»: دۆڵێکی گیا زۆر و جێگا لەوەڕێکی زۆر چاکە لە «یەمەن».
«أهضام»: جەمعی «هضیم»، واتە عەرزی نەرم و هەموار.
دەڵێ: دراوسێی نزیك و میوانی بێگانە لە ماڵی مندا وەك لە کاتی بەهاردا چووبنە دۆڵی «تبالة» لە ڕووی خۆشگوزەرانییەوە.

---

**تَأْوِي إِلَى الأَطْنَابِ كُلُّ رَذِيَّةٍ  مِثْلِ الْبَلِيَّةِ قَالِصٍ أَهْدَامُهَا**

---

«تَأْوِي»: پەنا دەبا.
«أطناب»: جەمعی «طنب»: واتە تەناف.
«رذیة»: وشتری لەڕ و لاواز کە لە سەفەردا دوا دەکەوێ و مەبەست لێرەدا فەقیر و هەژارە.
«بلیة»: بە وشترێك دەڵێن کە لەسەر گۆڕی خاوەنەکەیان دەبەستەوە تا مردار دەبۆوە.
دەڵێ: پەنا بۆ تەنافی چادرەکەم دێنن تەواوی فەقیر و هەژار و بێوەژن بە هۆی نەداری و بێکار و کاسپیانەوە و لەبەر دەرگاکەی دەکەون، وەك وشتری بەستراوە لەسەر گۆڕی خاوەنەکەی.

---

**و يُكَلِّلُونَ إِذَا الرِّيَاحُ تَنَاوَحَتْ  خُلُجاً تَمُدُّ شَوَارِعاً أَيْتَامُهَا**

---

«تکلیل»: تاج لەسەرنانە، بەڵام لێرەدا بە دانانی شتێك لەسەر شتێکە.
«تناوح»: ـ ڕووبەڕووی دوو شتە لەگەڵ یەکتر.

«خُلج»: جەمعی «خليج» و بە مەعنا جەزب و ڕاکێشانە، بەڵام لێرەدا مراد پێی چۆمێکی چوکەڵەیە لە چۆمێکی گەورە، یا لە دەریایەك جیا دەبێتەوە.

«تمد»: زیاد دەبێ و درێژ دەبێ.

«شوارع»: جەمعی «شارع».

«أيتام»: جەمعی «يتيم».

دەڵێ: لە بن خێوەتی مندا فەقیر و هەژار و دراوسێ لەکاتی هاتنی بای موتەقابیلدا لە ئەووەڵی زستان و سارد و سەرمادا کاسەی پڕ لە خواردن و گۆشتا وەك چۆمێکی چوکەڵە کە کوتە گۆشت وەك تاج لەسەریان دیار بوو، ئەوەندەش زۆرە هەر تەواو نابێ و هەتیو لێی تێر دەخۆن.

---

إِنَّا إِذَا الْتَقَتِ الْمَجَامِعُ لَمْ يَزَلْ      مِنَّا لِـزَازُ عَـظِيمَةٍ جَشَّـامُهَا

---

«لزاز»: شیددەتی دوژمنی و بەو دارەش دەڵێن کە دەرگای پێ قایم دەکرێ.

«عظيمة»: ـ سیفەتە بۆ «خصومت»ی نەهێنی.

«جشام»: سیفەتە موبالەغەی «جشم» و بە مەعنا خۆڕاگرتن لە بەرامبەر کاری قورس و گراندا.

دەڵێ: لەنێو کۆمەڵگادا هەمیشە لەناو ئێمەدا کەسانێك هەن کە عەداوەت و دوژمنایەتی گەورەیان وەعۆدەی خۆیان گرتووە و دەست بۆ کاری خەتەرناك بەرن.

---

وَ مُقَسِّمٌ يُعْطِي الْعَشِيرَةَ حَقَّهَا      وَ مُغَذْمِرٌ لِحُقُوقِـهَا هَـضَّامُهَا

---

«مقسم»: دابەشکەری ماڵ و تاڵان.

«مغذمر»: واتە تووڕە بوو.

«هضّام»: واتە شکێنەر و زوڵمکەر، کەسێ لە مافی خۆی دەست هەڵگرێ لەبەر کەسێکی تر.

دەڵێ: هەمیشە لەناو ئێمەدا ڕەئیس وگەورەیەك هەیەکە تاڵان دابەش بکا و بۆ ئاگاداری لە حەق و ماڵی تائیفە تووڕە ببێ و دەست لە حەقی خۆی هەڵگرێ. وەیان هەرچی ئارەزووی لێ بێ بیکا و ئیختیاری تەواوی هەیە.

---

فَضْلاً وَ ذُو كَرَمٍ يُعِينُ عَلَى النَّدىٰ　　　سَمْحٌ، كَسُوبُ رَغَائِبٍ غَنَّامُهَا

---

«فضلا»: مەفعوولولهوە بۆ فیعلەکانی ڕابردوو.

«ندی»: سەخاوەت و بەخشش.

«رغائب»: جەمعی «رغبة»ە واتە پەسند کراو.

«غنّام»: کاسبکار و وەدەستخستن.

دەڵێ: ئەو جۆرە کارانە لە ڕووی گەورەیی و پیاوەتییەوە و بەبێ داواکردنی هیچ شتێك و بەخۆڕایی دەکا و خاوەن کەرەم و بەخشش و کاری پەسند و ئەخلاقی شایستە و فەرسەت لەدەست نادا بۆ کەسبی ئیفتیخارات و سەربەرزی و ناوی چاکە.

---

مِنْ مَعْشَرٍ سَنَّتْ لَهُمْ أَبَاؤُهُمْ　　　وَ لِكُلِّ قَوْمٍ سُنَّةٌ وَ إِمَامُهَا

---

«من معشر»: خەبەرە بۆ موبتەدای مەحزووف، واتە من لە قەومێکم.

«سنة»: ڕەسم و یاسا و ڕەوشت.

«اِمام»: پێشەوا.

دەڵێ: ئەمن یان ئەو ڕەئیس و گەورە ناوبراوەی ئێمە، لە جەماعەت و قەومێکین کە باب و باپیرانمان ڕێگا و ڕەسمی ژیانیان بەوان نیشانداوە و هەر قەومێك ڕەسم و یاسا و خووڕەوشت و پێشەوا و ئیمامێکیان هەیە کە وەدوای بکەون.

---

لَا يَطْبَعُونَ وَ لَا يَبُورُ فَعَالُهُمْ    إِذْ لَا يَمِيلُ مَعَ الْهَوىٰ أَحْلَامُهَا

---

«يطبع»: پیسی و ئالوودەیی بەدەنی و ئەخلاقی.

«بوار»: فەساد و هیلاکی.

«فعال»: فیعل و عەمەل و کار.

«احلام» ـ جەمعی «حلم» یەعنی عەقڵ.

دەڵێ: عەیب و عاریان نییە و کاری ناشایستە و هیچ و پووچ و بێهوودە ناکەن. لەبەر ئەوەی عەقڵیان لەدەست نەداوە و وەدوا هەوا و هەوەس نەکەوتوون.

---

فَاقْنَعْ بِمَا قَسَمَ الْمَلِيكُ فَإِنَّمَا    قَسَمَ الْخَلَائِقَ بَيْنَنَا عَلَّامُهَا

---

«اقنع»: ڕازی بە.

«مليك»: پاشا، مەبەس خوایە.

دەڵێ: کەواتە قانیع و ڕازی بە ئەی ئینسان ئـەی سـواڵکـەر، وە بـە قـەولی زەوزەنی ئەی دوژمن، بەوەی کە خوا بۆی داناوی، چونکـە زانـاتر بـە هـەموو شتێك ئەخلاق و ئەحواڵی تەقسیم کردووە لە بەینی ئێمەدا و ئـەوەی شـایانی شانی هەرکەسێك بێ ئەوەی داوەتێ.

وَ إِذَا الْأَمَانَةُ قُسِمَتْ فِي مَعْشَرٍ         أَوْفَىٰ بِأَوْفَـرِ حَـظِّنَا قَسَّـامُهَا

«معشر»: تاقم، گرۆ.
«أوفى»: بە تەوای مافی پێدان.
بێ لە «بأوفر»دا زائیدە.
«حظّ»: بەش.
دەڵێ: کاتێ ئەمانەت لەبەینی قەوم و جەماعتێکدا دابەش بکرێ، دابەش کەرەکەی ئێمە بەشی زۆرتر بۆ ئێمە دادەنێ، واتە ئێمە لە هەموو قەومێك زیاتر باوەڕمان پێ دەکرێ.

فَبَنَىٰ لَنَا بَيْتاً رَفِيعاً سَمْكُهُ         فَسَمَا إِلَيْهِ كَهْلُهَا وَ غُلَامُهَا

زەمیری «کهل» و «غلام» بۆ «عشیرة» دەگەڕێتەوە.
دەڵێ: خودای ئافەریدگار و دابەشکەری هەموو شتێك بۆ ئێمە خانوێکی لە شەڕەف و گەورەیی و ناوبانگ بە بەرز و بڵێـند دروست کـردووە کـە پـیر و گەنجی ئێمە بۆلای چوون و چوونە ناوی.

بەڵام ئەگەر ئەو شیعرە لەپێش شیعری هەشتاو و سێدا بێ زەمیری «لَنا» بۆ گەورە و سەروەری و عەشیرەت دەگەڕێتەوە. واتە بە فکر و تەگبیر و سیاسەتی خۆی بۆتە هۆی بوزورگەواری و سەروەری قەومەکەی.

وَ هُمُ السُّعاةُ إِذَا الْعَشِيرَةُ أُفْظِعَتْ     وَ هُمُ فَوارِسُها وَ هُمْ حُكّامُها

زەمیری «هم»: بۆ خزم و خانەوادەی شاعیر دەگەڕێتەوە.

«سعاة»: جەمعی «ساعی»یە واتە تێکۆشەر.

«افظاع»: واتە زۆر ناشرین و بێ‌تام.

«فوارس»: جەمعی «فارس»، واتە چابوك سوار و شاسوار، بەڵام لێرەدا مەبەست چەنگاوەر و سوارەی ئازا و دلێرە.

«حکام»: جەمعی «حاکم»، واتە قازی و دادوەر لە کێشاندا.

دەڵێ: ئەوان تیکۆشەر و زۆر کارکەرن، کاتێ بۆ تائیفە ناخۆشی و کارەساتێك ڕوو بدا، ئەوان مەردی مەیدانی عەشیرەتن و قازی و دادوەری هەموو نیزاع و کیشمەکێشن.

وَ هُمْ رَبيعٌ لِلْمُجاوِرِ فِيهِمُ     وَالْمُرْمَلاتِ إِذا تَطاوَلَ عامُها

«ربیع»: بەهار.

«مجاور»: دراوسێ.

«مرملات»: واتە ژنی بێ‌خۆراك و بێ‌نەفەقە، بێوەژن.

«تطاول»: واتە درێژەی کێشا.

دەڵێ: ئەوان بەهاری دراوسێکانی خۆیانن، واتە وەك بەهار دەبنە مایەی ژیان و ڕەونەقی حەیات بۆیان. یەعنی بەهاری بێوەژنی بێ نەفەقە لەو ساڵە درێژەدا کە مێردەکەی بمرێ و هیچی نەبێ خەرجی بکا و ژیانی ناخۆش بێ، بەهۆی ئەوانەوە ژیان دەبەنە سەر.

وَ هُمُ الْعَشيرَةُ أَنْ يُبَطِّئَ حٰاسِدٌ أَوْ أَنْ يَميلَ مَعَ الْعَدُوِّ لِئٰامُهٰا

لە **«أن يبطئ»** و **«أن يميل»**دا لە بەینی زانایانی بەسرە و کوفەدا ئیختیلاف هەیە، زاناکانی بەسر دەڵێن لە تەقدیردا «کراهیة أن یفعل»ە ـ واتە بەهۆی کەرەهاندن و بێزاری لە فلان کاردا و لەلای کوفیان یەعنی تا ئەو کارە نەبێیە. لەو شیعرەشدا مەتحی عەشیرەتەکەی دەکاو دەڵێ:

ئەوان لە بیر و باوەڕ و بۆچوون و ڕەئیدا یەکن، بە هۆی ئەوەیە کە بێزارن لە دەسیسە و پیلانی حاسیدان و مەیلی نەزانان بۆلای دوژمن، لە ترسی فیتنەیی بەدخواهان و فریوخواردنی کەسانی بێ عەقڵ و نەزان. چونکە عاقڵان و پیاو ماقووڵی عەشیرەت هەمیشە لە حیفزی یەکیەتی و هاوکاری عەشیرەتدا تێدەکۆشن و دووریان دەخەنەوە لە حەسەدی حەسوودان و دوژمنان.

# موعەللەقەی پێنجەم

«معلقەی» پێنجەم ئی عەمری کوڕی کولسوومە و لە ساڵی «٥٧٠» میلادیدا بووە و لە تائیفەی «تغلب»ە، کە باوکی گەورەی قەومەکەی بووە و دایکی کچی «مهلهل»ی برای «کُلیب»ی مەشهوورە. ئەو شاعیرە لەناو خانەوادیەکی خاوەن عیززەت و ڕیاسەت گەورە بووە و لە تەمەنی پازدە ساڵیدا بۆتە گەورەی قەومەکەی خۆی و لە موحاکەمەی بەینی تائیفەی توغلەب و بەکردا کە بە حزووری عەمری کوڕی هیندی پاشای «حیرە» کرا، ئەو نمایندەی تائیفەی «توغلەب» و وەکیلی دیفاعیان بوو. نمایندەی تائیفەی بەکریش حارسی کوڕی «حەلزەی» شاعیر بوو. جا لەبەر ئەوەی عەمر بەهۆی تەکەببور و خودپەسندی دەورانی گەنجی بە هۆی عەقڵ و سیاسەت و زەکاوەتی حاریسەوە شکستی خوارد و لەبەر ئەوەی کە هیچ مولاحەزەی مەقام و ئیحتیڕامی پاشایەتی دڵی مەلیکی «حیرە»ی نەکرد و دڵی شکاند خۆی و قەومەکەی لە مەجلیسەکە بە توڕەییەوە هەستان و ئەوە بوو بە باعیسی عەداوەت لە بەینی تائیفەی «توغلەب» و پاشایانی حیرە و لایەنگرانیان و وەزع و کارەساتی ناخۆش بۆ شاعیر.

بەشێك لەو موعەللەقە لە کاتی قەزاوەتەکەیدا دایناوە و ئەوی دی لە پاش کوشتنی پاشای حیرە دانراوە.

بەشێك لەو «معلّقه» ئەوەندە مەشهوور بووە کە تائیفەی بەنی «تـوغـلەب» بچووك و گەورەیان لەبەریان کردووە و بە دەنگ خوێندوویانەتەوە. ئەو «معلّقه» لە بەحری «وافر»ە و سەت و یەك شیعرە و قافیەی «نون»ە. لەلایەن زەوزەنی و تەورێز و چەند کەسێك شەرح کراوە و بە زمانی لاتینی و ئەڵمانی و ئینگلیسی و فەرانسەوی تەرجەمە کراوە.

أَلا هُبِّي بِصَحْنِكِ فَأَصْبَحِينا     وَ لا تُبْقِي خُمُورَ الْأَنْدَرِينا

**«الا»**: بۆ ئاگادارییە.

**«هُبّی»**: هەستە لە خەو.

**«صحن»**: پیاڵەی گەورە.

**«اصبحی»**: شەرابی بەیانیمان بدەیێ.

**«اندرین»**: گوندێك بووە لە شام.

دەڵێ: ئاگادار بە ئەی ساقی و لە خەو هەستە و بە پیاڵەی گەورە شەرابی بەیانیمان بدەیێ، بەڵام لە شەرابی «اندرین»مان بۆ تێکە، واتە ئەو بۆ خەڵکی دی هەڵنەگری و ئی دیکەمان بۆ تێکەی.

مُشَعْشَعَةٌ كَأَنَّ الْحُصَّ فِيهٰا     إِذٰا مَا الْمٰاءُ خٰالَطَهٰا سَخِينٰا

**«مشعشعة»**: ئاوێ تێکەڵاو کرابێ.

**«حُص»**: گیاییێکی گوڵ سوورە، وەك زەعفەران وایە.

**«سخینا»**: گەرم.

دەڵێ: لەو شەرابەمان بۆ بێنە کە ئاوی گەرمی تێ کرابێ و ڕەنگ سوور بێ وەك گوڵی سووری «حُص»ی تێ کرابێ لەگەڵ ئاوی گەرم. چونکە عادەتیان وابووە بە سەرمای زستان ئاوی گەرمیان دەشەراب کردووە جا خواردوویانەتەوە.

تَجُورُ بِذِي اللُّبٰانَةِ عَنْ هَوٰاهُ     إِذٰا مٰا ذٰاقَـهٰا حَـتّىٰ يَـلِينٰا

«جور»: واتە مەیل.

«اللبانة»: حاجەت.

«یلین»: نەرم دەبێ.

دەڵێ: ئەو شەرابە ئارەزوومەند لە هەوا و ئارەزووی دوور دەخاتەوە کاتێ لێی چێشت و بە خواردنەوەی وەها گەرم دادێن کە هیچ ناخۆشی و خەم و خەفەتێکیان لە دڵدا نامێنی و هەمووی لە بیر خۆیان دەبەنەوە.

---

تَرَى اللَّحِزَ الشَّحِيحَ إِذَا أُمِرَّتْ　　　عَلَيْهِ لِمَالِهِ فِيهَا مُهِينَا

---

«لحز»: کەمحەوسەڵە، چاوچنۆك.

«شحیح»: ماڵ خۆشەویست.

«أمرّت علیه»: لەسەری بگێڕن.

«فیها»: واتە لە خواردنەوەیدا.

«مُهین» بێ ئەرزش.

دەڵێ: ئەو شەرابە ئەوەندە خۆش و بە لەزەتە پیاوی کەمحەوسەڵە و ماڵخۆشەویست کاتێ لەو شەرابەی بدەنێ ماڵەکەی لەلا بێنرخ دەبێ و وەبەرچاوی نایە.

دەڵێ: لە دوا خواردنەوە ماڵی دنیامان وەبەر چاوی نایە بەخشندە دەبین.

---

صَبَنْتِ الْكَأْسَ عَنَّا أُمَّ عَمرٍو　　　وَكَانَ الْكَأْسُ مَجْرَاهَا الْيَمِينَا

---

دەڵێ: جامی شەرابەکەت گێڕایەوە ئەی دایکی عەمر نەتدا بە ئێمە، خۆ قاعیدەی گەڕانی جامی شەراب لەلای ڕاستەوە ڕایە و من لەلای ڕاستم. بەڵام ئەتۆ بەر خیلافی قاعیدە لەلای چەپەوە دەستت پێ کرد و جامە شەرابەکەت لەمن دوور خستەوە و موراعاتی سەرەی نۆبەت نەکرد.

وَ مٰا شَرُّ الثَّلاٰثَةِ أُمَّ عَـمْرٍو ‌ ‌ ‌ ‌ بِصٰاحِبِكِ الَّذِي لاٰ تَصْبَحِينٰا

دەڵێ: ئەی دایکی عەمری شەرابگێڕ! ئەو کەسەی کە شەرابت نەدایە لەو سێ کەسە خەراپتر نەبوو کە لە نێو هەمواندا شەرابت نەدا بەوی.

وَكَأْسٍ شَرِبْتُ بِبَعْلَبَكَّ وَ أُخْرىٰ ‌ ‌ ‌ ‌ فِـــي دِمَشْــقَ وَ قٰــاصِرِينٰا

دەڵێ: ئای کە تا ئێستا چەندین جامی شەرابم لە شاری «بعلبك»ی لوبنان و لە شاری «دیمشق» پایتەختی سوورییە و لە شاری «قاصرین» لە توونس خواردۆتەوە.

وَ أَنّٰا سَوْفَ تُدْرِكُنٰا الْمَنٰايٰا ‌ ‌ ‌ ‌ مُـــقَدَّرَةً لَـنٰا وَ مُـقَدَّرِينٰا

دەڵێ: ئەوە بزانە کە بەو زوانە دەکەوینە بەردەستی مەرگ و مەرگ بۆ ئێمە و ئێمە بۆ مەرگ دیاری کراوین و سەرنویشتی ئێمە مەرگە و نەخشەی بۆ کێشراوە.

| قِفِي قَبْلَ التَّفَرُّقِ يا ظَعِينا | نُخَبِّرْكِ الْيَقِينَ و تُخْبِرينا |
|---|---|

دەڵێ: ڕاوەستە تا لێت بپرسم ئەی یاری سەفەرکردوو تا پێت بڵێم ئەوەی بە سەرمدا هاتووە و ئەتۆش من ئاگادار بکەیەوە لە وەزعی ڕابردوو و حاڵی خۆت.

| قِفِي نَسْأَلْكِ هَلْ أَحْدَثْتِ صَرْماً | لِوَشْكِ الْبَيْنِ أَمْ خُـنْتِ الْأَمِـينا |
|---|---|

**«صرم»**: قۆناغ بڕین، کۆچکردن.

**«وشك»**: خێرایی، نزیکبوون.

**«بين»**: جیایی

دەڵێ وشترەکەت ڕاگرە و ڕاوەستە تا لێت بپرسم داخوا تەرکی خۆشەویستیت کردووە بە هۆی نزیکبوونەوەی کاتی جودایی؟ یان بەیاری وەفادار و ئەمین لە دۆستایەتیدا خەیانەتت کردووە؟

| بِيَوْمِ كَرِيهَةٍ ضَرْباً و طَعْناً | أَقَرَّ بِهِ مَوالِيكِ الْعُيُونـا |
|---|---|

**«كَرِيهة»**: یەکێکە لە ناوەکانی شەڕ.

**«اقر»**: ئاوی سارد.

**«موالي»**: ئامۆزا.

دەڵێ: ئاگادارت دەکەینەوە لە ڕۆژی ئەو شەڕە کە شیر و نێزەی زۆری تێدا بەکار هات و ئامۆزاکانت چاویان ڕووناك بۆوە و بە ئارەزووی خۆیان بە سەر دوژمندا سەرکەوتن.

یان «بێ»ی «بیوم» دەگەڕێتەوە بۆ «قفی» شیعری پێشەوە و دەڵێ: ڕاوەستە تا لێت بپرسم لەو ڕۆژە ناخۆشەی کە لە بەینی ئێمە و ئەهلی تۆدا شەڕی تێداکرا، جا نازانم داخوا تۆی گۆڕیوە یان نا؟

| وَ إِنَّ غَداً وَ إِنَّ الْيَوْمَ رَهْنٌ | وَ بَعْدَ غَدٍ بِـمٰا لٰا تَـعْلَمِينٰا |
|---|---|

دەڵێ: ڕۆژان لە ڕەهنی قەزا و قەدەردان و ئەو ڕۆ و بەیانی و دوو بەیانی لە گرەوی چەند کارەسات و بەسەرهاتێکدان کە نەدەتوانی خەبەر لە ڕابردوو بدەی و داهاتووش نادیارە.

| تُرِيكَ، إِذٰا دَخَلْتَ عَلىٰ خَلٰاءٍ | وَ قَدْ أَمِنَتْ عُيُونَ الْكٰاشِحِينٰا |
|---|---|

زەمیری فاعل لە «تریك»دا دەگەڕێتەوە بۆ «اَم عەمر»، وەك زەمیری «اَمِنَت».
**«خلاء»**: خەڵوەتی.
**«کاشح»**: دوژمن.
دەڵێ: ئەو ژنە بە تۆ نیشان بدا، ئەگەر لە جێگایەکی چۆڵ بچییە لای و لە چاوی بەدگۆیان و داخ لە دڵان ئەمین بێ، لەش و لارە جوان و قەڵەوەکەی وەك شایانە.

| ذِرٰاعَيْ عَيْطَلٍ أَدْمٰاءَ بِكْرٍ | هِجٰانِ اللَّوْنِ لَمْ تَقرَأْ جَنِينٰا |
|---|---|

«عیطل»: وشتری گەردن بڵند.

«ادماء»: ڕەنگ سپی.

«بکر»: وشترێك کە جارێك زابێ یان هەر نەزابێ.

«هجان»: سپی خالیس.

«جنین»: بچکە لە زگدا.

دەڵێ: باسکی قەڵە و گۆشتن وەك باسکی وشتری گەردن بڵندی سپی، کە تەنیا جارێك زابێ، یان هەر نەزابێ و ڕەنگ سپی خالیس کە بەچکەی لە زگدا نەبێ.

---

وَ ثَدْياً مِثْلَ حُقِّ الْعاجِ رَخْصاً     حَصاناً مِنْ أَكُفِّ الْلاّمِسِينا

---

«ثدي»: مەمك.

«حُق العاج»: کاسەیەکی بچووك کە لە قوتووی ئێسکی فیل دروستی ئەکەن.

«رخص»: نەرم.

«حصان»: ژنی پاك.

دەڵێ: مەمکی وەك قوتوی ئێسکی فیل سپی و خڕ و نەرم و کەس دەستی لێ نەدابێ. ئەوەندە تورت و لەدەستان خۆش بێ.

---

وَ مَتْنَيْ لَدْنَةٍ سَمَقَتْ وَ طَالَتْ     رَوادِفُها تَنُوءُ بِما وَلِينا

---

«لدنة»: سیفەتە بۆ «قامة»ی مەحزووف و موزافون ئیلەیهە بۆ «متنی».

«سمقت و طالت»: هەردوکیان بە مەعنا بڵندی.

**«روادف»**: کەفەڵ و ڕان.

**«ولین»**: لە «ولی» و بە مەعنا «نزیك».

دەڵێ: وەنیشان دەدا هەر دولای نەرم و بڵندی کە کەفەڵ و ڕانی قورسایی دەخەنە سەر ئەو جێگایە کە لێیانەوە نزیکە. واتە قامەتی بەرز و کەفەڵ و ڕانی قەڵەوی قورسایی دەخەنە سەر پێیان.

---

وَ مَأْكَمَةً يَضِيقُ الْبَابُ عَنْهَا　　وَ كَشْحاً قَدْ جُنِنْتُ بِهِ جُنُونَا

---

**«مأكمة»**: سەرڕان.

دەڵێ: وە ڕانێکی گەورە و قەڵە و کە توانای هەڵگرتنی نییە و ئەو تەنیشتانەی منیان شێت کردووە.

---

وَ سَارِيَتَيْ بَلَنْطٍ أَوْ رُخَامٍ　　يَرِنُّ خَشَاشُ حَلِيهِمَا رَنِينَا

---

**«ساریه»**: کۆڵەکە.

**«بلنط»**: ئێسکی فیل.

**«رخام»**: بەردی مەڕ مەڕ.

**«رنین»**: بانگکردن.

**«خشخشه»**: دەنگی چەك و وێککەوتنی شتی وشك.

دەڵێ: دووبارە دوو بەلەکی وەك دوو کۆڵەکەی «عاج» و «مەڕ مەڕ» کە خڕخاڵ وە دەنگیان دێنی.

فَمٰا وَجَدَتْ كَوَجْدِي أُمُّ سَقْبٍ أَضَلَّتْهُ فَرَجَّعَتِ الْحَنِينٰا

«وجد»: حوزن.

«سقب»: بەچکە وشتر.

«ترجیع»: هاتنی دەنگ.

«حنین»: نالّە و هاوار.

دەڵێ: ئەو وشترەی کە بەچکەکەی ون کردووە و دەستی کردووە بە نالّە و هاوار وەك من مەحزوون و غەمبار نییە بە هۆی جیابوونەوە و دووری لە یار.

وَ لٰا شَمْطٰاءُ لَمْ يَتْرُكْ شَقٰاهٰا لَهٰا مِنْ تِسْعَةٍ إِلّٰا جَنِينٰا

«شمطاء»: موو سپی.

«شقاء»: بەدبەختی.

«تسعة»: نۆ کوڕ.

«جنین»: لێرەدا بە مەعنا نێژراوە لە گۆڕدا.

دەڵێ: وە نە غەم و خەفەتی ئەو ژنە سەر سپییەی کە بەهۆی بەدبەختییەوە «نۆ» کوڕی لەگۆڕ ناون و یەکی بۆ نەماوەتەوە و هەموویان مردوون بە ئەندازەی غەم و خەفەتی منە.

تَذَكَّرْتُ الصِّبٰا وَاشْتَقْتُ لَمّٰا رَأَيْتُ حُمُولَهٰا أُصُلاً حُدِينٰا

«حمول»: جەمعی «حامل»، مەبەست وشتری مەعشووقەیە.

«اصل»: جەمعی «اصیل»، یەعنی لە دوا عەسر تا مەغریب.

«حدین»: بە دەنگ لێخوڕین.

دەڵێ: کەوتمە یادی خۆشەویستی و ئارەزووی دیداری یار، کاتێ لە ئێوارەدا چاوم بە وشترەکانی کەوت وشترەوانەکان بە گۆرانی گوتنەوە لێیان دەخوڕین.

---

فَأَعْرَضَتِ الْيَمَامَةُ وَ اشْمَخَرَّتْ          كَأَسْيَافٍ بِأَيْدِي مُصْلِتِينَا

---

«اعرض»: وەدیار کەوت.

«واشمخرت»: بڵند بوو.

«مصلت»: ڕاکێشەری شیر لە کالان.

دەڵێ: دێهاتی «یەمامە» وە دەرکەوتن لە پێش چاوی من بەرز دیار بوون وەك شیران بەدەستی ئەو کەسانەوە کە لە کالانەکانیان ڕاکێشابن.

---

أَبَا هِنْدٍ فَلا تَعْجَلْ عَلَيْنَا          وَ أَنْظِرْنَا نُخَبِّرْكَ الْيَقِينَا

---

«اباهند»: بریتییە لە عەمری کوڕی هیندی مەلیکی حیرە.

«انظرنا»: واتە سەبرمان لە سەر بگرە و مۆڵەتمان بدە.

دەڵێ: ئەی ئەبو هیند! پەلەمەکە و مۆڵەتمان بدە تا بە تەواوی باسی وەزع و شەرەفی خۆمت بۆ باس بکەم.

بِأَنَّا نُـورِدُ الرَّايَـاتِ بِـيْضاً      وَ نُصْدِرُهُنَّ حَمْراً قَدْ رَوَيْنا

دەڵێ: ئەو خەبەرە ڕاستەی کـە دەمـهەوێ پێت بـڵێم ئـەوەیـە: کـە ئێمـە ئاڵاکانمان بە سپی بردە مەیدانی جەنگ، بەڵام ئەوەنـدەیان خـوێنـی دوژمـن خواردۆتەوە سوور و تێراو بوون و بە سووری لە مەیدانی شەڕ دەیانگێڕینەوە.

«ئاڵاکانی تەشبیھ کردووە بە وشتر و خوێن بە ئاو».

وَ أَيَّـــامٍ لَـنا غُـرٍّ طِـوالٍ      عَصَيْنَا الْمَلْكَ فِيها أَنْ نَدِينا

«ایام»: کارەسات.

«غر»: جەمعی «اغر»، واتە: مەشهوور وەك ناوچاوانی ئەسپی سپی کە لە ناو هەموو ئەسپاندا دیارە.

«طوال»: جەمعی «طویل»، واتە درێژ.

«ملك»: تەخفیفی «مَلِك»ە.

زەمیری «فیها» دەگەڕێتەوە بۆ «ایام».

«أن ندینا»: تا ئیتاعە نەکەین.

دەڵێ: ئای کە تا ئێستا چـەندین بـەسەرهـات و کـارەسـات و ڕۆژگـاری درێژمان هەیە کە لەو ڕۆژگارانەدا سەرپێچیمان لە قسەکردنی مەلیك کردووە لە ترسی ئەوەی کە پیاوی کەس نەبین و بە قسەی کەس نەکەین.

وَ سَــيِّدِ مَـعْشَرٍ قَـدْ تَـوَجُّوهُ      بِتاجِ الْمُلْكِ يَحْمِي الْمُحْجَرِينا

«يحمي»: دەیپاراست.

«محجرين»: پەنادراوان.

دەڵێ: ئەی کە تا ئێستا چەندین پیاوی گەورە کە تاجی پاشایەتییان لەسەر نابوو کە دەیپاراست لە پەنابەران، ئێمە شکستمان پێ داون.

تَرَكْنَا الْخَيْلَ عٰاكِفَةً عَلَيْهِ مُقَلَّدَةً أَعِـنَّتَهٰا صُـفُونٰـا

«خيل»: ئەسپ.

«اعنة»: جەمعی «عنان»، یەعنی لەغاو.

«صفُون»: جەمعی «صافن». بەو ئەسپە دەڵێن کە لەسەر سێ پێ ڕاوەستێ و سەر سمی چوارەمی ڕاوەستێ.

دەڵێ: ئەومان کوشتووە و ئەسپەکانمان لەسەر ڕاگرتووە، لە حاڵێکدا کە ئەوسارەکانمان بە ملدا داون و لەسەر سێ پێ و نووکی سمی چوارەم ڕاوەستا بوون و ئێمە دەورەی جەنازەکەمان دابوو.

وَ أَنْزَلْنَا الْبُيُوتَ بِـذِی طُـلُوحٍ إِلَی الشّٰامٰاتِ تَنْفِي الْمُوْعِدِينٰا

«بيوت»: ماڵەکان.

«ذي طلوح»: ناوێ شوێنێکە لە وڵاتی شامدا.

«الموعد»: دوژمنەکان.

دەڵێ: لە «ذي طلوح» بەلای شامەوە، چادرمان هەڵداوە و دوژمنمان لەوێ وەدەر ناوە.

وَ قَدْ هَرَّتْ كِلَابُ الْحَيِّ مِنَّا وَ شَذَّبْنَا قَتَادَةَ مَنْ يَلِينَا

«هرّت»: وەڕین.

«شذّبنا»: دڕکەکانمان لابرد.

«قتاده»: گوێنی.

دەڵێ: سەگەکانی عەشیرەت پێمان دەوەڕین، لەبەر ئەوەی چەکدار بووین نەیاندەناسین. ئەو گوێنیانەی لێمان نزیك بوون پاکمان کردنەوە لە دڕك.

واتە دوژمنەکانمان بێ چەك و بێ دەسەڵات کرد، بۆ ئەوەی تا جارێکی دیکە نەتوانن کەس ئەزیەت بدەن و وەك گوێنی بێ دڕکمان لێ کردن.

مَتَىٰ نَنْقُلْ إِلَىٰ قَوْمٍ رَحَانَا يَكُونُوا فِي اللِّقَاءِ لَهَا طَحِينَا

«رحی»: موئەننەسی سەماعییە، واتە ئاش.

«طحین»: ئارد.

دەڵێ: هەر کاتێك ئاشی شەڕی خۆمان بۆلای هەر قەومێك بەرین لە بەرامبەر بوونی شەڕدا دەیانکەینە ئارد.

واتە ئێمە شەڕ لەگەڵ هەر کەسێکدا بکەین وردی دەکەین.

يَكُونُ ثِفَالُهَا شَرْقِيَّ نَجْدٍ وَ لَهْوَتُهَا قُضَاعَةَ أَجْمَعِينَا

«ثفال»: بەو پارچە، یان بەو چەرمە دەڵێن کە لەژێر بەرداشی ئاشدا ڕایدەخەن تا ئاردەکەی بکەوێتە سەر.

«لهوة»: بە ئەندازەی مستێك گەنم کە بە گەرووی ئاشیدا دەکەن.

دەڵێ: ئەو پارچەی کە لەژێر بەرداشی شەڕدا لەلای ڕۆژهەڵاتی نەجددا ڕادەخرێ و ئەو مستە گەنمەی کە لە گەرووی بەرداشەکەی دەکرێ، هەمووی تائیفەی «قضاعە» دەبێ.

---

نَزَلْتُمْ مَنْزِلَ الْأَضْيافِ مِـنَّا　　　فَأَعْجَلْنَا الْقِرىٰ أَنْ تَشْتُمُونا

---

«أضياف»: میوانەکان.

«قرىٰ»: ڕێزی لە میوان گرت.

«شتم»: قسەی ناشیرین.

دەڵێ: ئێوە وەك میوانان هاتن بۆلای ئێمە و لە ترسی ئەوەی کە مەبادا کە قسەی ناشیرینمان پێ بڵێن بە پەلە بەخێرهاتنمان کردن.

واتە ئێوە بۆ شەڕ لەگەڵ ئێمە هاتن و ئێمەش فەورەن بە کوشتار بەخێرهاتنمان کردن، بۆ ئەوەی نارازی نەبن.

---

قَرَيْناكُمْ فَعَجَّلْنا قِـراكُـمْ　　　قُبَيْلَ الصُّبْحِ مِرْداةً طَحُونا

---

«قريناكم»: میوانیمان کردن.

«مرادة»: یەعنی هیلاك.

«طحونا»: جمعی «طحن» واتە ئاش. مەبەست ئاشی ئینسان هاڕینە.

دەڵێ: زۆر بە پەلە پەزێراییمان لێ کردن کەمێك لە پێش بەیانیدا و شەڕێکی وردکەر و لەبەین بەرمان بۆ لای ئێوە هاویشت و هەموومان لەبەین بردن.

| نَعُمُّ أُنَاسَنَا وَ نَعِفُّ عَنهُم | وَ نَحْمِلُ عَنْهُمُ مَا حَمَّلُونَا |
|---|---|

**«نعمّ»**: هەموومان.

**«أناسنا»**: خەڵکی خۆمان

**«نعفّ»**: خۆمانمان پاراست.

دەڵێ: ئێمە لەگەڵ تەواوی خەڵکی خۆمان پیاوەتیمان کردووە و چاوی تەماعمان لە ماڵی ئەواندا نییە و هەرچی بیخەنە سەر شانی ئێمە قبووڵی دەکەین و باری پارازتن و مەخاریج و زەحەماتی ئەوانمان لەسەر شانی خۆمان داناوە.

| نُطَاعِنُ مَا تَرَاخَى النَّاسُ عَنَّا | وَ نَضْرِبُ بِالسُّيُوفِ إِذَا غُشِينَا |
|---|---|

**«نطاعن»**: بە نێزە شەڕ لەگەڵ یەك ئەكەین.

**«تراخی»**: دووركەوتەوە.

**«غشينا»**: نزیکمان کەوتن.

دەڵێ: ئەگەر دوژمن دور بێ بەنێزە شەڕی لەگەڵ دەکەین و ئەگەر حەملەشمان بکەنە سەر بە شیر لێیان دەدەین.

| بِسُمْرٍ مِنْ قَنَا الْخَطِّيِّ لُدْنٍ | ذَوَابِلَ أَوْ بِبِيضٍ يَخْتَلِينَا |
|---|---|

**«بِسمر»**: جار و مەجروور پەیوەندی بە «نطاعن»ی شیعری پێشەوەو «سمر» جەمعی «اسمر»ە و بە مەعنا گەنم ڕەنگە.

**«قنا»**: نێزە.

«**خطی**»: نـاوی بـەندەری بـەحرینە و بـەقسەی زەوزەنـی «سـمر» نـاوی پیاوێکی بەحرەینی بووە کە نێزەی چاکی دروست کردووە.

«**ذوابل**»: نێزە گەلی بارێك.

«**بیض**»: شیری سپی.

«**یختلین**»: زۆر تیژ، ئەیبڕن.

دەڵێ: بە نێزە دروستکراوەکانی بەندەری «حطی» بە دەستی «اسمر» ناوکە زۆر نەرم و باریك و بە شمشیری سپی بڕندە شەڕ دەکەین.

| | |
|---|---|
| كَأَنَّ جَمَاجِمَ الأَبْطَالِ فِيهَا | وُسُوقٌ بِالأَمَاعِزِ يَرْتَمِينَا |

«**جماجم**»: جەمعی «جمجمه»یە واتە کاسەی سەر.

«**ابطال**»: جەمعی «بطل» کە بە مەعنا بە هەدەر چوونە، جا لەبـەر ئـەوەی جەنگاوەر خوێن بە هەدەر دەدا پێی دەڵێن بەتەل.

زەمیری «فیها» دەگەڕێتەوە بۆ جەنگەکان.

«**وسوق**»: جەمعی «وسقه» و پێوانەیەکە.

«**اماعز**»: جەمعی «امعز»ە و بە مەعنا عەرزی بەرداوییە.

«**یرتمین**»: لە «رمی» و بە مەعنا هاویشتن.

دەڵێ: دەڵێی کۆمەڵە کاسەی سەری پاڵەوانان و جەنگاوەران لە مـەیدانـی شەڕەکان باری وشترانە کە لە ناو زەمینێکی بەرداویدا کەوتوون.

| | |
|---|---|
| نَشُقُّ بِهَا رُؤُسَ الْقَوْمِ شَقّاً | وَ نَخْتَلِبُ الرِّقَابَ فَتَخْتَلِينَا |

**«اختلاب»**: یەعنی بڕین بە داسی بێ دەدانە.

**«رقاب»**: گەردن.

**«اختلاء»**: بڕینی گیا.

دەڵێ: لەو مەیدانانەدا، وە یا بەو شمشێرانە سەری دوژمنان لەت دەکەین و درەو دەکەین و سەرەکانیان لێ دەبنەوە.

---

وَ إِنَّ الضِّغْنَ بَعْدَ الضِّغْنِ يَبدُو عَلَيْكَ وَ يُخْرِجُ الدّاءَ الدَّفِينا

---

**«ضغن»**: ڕق و کینە.

**«يبدو»**: دەست پێ ئەکا.

**«دەفینە»**: شاردراوە.

دەڵێ: دەڵێی ڕق و کینە لە دوای ڕق و کینە لەسەر ڕەنگ و ڕوخساری تۆ ئاشکرا دەبن و دەردی ناو دڵت دێنێتە دەر، واتە بوغز و کینە نەهێنی لە دڵ و دەروندا ئاخری ئینسان وادار بە تۆڵە ستاندنەوە دەکا و خۆی بۆ ڕاناگیرێ.

---

وَرِثْنَا الْمَجْدَ قَدْ عَلِمَتْ مَعْدٌ نُطاعِنُ دُونَهُ حَتّىٰ يَبِينا

---

دەڵێ: ئێمە شەڕافەت و کەرامەت و بوزورگەواریمان بە میرات بۆ هاتۆتەوە، خێڵی «مەعد» زانیویەتی. بە نێزە بەرگرییان لێدەکەین تا ئاشکرا ببێ.

---

وَ نَحْنُ إِذا عِمادُ الْحَيِّ خَرَّتْ عَنِ الْأَحْفاضِ، نَمْنَعُ مَن يَلِينا

---

«عماد»: کۆڵەکە و خانووی بڵند.

«خرت»: کەوت.

«عن الاحفاض»: واتە ئەو وشترەی کە شتی بێ نرخی ماڵەوەی لێ بار دەکەن.

دەڵێ: لە کاتی مەترسی و خەتەریداکە خێوەتەکانیان دەخەن و ڕا دەکەن، ئێمە لە خزم و دراوسێیان دیفاع دەکەین.

| | |
|---|---|
| نَجُدُّ رُؤَسَهُمْ فِي غَيْرِ بِرٍّ | فمٰا يَدْرُونَ مٰاذٰا يَتَّقُونٰا |

«جد»: بە مەعنا بڕین.

«بر»: تاعەت.

دەڵێ: سەریان دەبڕین بە هۆی نافەرمانییانەوە، یان بەبێ ئەوەی ڕەحمیان پێ بکەین. کەواتە ئەوان ناتوانن خۆیان لە هیچ بپارێزن، لە کوشتن، یان لە ئەسیرکردن، یان لەتاڵانکردن؟

| | |
|---|---|
| كَأَنَّ سُيُوفَنٰا فِينٰا وَ فِيهِمْ | مَخٰارِيقٌ بِأَيْدِي لٰاعِبِينٰا |

«مخاریق»: جەمعی «مخراق»ە، بەو گورزە دەڵێن کە لە پارچەی کۆنی دەوەنەوە. وە دووبارە بە شمشێری دارینی یاریکەرانیش دەڵێن.

دەڵێ: دەڵێی شیرەکانی ئێمە لە بەینی ئێمە و ئەواندا گورزی پەڕۆ و شیری دارن لە دەست یاریکەراندا. لە سورعەتی لێدان، یان بێ موبالاتی بەوان.

كَأَنَّ ثِيابَنا مِـنَّا وَ مِـنْهُمْ　　　خُضِبْنَ بِأُرْجُوانٍ أَوْ طُلِينا

«**خُضِبنَ**»: ڕەنگ کراون.

«**ارجوان**»: گوڵی ئەرخەوانە.

«**طلين**»: لە «طلی»ە و بە مەعنا قەتران بە بەدەنی وشتردا کردنە. بەڵام لێرەدا تێهەڵسوونە.

دەڵێ: وەك بڵێی لیباسی ئێمە و لیباسی ئەوان بە گوڵی سووری ئەرخـەوان ڕەنگ کراوە، یان ئەرخەوانیان پێدا کراوە. یەعنی بەهۆی کوشتاری زۆرەوە خوێن بە وانیشدا هەڵپەڕیوە.

إِذٰا مٰا عَيَّ بِالْإِسْنٰافِ حَـيٌّ　　　مِنَ الْهَوْلِ الْمُشَبَّهِ أَنْ يَكُونٰا

«**عيّ**»: عاجز بوو.

«**اسناف**»: وەپێش کەوتن.

«**المشبه**»: سەرسام.

دەڵێ: وەختێك گەلێك لە ترسی خەتەرێك کە چاوەڕوانیان دەکرد نەیانتوانی پێشڕەوی بکەن و عاجز بوون... . وەڵامەکەی لە شیعری دواوەدایە.

نَصَبْنٰا مِثْلَ رَهْوَةَ ذٰاتَ حَدٍّ　　　مُحٰافظَةً وَكُـنّٰا السّـٰابِقينٰا

«**رهوة**»: ناوی کێوێکە.

«**حد**»: تیژی و مەبەست قووەت و دەسەڵاتە.

دەڵێ: ئەو دەستە سوارانەی کە وەك کێوی «رهوة» لە بەرامبەر دوژمن ڕاوەستاون ئاگاداری دەکەین لەبەر خاتری شەرەف و ئابرووی خۆمان تا بەسەر دوژمندا سەرکەوین و لە سەفی پێشەوەدا شەڕ دەکەین، خەڵك کە لە ترسان ڕادەکەن، ئێمە بەخۆشییەوە بەرەو پیلی دەچین.

بِشُبَّانٍ يَـرَوْنَ الْـقَتْلَ مَـجْداً وَ شِيبٍ فِي الْحُرُوبِ مُجَرَّبِينَا

«شبان»: جەمعی «شاب»، واتە گەنج. جاڕ و مەجروور پەیوەندییان بە «سابقین»ەوە هەیە.

«شیب»: جەمعی «اشیب» واتە مووی سەری سپی بووە و مەبەست پیرە.

«مجرب»: تەجرەبە دیدە.

دەڵێ: سەرکەوتن و پێشکەوتنی ئێمە لە جەنگدا بە هۆی ئەو گەنج و لاوانەوەیە کە لە کوشتن و مەرگ ناترسن و فەخریشی پێوە دەکەن و بەهۆی پیرانەشەوەیە کە لە شەڕ و شۆڕدا تاقیکرانەوە و ئیمتیحانیان داوە.

حُدَيَّا النَّاسِ كُلِّهِمْ جَمِيعاً مُقَارَعَةً بَنِيهِمْ عَن بَنِينَا

«حدیا»: ئیسمە و لە سەر سیغەی «مُصَغَّر»ە وەك «ثریّا» و «حُمیا» و بە مەعنا داوای بەقووەت بوون و پاڵەوانی.

«مقارعه»: لێرەدا یەعنی جەنگ دیدە. بەڵام زەوزەنی بەشەڕ بە شمشێری مەعنا کردووە.

دەڵێ: ئێمە هەموو خەڵك دەعوەت دەكەین بۆ تاقیكردنەوەی جەنگ، یان بۆ ئەوەی ئیفتیخاراتی خۆمان نیشان بدەین لەگەڵ هەموو كەس حازریـن بـۆ لێكدانی یەكتر و دوورخستنەوەی كـوڕەكـانیان لە كـوڕەكـانمان، واتـە لەبـەر ئاگاداری لە كوڕەكانمان كوڕەكانیان دەكوژین، وەیا لە شەڕدا فـەرقـی بـەینی كوڕەكانی خۆمان لەگەڵ كوڕەكانی ئەوان ئاشكرا دەكەین.

| | |
|---|---|
| فَأَمَّا يَوْمَ خَشْيَتِنا عَلَيْهِمْ | فتُصْبِحُ خَيْلَنا عُصَباً ثُبِينا |

زەمیری «علیهم» بۆ «بنین» دووەم لە شیعری پێشوودا دەگەڕێتەوە.

«عُصَبٌ»: جەمعی «عصبة» كە دەگاتە مابەینی دە و چل نەفەر.

«ثبین»: واتە جەماعەت.

دەڵێ: بەڵام لە ڕۆژی مەترسیداردا لەسەر كوڕەكانمان، سوارەكانمان دەستە بە دەستە دەگەڕێن و لە هەموو گۆشە و كەنارێكدا دەست دەكەن بە دیفاع و ڕاونانی دوژمنان.

| | |
|---|---|
| وَ أَمَّا يَوْمَ لا نَخْشىٰ عَلَيْهِمْ | فـنُمْعِنُ غـارَةً مُـتَلَبِّبِينا |

«إمعان»: سورعەت و پەلە.

«تلبب»: لە خۆدانی ئەسلەحەی جەنگ.

دەڵێ: بەڵام ئەو ڕۆژەی كە ترسمان لێ نەبن، بەپەلە چەك هەڵدەگـرین و دەچین بۆ تاڵانكردنی ماڵی دوژمنان.

بِرَأْسٍ مِنْ بَنِي جُشَمِ بْنِ بَكْـرٍ    نَدُقُّ بِهِ السُّهُولَـةَ وَالْـحُزُونَـا

«رأس»: گەورە و سەروەر.

«سهولة»: جەمعی «سهیل» یەعنی عەرزێکی دەشت و پان و هەموار.

«حزون»: جەمعی «حزن»، واتە عەرزێکی سەخت و بڵند. ئەو دوو نەوعە عەرزە بریتییە لە ئەشخاسی لەسەرخۆ و تووڕە و بە دەسەڵات و بێ‌دەسەڵات.

دەڵێ: ئەو تاڵان و بڕۆیە بە سەرکردایەتی ڕەئیسی تائیفەی «بەنی جەشم»ی کوڕی بەکری ئەنجام دەدەین، کە بە وەسیلەی ئەوەوە دوژمن بێ‌دەسەڵات بێ، یان دەسەڵاتدار بێ لەبەینی دەبەین.

أَلَا لَا يَعْلَمُ الْأَقْوَامُ أَنَّـا    تَضَعْضَعْنَا وَ أَنَّا قَدْ وَنِينَا

«تَضعضَع»: شکستخواردن و زەبوونی و زەلیلی.

«ونی»: سستی و ئارامی.

دەڵێ: ئاگادار بە، خەڵك وانەزانن و وابیرنەکەنەوە کە ئێمە لە شەڕدا سستین و دەشکێین، لەبەر ئەوەی ئێمە قەت وانەبووین و لەو بارەوە ئێمە ناناسن.

أَلَا لَا يَـجْهَلَنْ أَحَـدٌ عَـلَيْنَا    فَنَجْهَلَ فَوْقَ جَهْلِ الْجَاهِلِينَا

«لا یجهلن»: بۆ نەهیە و بە مەعنا سەفاهەت و بێ‌عەقڵییە.

«جهل»ی: دووەم بە مەعنا جەزا و پاداشتە و هەر لەبەر هاوشکڵی وای

تەعبیر لێدراوەتەوە. وەك لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی شووڕادا دەفەرمووێ:
﴿وَ جَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٍ مِثْلُهَا﴾ لە جەزای کاری بەدی بەد گوتووە.

دەڵێ: ئاگادار بە و بزانە، کە هەر کەسێك کە بە ئێمە بڵێ بێ ئەقڵ و سەفیهن ئەوە زیاد لە ئەندازەی خۆی جەزرەبەی دەدەین.

| بِأَيِّ مَشِيئَةٍ عَمْرَو بنَ هِنْدٍ | نَكُونُ لِقَيْلِكُمْ فِيهَا قَطِينَا |
| --- | --- |

«قیل»: سوڵتان و گەورەی ژێر دەستی پاشا.

«قطین»: دارودەستەی پاشا.

دەڵێ: ئەی عەمری کوڕی هیندی! بە هۆی چ خواستێك و بە هۆی چ بەڵگەیەك ئێمە دەبینە خزمەتکاری ئەو ڕەئیسەی کە بۆ ئێمەت دیاری کردووە؟

| بِأَيِّ مَشِيئَةٍ عَمْرَو بْنَ هِـنْدٍ | تُطِيعُ بِنَا الْوُشَاةَ و تَزْدَرِينَا |
| --- | --- |

«بنا»: جارو مەجروور موتەعەلیقە بە «وشاة» و لێی وەپێش کەوتووە.

«وشاة»: جەمعی «واشی»، یەعنی ئەو کەسەی کە قسە دێنێ و دەبا.

«تزدری»: لە ئەسڵدا «تزتری» بووە تێی بابی «افتعال» کراوە بە دال، واتە ئێمە بە چاوی سووك تەماشا دەکەی.

دەڵێ: ئەتۆ چۆن سەبارەت بە ئێمە گوێ بۆ قسەی ئەو فیتنەچییانە ڕادەگری و ئێمە بە چاوی سووك تەماشا دەکەی، خۆ زەبوونی و خەراپەیەکت لە ئێمەوە چاو پێ نەکەوتووە، تا هەنگاوێکی وا باوێی.

| تَهَدَّدْنا وَ أَوْعِدْنا رُوَيْداً | مَتىٰ كُنّا لِأُمِّكَ مَـقْتَوِينا |
| --- | --- |

«روید»: یەعنی لەسەرخۆ و بە مولائیمی.

«مقتوی»: خزمەتکاری پاشا.

دەڵێ: دەست لە هەڕەشەکردن لە ئێمە هەڵگرە و ئارام و لەسەرخۆ بە، خۆ ئێمە قەت خزمەتکاری دایکت نەبوین، تا لێت بترسین.

| فَإِنَّ قَناتَنا یا عَمْرُو أَعْـیَتْ | عَلَى الْأَعْداءِ قَبْلَكَ أَنْ تَلِینا |
| --- | --- |

«قناة»: بە مەعنا نێزەیە و لێرەدا بۆ عیززەت و گەورەیی بەکار هاتووە.

«تلین»: نەرم بێ.

دەڵێ: ئاگادار بە، کە نێزەی ئێمە لە دوژمنانی پێش تۆدا قەت نەرم نەبووە، واتە عززەت و شەڕافەتی ئێمە لە بەرامبەر هیچ کەسدا زەلیلی قبووڵ نەکردووە و عەزم و ئیرادەی ئێمە لە جەنگدا لەگەڵ کەسدا سست نابێ.

| إِذا عَزَّ الثِّقافُ بِها اشْمأَزَّتْ | وَ وَلَّتْهُمْ عَشَـوْزَنَةً زَبُـونـا |
| --- | --- |

«ثقاف»: ئاسنێکە کە نێزانی پێ ڕاست دەکەنەوە.

«اشمازت»: بێزاری لێ دەردەبڕێ.

«عشوزنة»: سەخت و مەحکەم.

«زبون»: مل کەچ نابێ.

زەمیری «بها» و «اشمازت» و «ولت» دەگەڕێنەوە بۆ «قناة» لە شیعری پێشەوەدا.

دەڵێ: لە سەختی و پایەداری و عیززەت و شەڕافەتدا وەك ئەو نێزە واین کە بە هیچکەس و هیچ وەسیلەیەك ڕاست نابێتەوە و بە گازی وەستایان پشت نەوی ناکا و دوولا نابێتەوە. دیفاع لە بەقووەت بوون و سەختی خۆی نیشان دەدا.

---

عَشَوْزَنَةً إِذَا انْقَلَبَتْ أَرَنَّتْ    تَشُجُّ قَفَا الْمَثَقِّفِ وَ الْجَبِينَا

---

«انقلبت»: وەگەڕێ.

«أرنت»: بانگ بکا.

«تشج» ـ بریندارى دەکا.

«قفا»: پشت مل.

«مثقف»: نێزە ڕاستکەر.

دەڵێ: نێزەییێکی وا مەحکەم و سەرسەخت کە کاتێ هەڵگەڕێتەوە لەو کاتەدا کە تینی بۆ دێنن و خەریك دەبن دو لای بێننەوە دەنگی لێوە دێ و پشت و ناوچاوانی نێزە سازەکە بریندار دەکا.

---

فَهَلْ حُدِّثْتَ فِي جُشَمِ بْنِ بكْرٍ    بِنَقْصٍ فِي خُطُوبِ الْأَوَّلِينَا

---

«خطوب»: کار و ئەمرێکی گەورە.

دەڵێ: ئایا خەبەریان داوە بەتۆ دەربارەی تائیفەی «جشم»ی کوڕی بەکری کە لە کار و باری گرنگی پێشینیاندا ناتەواوێکیان هەبێ؟ وەك شکان لە شەڕدا و بێ عەهد و پەیمانی؟

| وَرِثْنا مَجْدَ عَلْقَمَةَ بْنَ سَيْفٍ | أَباحَ لَنا حَصُونَ الْمَجْدِ دِينا |
|---|---|

«ابن»: سیفەتی «علقمە»یە و موزافـون ئـیلەیهی مـەجدە و مـەجروور بـە فەتحەیە، چونکە غەیرە مونسەریفە.

«دین»: قەهر. وەك لە ئایەتی سوورەتی «الواقعە»دا دەڵێ، ﴿فَلَوْ لا إِنْ كُنْتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ﴾، واتە ئەگەر وەبەر قەهری خوانە کەوتوون خۆتان لە مردن ڕزگار بکەن.

دەڵێ: ئێمە مەجد و گەورەیی عەلقەمەی کوڕی یۆسـفمان بـە میرات بـۆ هاتۆتەوە کە چەندین قەڵاتی گەورەیی بە قەهر و غاڵبوون بۆ ئێمە فەتح کرد و بۆی بە ڕەوا زانین.

| وَرِثْتُ مُهَلْهِلاً وَ الْخَيْرَ مِنْهُ | زُهَيْراً نِعْمَ ذُخْرُ الذّاخِـرِينا |
|---|---|

دەڵێ: ئێمە واریس و میراتگری «مهلهل» و چاکتر لەویش ئی «زوهەیر»ین کە شەرەف و گەورەیی ئەو گەنجینە و خەزنەیەکە بۆ ئەو کەسانەی فەخر بە خۆیانەوە بکەن.

| وَ عَتّاباً وَ كُلْثُوماً جَميعاً | بِهِمْ نِلْنا تُراثَ الْأَكْرَمِينا |
|---|---|

دەڵێ: ئێمە میراتگری عەتاب و کولسوومین و بـەهۆی ئـەوانـەوە مـیراتـی بزورگەوارانمان بە دەست هێناوە و خاوەنی کاری چاك و فەخر پێوە کەرین.

وَذَا الْبُرَةِ الَّذِي حُدِّثْتَ عَـنهُ      بِهِ نُحْمىٰ وَ نَحْمِي الْمُحْجَرِينٰا

«بُرَة»: خرخاڵ و ئەو ئاڵقـەی کـە لە لووتـی وشـتر دەکـرێ. بـەڵام لێرەدا مەبەست پێی ئەو موانەیە کە وەك ئاڵقە لەسەر لووتی یەکێك لە پیاوانی بـەنی «تغلب» کە مەشهوور بوو بە «ذیالبرة».

دەڵێ: دووبارە ئێمە میراتگری گەورەیی ئەو پیاوەشین کە داستانی ئەویان بە چیرۆك گێڕاوەتەوە کـە لە ژێر سـێبـەری ئـیفتیخاراتـی ئـەودایـن و ئـاگـاداری پەناهندان دەکەین.

وَ مِنَّا قَبْلَهُ السَّاعِي كُلَيْبٌ      فَأَيُّ الْمَجْدِ إِلَّا قَدْ وَلِـينٰا

زەمـیری «قبله»: بـۆ «ذاالبـرة» دەگـەڕێتـەوە، و مـەبەست لە «کلیب»: «کلیب»ی وائیله.

«فأي المجد»: لەوانەیە ئەو جوملە لە مەعنادا «فما کان مجد» بێ، تا «إلا» بۆ ئیستیسنا بشێ.

دەڵێ: لە پێش ئەویشدا «کلیب» کە هەوڵی داوە بۆ کەرامەت و پیاوەتی هەر لە ئێمە بووە، وە هەر گەورەیی و پیاوەتییەك بووە ئێمـە لێی نـزیك بـووینـەوە و دەستمان بەسەردا گرتووە.

مَتىٰ نَـعْقِدْ قَـرِينَتَنٰا بِـحَبْلٍ      تَجُذِّ الْحَبْلَ أَوْ تَقِصِ الْقَرِينٰا

«قرينة»: بە وشترێك دەڵێن كە لەگەڵ وشترێكی دیكەوە بەستێن بەیەك گوریسەوە، ئەو خۆی ناگرێ و گوریسەكە دەپسێنی و ملی وشترەكەی دیكەش دەشكێنی.

واتە: ئەگەر قەومێك لە شەڕ و هەرادا داوای هاوتایی و هاوتەرازوویی ئێمە بكا ئەوە لە عەرزی دەدەین و ملی دەشكێنین.

---

وَ نُوجَدُ نَحْنُ أَمْنَعَهُمْ ذِماراً    وَ أَوْفاهُمْ إِذا عَقَدُوا يَـمِينا

---

«ذمار»: ـ ئەو شتەی كە ئاگاداری لەسەر خەڵك لازم بێ.

دەڵێ: ئێمە دەبینی كە لە هەموو كەس زیاتر ئاگاداری شەرافەت و حورمەت و ئابڕوو دەكەین و لە هەموو كەس لە پەیمان بردنە سەر و سوێندخواردندا بە وەفاترین.

---

وَ نَحْنُ غَداةَ أُوقِدَ فِي خَزازِي    رَفَدْنا فَـوْقَ رِفْـدِ الرّافِـدِينا

---

«أوقد»: ئاگری هەڵایساو.

«خزازي»: بەو كێوە دەڵێن كە لە بەیانی ڕۆژی تاڵان كردندا ئاگریان لەسەر دەكردەوە

«رفد»: كۆمەگ و یارمەتی.

دەڵێ: ئێمە لەو بەیانییەدا كە ئاگر لە كێوی خزازی كرایەوە لە هەموو كەسمان زیاتر یارمەتی قەومی تر دا لە شەڕكردن لەگەڵ خەڵكی «یەمەن».

| تَسُفُّ الـجِلَّةُ الْـخُورُ الدَّرِيـنٰا | وَ نَحْنُ الْحٰابِسُونَ بِذِي أَرٰاطیٰ |
|---|---|

«ذی أراطی»: ناوی جێگایەکە.

«تسف»: دەخوا.

«جلة»: وشترانی گەورە.

«خور»: جەمعی «خوارة»ە و بە مەعنا ئەو وشترانەیە کە گوانەکانیان شیریان زۆر تێدایە.

«درین»: گیای وشك کراوەکەی کۆن.

دەڵێ: ئێمە وشترەکانی خۆمان لە «ذی أراطی» حەپس کرد و ئاگامان لێبوون، ئەوانەی شیریان زۆر تێدا بوو گیای وشکیان دەخوارد، بۆ ئەوەی یارمەتی گەلەکەی خۆمان بدەین بەسەر دوژمندا.

| وَكٰانَ الْأَيْسَرِينَ بَنُو أَبِينٰا | وَ كُنّٰا الْأَيْمَنِينَ إِذٰا الْتَقَيْنٰا |
|---|---|

«أيمن»: ڕاست.

«التقينا»: گەیشتن بە ئێمە.

«أيسر»: چەپ.

دەڵێ: لە بەرخورد لەگەڵ دوژمندا ئێمە لەلای ڕاست و برادەرەکانمان لەلای چەپەوە شەڕمان دەکرد.

| وَ صُلْنٰا صَوْلَةً فِـيمَنْ يَـلِينٰا | فَصٰالُوا صَوْلَةً فِي مَنْ يَلِيهِمْ |
|---|---|

«**صال**»: هێرش، پەلامار.

«**یلي**»: نزیك کەوتەوە.

دەڵێ: برادەرەکانمان، کە بەنی بەکر بوون، حەملەیان کردە سەر ئەوانەی کە لێیان نزیك بوون و ئێمەش هجوومان کردە سەر ئەوانەی لە ئێمەوە نزیك بوون.

ئەوە ئیشارەیە بۆ ئەو شەڕەی کە لە بەینی نزار و یەمەندا ڕووی دا، لە کاتێکدا کە لەبیری کوڕی «عنق»ی «غسانی» لە لایەن پاشای «غسان»ەوە حاکمی «تغلب» بوو ژنەکەی خۆی کە خوشکی «کلیب»ی وائیل بوو شەقەزلەیەکی لێدا و «کلیب» کوشتی.

فَآبُوا بِالنِّهَابِ وَ بِالسَّبَايَا وَ أُبْنَا بِالْمُلُوكِ مُصَفَّدِينَا

«**نهاب**»: جەمعی «نهب»، واتە تاڵان.

«**أوب**»: گەڕانەوە.

«**مصفد**»: بستراوە و زنجیر کراو.

دەڵێ: بەنی بەکر بە تاڵان و ئەسیرانەوە گەڕانەوە و ئێمەش لەگەڵ مەلیکە زنجیر کراوەکان گەڕاینەوە.

إِلَيْكُمْ يَا بَنِي بَكْرٍ إِلَيْكُمْ أَلَمَّا تَعْرِفُوا مِنَّا الْيَقِينَا

«**إلیك**»: اسمولفیعلە و بە مەعنا بگرە و دوورەکەوە، بەڵام لێرەدا بە مەعنا دوورەکەوەیە.

«ألمّا»: «أ» هەمزەی ئیستیفهامە و «لم» حەرفی جازیمە و «ما» زائیدە. بەڵام «الما تعرفوا» واتە ئێستا نەتان زانیوەیە.

دەڵێ: دوور کەونەوە دوور، ئەی خێڵی بەنی بەکر، لە خەیاڵکردنی بەرامبەری لەگەڵ ئێمەدا، مەگەر شوجاعەت و جەنگاوەری ئێمەتان نەبیستووە؟

| أَلَمّا تَعْرِفُوا مِنّا وَ مِنْكُم | كَتائِبَ يَطَّعِنَّ وَ يَرْتَمِينا |
|---|---|

«کتائب»: جەمعی «کتیبة» و بە مەعنا دەستەیەك لە سپا.

«یطعن»: سیفەتی موزاریعە و جەمعی «مؤنث»ی غائیبی بابی ئیفتیعال و لە مەعنادا «تطاعن» و بۆ موشارەکەیە، یەعنی بەنێزە لە یەکتر دەدەن.

«یرتمین»: موزاریع جەمعی موئەنەسی غائیب لە بابی ئیفتیعال بۆ موشارەکە و بە مەعنا یەکتر تیرەباران دەکەن.

دەڵێ: مەگەر نەتزانیوە کە دەستەیەك لەشکەرچی ئێمە و ئێوە بە نێزە و تیر لە یەکتر دەدەن؟

| عَلَيْنَا الْبَيْضُ وَ الْيَلَبُ الْيَمانِي | وَ أَسْيافٌ يُقَمْنَ وَ يَنْحَنِينا |
|---|---|

«بیض»: جەمعی «بیضة»، یەعنی کڵاوی خود کە جۆرە کڵاوێکە بە زۆری لەشکەرچی لە سەری دەکەن.

«یلب»: پارچەیەکە لە ژێر کڵاوی خود لەسەری دەکەن.

«یقمن»: موزاریعی مەجهوول لە بابی ئەفعال بۆ جەمعی موئەننەسی غائیب یەعنی ئەوان ڕاست دەکەنەوە.

دەڵێ: ئێمە کڵاوی خودو «یلب»ی یەمانیمان لەسەر بوو شیرەکانیشمان بەهۆی زۆر وەشاندنیانەوە ڕاست دەبوونەوە و دوو لا دەهاتنەوە.

عَلَيْنا كُلُّ سابِغَةٍ دِلاصٍ  تَرىٰ فَوْقَ النِّطاقِ لَها غُضُونا

«**سابغة**»: زرێی تەواو گوشاد.

«**دلاص**»: بریقەدار.

«**نطاق**»: کەمەربەند.

«**غضون**»: جەمعی غضن، یەعنی قۆرت و پێچ.

دەڵێ: ئێمە زرێی گوشاد و بریقەدارمان لەبەردا بوو. کە لەسەر کەمەربەندەکانەوە قۆرت و پێچی ئاڵقەکانت دەدی بەهۆی گوشادی و داپۆشینی تەواوی بەدەنمانەوە.

إِذا وُضِعَتْ عَنِ الْأَبْطالِ يَوْماً  رَأَيْتَ لَها جُلُودَ الْقَوْمِ جُونا

«**لها**»: ئەسڵەکەی «لِلبسِها» بووە، واتە بەهۆی لەبەرکردنیانەوە.

«**جون**»: بە مەعنا ڕەش و سپی هاتووە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ڕەشە.

دەڵێ: ئەگەر ڕۆژێك ئەو پاڵەوانانە زرێکانیان داکەنن لە ئەسەری پۆشینی ئەو زرێیانەوە بەدەنیان بە ڕەشی دەبینی.

كَأَنَّ غُضُونَهُنَّ مُتُونُ غُدْرٍ  تُصَفِّقُها الرِّياحُ إِذا جَرَيْنا

«غدر»: جەمعی «غدیر» بە مەعنا گۆماو.

«تصفیق»: وەگەڕخستن.

دەڵێ: قۆرت و پێچی ئەو زرێیانە وەك سەری گۆڵاوانە کە «با» لەکاتی هاتنیدا دەیانلەرێنیتەوە خەت خەتیان دەکا.

**وَ تَحْمِلُنا غداةَ الرَّوْعِ جُرْدٌ عُرِفْنَ لَنا نَقائِذَ وَ افْتُلِينا**

«روع»: ترس و لەرز و مەبەست پێ شەڕە.

«جرد»: جەمعی «اجرد» و بە مەعنا توندڕۆ، یان بە مەعنا موو کەم و کورتە.

«نقائذ»: جەمعی «نقیذة» واتە نەجاتی بووە.

«افتُلِين»: مازی مەجهول، جەمعی موئەننەسی غائیب بابی ئیفتیعال لە «فلو»یە بە مەعنا لە شیر گیراوەتەوە.

دەڵێ: لە بەیانی ڕۆژی جەنگدا ئێمە سواری ئەسپی تێژڕەو یان ئەسپی کەم موو و کورت دەبین کە ئەو ئەسپانەی ئێمە ناوبانگیان دەرکردووە و تا ئێستا چەندین جار لەدەستی دوژمن ڕزگارمان کردوون و لەلای ئێمە بەچکەیان بووە.

**وَرَدْنَ دَوارِعاً وَ خَرَجْنَ شُعْثاً كَأَمْثالِ الرَّصائِعِ قَدْ بَلِينا**

«دوارع»: جەمعی «دارع» واتە زرێپۆش، بەڵام مەبەست پێی ئەو ئەسپانەیە کە بەرگی پارچەی ئاوریشمیان لەبەر کراوە.

«شعث»: جەمعی «أشعث» واتە موو ئاڵۆز و خۆڵاوی.

«رصائع»: جەمعی «رصیعة»، واتە گرێی لەغاو.

«بلین»: کۆن بوو.

دەڵێ: چوونە مەیدانی جەنگەوە لە کاتێکدا کە پارچەی ئاوریشمیان پێ دادرا بوو، کاتێ لە شەڕ گەڕانەوە موو ئاڵۆز و تۆزاوی دەتگوت لەغاوی کۆنن، واتە ئەوەندە ماندوو و هیلاك ببوون.

| | |
|---|---|
| وَرِثْناهُنَّ عَنْ آباءِ صِدْقٍ | وَ نُورِثُها إِذا مُـتْنا بَـنِينا |

«ورثناهن»: بە میراتمان گرت.

«آباء صدق»: باوکە ڕاستوێژەکان.

دەڵێ: ئەو ئەسپانەمان لە باوکانێکی ڕاستگۆ و دروستکار بە میرات بۆ بەجێ ماوە، کاتێ ئێمەش مردین بە میرات بۆ کوڕەکانمانیان بەجێ دێڵین.

واتە ئەسپی خانەزاد و قەدیمی خۆمانن.

| | |
|---|---|
| عَلىٰ آثارِنا بِيضٌ حِسانٌ | نُحاذِرُ أَنْ تُقَسَّمَ أَوْ تَهُونا |

«بیض»: جەمعی «بیضاء»، واتە ژنانی سپی.

«حسان»: جەمعی «حسناء»، واتە جوان.

دەڵێ: لە پشت سەری خۆمانەوە لە شەڕدا ژنانی سپی پێست و ڕوخسار جوانمان هەن، لەوە دەترسێن ئەسیر بکرێن و دابەش بکرێن، یان ئیهانەتیان پێ بکەن، جا لە ترسی ئەسیرکردنیان و ئیهانەت پێکردنیان ئێمە خۆمان فیدا دەکەین و لە شەڕدا بەردەوام دەبین.

أَخَذْنَ عَلىٰ بُعُولَتِهِنَّ عَهْداً　　إِذٰا لاقَوْا كَـتٰائِبَ مُـعْلِمِينٰا

«بعولة» یا «بعول»: جەمعی «بعل» یەعنی مێرد.

«معلم»: خاوەن عەلامەت و نیشانە، بۆ ناسینەوەیان لە مەیدانی جەنگدا نیشانەیەکیان وەخۆ دەخست.

دەڵێ: ئەو ژنانە عەهد و پەیمانیان لە مێردەکانیان وەرگرتووە کە بەرخورد لەگەڵ دەستەی لەشکرچی نیشانەدار چاك شەڕ بکەن و پایەدار و خۆڕاگر و فیداکار بن.

لَـيَسْتَلِبُنَّ أَبْـدٰاناً وَ بَـيْضاً　　وَ أَسْرىٰ فِي الْحَدِيدِ مُقَرَّنِينٰا

«اِستلاب»: ڕفاندن، لام جوابی قەسەم و فیعلەکە موئەکەدە بە نوونی تەئکیدی سەقیلە و ئەو شیعرە مەعنای پەیمان و سوێندی شیعری پێشەوەیە.

دەڵێ: ئەو ژنانە لە مێردەکانی خۆیان پەیمانیان وەرگرتووە و سوێندیان داون کە ئەسپ و زرێ و ئەسیری دوژمنان پێکەوە زنجیر بکەن لە دوژمنانیان بفرێنن.

تَرٰانٰا بٰارِزِينَ وَ كُلُّ حَيٍّ　　قَدِ اتَّخَذُوا مَخٰافَتَنٰا قَرِينٰا

«بارز»: دەشتی کاکی بە کاکی کە هیچ پەناگایەك و کێوێکی لێ نەبێ.

دەڵێ: ئێمە دەبینی لە جێگایەکی بێ پەناگاین، بەڵام هەرگەلێك دەبینی لە ترسی ئێمە پەناگایەکیان بۆ خۆیان دیاری کردووە، واتە ئێمە باوەڕمان بە

شوجاعەت و قووەت و ئازایەتی و دلێری و سەرکەوتنی خۆمان هەیە و بە بێ ترس و خۆشاردنەوە لە دەشتێکی پان و بەریندا و بە ئاشکرا خەریکی موبارەزەین.

| | |
|---|---|
| إِذٰا مٰا رُحْنَ يَمْشِينَ الْـهُوَيْنٰا | كَمَا اضْطَرَبَتْ مُتُونُ الشّٰارِبِينٰا |

«هوینا»: تەسغیری «هونیٰ» مـوئـەننەسی «اهـون» و بـە مـەعنا نـەرمـی و لەسەرخۆ و ئارامی.

دەڵێ: ئەو خانمانەی کە لەگەڵ ئێمە لە جەنگدا حازرن، کاتێ کە بە رێگادا دەڕۆن زۆر لەسەرخۆ و بە ئارامی دەڕۆن بە هۆی قەڵەوی و قورسی بەدەنیانەوە. وەك ڕۆیشتن و لارەلاری سەرخۆشان کە پشتیان لە ڕۆیندا دەلەرێتەوە.

| | |
|---|---|
| يَقُتْنَ جِيٰادَنٰا وَ يَقُلْنَ لَسْتُمْ | بُعُولَتَنٰا إِذٰا لَـمْ تَـمْنَعُونـٰا |

«یقتن»: لەوەڕیان دەدەنێ.

«جیاد»: ئەسپی توندڕەو.

دەڵێ: ئەو ژنانە ئەسپەکانمان دەلەوەڕێنن و دەڵێن: ئەگەر ئاگاو لە ئێمە نەبێ بەمێردی خۆمانتان نازانین، واتە ئەگەر لە بە ئەسیرگـرتـنمان و عـەیب و عـار بەسەر داهێنانمان نەپارێزن.

| | |
|---|---|
| ظَعٰائِنُ مِنْ بَنِي جُشَمِ بْنِ بكْرٍ | خَلَطْنَ بِمِيسَمٍ حَسَباً وَ دِيـنا |

«میسم»: لە «وسام» و بە مەعنا حوسن و جەماڵ.

«حسب»: قەدر و شەرەف و گەورەیی باب و باپیرانیان پێکەوە کۆکردۆتەوە.

دەڵێ: ئەو ژنە کەژاوە نشینانەی خانەدانی وائلی کوڕی جوشەمی کوڕی بەکری، جوانیان لەگەڵ خووڕەوشتی باش و شەڕەف و نامووس و دین تیکەڵ کردۆتەوە. واتە جەماڵی سووڕەت و جوانی سیرەتیان هەیە.

وَ مٰا مَنَعَ الظَّعٰائِنَ مِثْلُ ضَرْبٍ     تَرىٰ مِنْهُ السَّوٰاعِدَ كَالْقُلِينٰا

«قلین»: هەلووك بەلووکی منداڵان.

دەڵێ: هیچ شتیك وەك دەستپەڕاندنی دوژمنان بەرگری لە ئەسیرکردنی ئەو ئافرەتانە ناکا کە وەك هەلووکێنی منداڵان دەستیان بە حەوادا دەفڕێ.

كَأَنّٰا وَ السُّیُوفُ مُسَلَّلاٰتٌ     وَلَدْنَا النّٰاسَ طُرّاً أَجْمَعِینٰا

«مسلل»: لە کالان هاتۆتە دەر.

«طرّ»: هەموو.

دەڵێ: کاتێ کە شمشێر لە کالان ڕادەکێشرێن لە گەرما و گەرمی شەڕدا دەڵێن: تەواوی خەڵك لە نەسل و ئەولادی ئێمەن، واتە ئێمە وەك باوکیانین.

یُدَهْدُونَ الرُّؤُوسَ كَمٰا تُدَهْدِي     حَزٰاوِرَةٌ بِأَبْطَحِهٰا الْكُرِینٰا

«دهده»: واته هەڵی سووڕاند.

«حزاورة»: جەمعی «حزور» یەعنی منداڵێکی بە قووەت.

«أبطح»: عەرزێکی هەموار و نەرم.

«کرین»: جەمعی «کورة» واتە گۆ.

دەڵێ: جەنگاوارەکانی ئێمە سەری دوژمنان دەپەڕێنن، هەر وەك منداڵانی بەتوانا لە جێگایەکی نەرمان و دەشت گۆیان و تۆپان هەڵدەسووڕێنن.

| | |
|---|---|
| وَ قَدْ عَلِمَ الْقَبائِلُ مِنْ مَعَدٍّ | إِذا قُـبَبٌ بَأَبْـطَحِها بُـنِينا |

«قبب یا قباب»: جەمعی «قبە» یەعنی چادر و خێوەت.

دەڵێ: خێڵی «معد»ی دەزانن کە کاتێ لە جێگایەکی دەشت و هەموار چادر هەڵدران... وەڵامەکەی لێرە بە دواوە دێ.

| | |
|---|---|
| بِأَنَّ الْمُطْعِمُونَ إِذا قَدَرْنا | وَ أَنَّا الْمُهْلِكُونَ إِذَا ابْتُلِينا |

دەڵێ: ئەگەر بەسەر دوژمندا سەرکەوتین ئەوە نـان و چـێشت دەدەیـن بـە خەڵك و زۆریان ڕێز لێدەگرین و ئەو کەسانەش بە هیلاك دەبەین کە ئێمە لە جەنگدا تاقی دەکەنەوە.

| | |
|---|---|
| وَ أَنَّا الْمانِعُونَ لِما أَرَدْنـا | وَ أَنَّا النّازِلُونَ بِحَيْثُ شِينا |

«شینا»: ئارەزوومان لێ بێ، بمانەوێ.
دەڵێ: ئێمە هەرچی ئارەزوو بکەین مەنعی دەکەین و بۆ هەر جێگایەك ئارەزوومان لێ بێ دەچین.

وَ أَنَّا التّارِکُونَ إِذٰا سَخِطْنٰا        وَ أَنَّا الآخِذُونَ إِذٰا رَضِینٰا

دەڵێ: هەر کاتێك تووڕە بووین دەڕۆین و لە هەر کەسێکیش ڕقمان هەستا هیچی لێ قبووڵ ناکەین و وەردەگرین ئەگەر دڵخۆش بین.

وَ أَنَّا الْعٰاصِمُونَ إِذٰا أُطِعْنٰا        وَ أَنَّا الْعٰازِمُونَ إِذٰا عُصِینٰا

«عاصم»: نیگابان، چاودێر.
«العازم»: تۆڵە سێن.
دەڵێ: ئێمە نیگابانی گەورەکانی خۆمان دەکەی و تۆڵەش لەو کەسانە دەکەینەوە کە سەرپێچی دەکەن و فەرمان بەڕێوە نابەن.

وَ نَشْرَبُ إِن وَرَدْنَا الْمٰاءَ صَفْواً        وَ یَشْرَبُ غَیْرُنٰا کَدِراً وَ طِینٰا

دەڵێ: ئەگەر چووینە سەر ئاوێك ئاوەشیرین و زوڵاڵ و ڕوونەکە دەخۆینەوە خەڵکی دیکە ئاوە لیڵ و قوڕاوییەکە دەخۆنەوە.
یەعنی لەبەر ئەوەی ئێمە سەروەر و بە دەسەڵاتین باشترینی هەموو شتێك دەبەین و نۆرەی یەکەم بۆ خۆمانە.

أَلا أَبْلِغْ بَنِي الطَّمّاحِ عَنّا     وَ دُعْمِيّاً فَكَيْفَ وَجَدْتُمُونا

دەڵێ: ئاگادار بە داستانی ئێمە بەو دوو عەشیرەتە ڕابگەیێنە و لێیان بپرسە کە داخوا ئێمە چۆن دەناسن، واتە هەواڵی ئازایەتی و پیاوەتی ئێمە لەوان بزانە.

إِذا مَا الْمَلْكُ سامَ النّاسَ خَسْفاً     أَبَيْنا أَنْ نُقِرَّ الذُّلَّ فِينا

دەڵێ: کاتێك مەلیك بە زۆری و تۆبزی زوڵمی لە خەڵك کرد ئێمە ناچینە ژێر باری زوڵم و زۆریەوە.

مَلأْنَا الْبَرَّ حَتّىٰ ضاقَ عَنّا     وَ ماءَ الْبَحْرِ نَمْلَؤُهُ سَفِينا

دەڵێ: عەرزی وشکمان پڕ کردووە و تا ئەو جێگایە کە جێمان تێدا نابێتەوە و ئاوی دەریاشمان پڕ کردووە لە کشتی.

إِذا بَلَغَ الرَّضِيعُ لَنا فِطاماً     تَخِرُّ لَهُ الْجَبابِرُ ساجِدِينا

«جبابر»: جەمعی «جبّار» واتە خۆ بە زل زان و گەردن کەش.

دەڵێ: وەختێك منداڵی شیرە خۆرەی ئێمە لە شیر دەکرێتەوە زۆرداران و گەردنکەشان سوجدەی بۆ دەبەن و دەکەونە سەر خاکی بەرپێیان.

# موعەللەقەی شەشەم

«مُعلَّقه»ی شەشەم دانراوی عەنتەرەی کوڕی شەددادی عەبسییە و لە ساڵی «٥٢٥ ـ تا ٦١٥»ی زاینیدا بووە و لە پیاوە ئازا و ناودارەکانی زەمانی جاهیلیەت بووە. لەبەر ئەوەی دایکی کەنیزەك بووە باوکی ئەوی بە کوڕی خۆی نەزانیوە و کاری بەردە و عەبدانی پێ کردووە، تا لە شەڕێکدا کە لەگەڵ غارەتگەر و تاڵانچی «طیء» دەستگیر دەبێ، ئازایەتی و دلێری و مەردایەتی لە خۆی نیشان دەدا ئەوکاتە ئازاد دەبێ. لەپاشان لە چەندین شەڕدا بەشداری دەکاو لە شەڕی مەشهووری «داحس» و «غەبڕا»دا سەرکردەی لەشکەر و پاڵەوانی مەیدانی شەڕەکە بووە. «عەنتەرە» حەزی لە «عەبلە»ی کچی مامی کردووە، بەڵام ئەو خۆشی نەویستووە، «عەنتەرە» ئینسانێکی بێوێنە و پاك و سەخی و ئازا و دوور لە هەموو جۆرە پەستی و دەنائەت بووە.

بەناوبانگترین شیعری ئەو «معلقە»یە کە لە بەحری کامیل و هەشتاو یەك شیعرە و قافیەی میمە. ئەو «موعەللەقە» شەرحی زۆری لێکراوە، بۆ وێنە شەرحی زەوزەنی و ئەنباری و تەورێزی و چەندین شەرحی دیکەش. وە بەزمانی لاتینی و فەرەنسی تەرجەمە کراوە.

بە قەولی «ئیبنو سەلام» قەسیدەییێکی نادر و کەم وێنەیە. هۆی دانانی وا دیارە ئەوە بووبێ کە یەك نەفەری عەبسی لە کاتی جەنگی «سباق»دا کە لە ساڵی «٦٠٩»دا ڕوویدا ڕەشبوونی ڕەنگی خۆی و دایکی بەچاودا داوەتەوە و لە پاش قسە بە یەکترگوتن گوتوویەتی لە تۆش شاعیرترم و «عەنتەرە» وەڵامی داوەتەوە کە بەو زوانە حاڵیت دەکەم کە کێ شاعیرترە و لە پاشان ئەو قەسیدەی داناوە.

هَلْ غادَرَ الشُّعَراءُ مِن مُتَرَدَّمِ    أَمْ هَلْ عَرَفْتَ الدّارَ بَعْدَ تَوَهُّمِ

«متردم»: جێگای پینە. وە بە مەعنا جێگای لەبەر خۆ وەگرتنیش هاتووە.

«أم»: بە مەعنا «بَلْ» و لەگەڵ هەمزەی ئیستیفهامە و لەوانەشە بە مەعنا «قَدْ» بێ وەك لە ئایەتی ﴿هَلْ أتىٰ﴾دا بە مەعنا «قد أتىٰ»یە.

دەڵێ: بۆ مەگەر شاعیران شوێنێکی دڕاویان بۆ پینەکردن و چاککردنەوە هێشتۆتەوە، یان مەگەر شتێك ماوە کە لە وەسفیدا زەمزەمە و نەغمەسورایی و وردە ئاهەنگی لەبەر خۆیانەوە بۆ نەگوتبێ و شیعریان بۆ دانەنابێ؟ تا شاعیرێکی وەك من خەریکی بێ؟ لە پاشان دەڵێ: دەست لەو قسانە هەڵگرە و باسیان مەکە، ئایا مەنزڵی یارت ناسیوە لە دوا ئینکاریکردن و شك و گومانەوە.

خولاسە «أم» بۆ لادان لە باسێکەوە بۆ سەر باسێکی دیکەیە. بە موناسەبەی ئەو مەعنایەوە چەند جوانی گوتووە شێخی سەعدی کە دەڵێ:

**از هرچه بگذری سخن دوست خوشتر است.**

يـا دارَ عَـبْلَةَ بِـالْجِواءَ تَكَـلَّمي    وَ عِمِي صَباحاً دارَ عَبْلَةَ وَ اسْلَمِي

«جواء»: بە کەسرەی جیمەکە ناوی جێگایەکە.

دەڵێ: ئەی ماڵ و مەنزڵی «عەبلە» لە «جواء» قسە بکە و لە یار ئاگادارم بکەوە. ڕۆژت باش و ژیانت خۆش بێ ئەی مەنزڵی «عەبلە» و سەلامەت بێ.

دارٌ لِآنِسَـةٍ غَـضيضٍ طَـرْفُها    طَـوْعَ الْـعِناقِ لَـذيذَةِ الْـمُتَبَسَّمِ

«آنسة»: مونيس و هاودەم.

«غضيض»: برۆ داخستن.

«طرف»: چاو.

«طوع العنان» ـ سيفەتی ئەسپە، واتە دەستەمۆ و ئارام.

«متبسم»: بە كەسرەی سینەكە يەعنی دەم بە پێكەنين.

دەڵێ: مەنزڵ، مەنزڵی مونيسی گيان و دڵارامێكە كە برۆكانی لەبەر شەرم و حەياو ئەدەب داخستوون و دەم بە پێكەنينەوە زۆر لەزەتبەخشە.

| فوقَفْتُ فِيهٰا نٰاقَتِي وَ كَأَنَّهٰا | فَدَنٌ لِأَقْضِيَ حٰاجَةَ الْمُتَلَوِّمِ |
|---|---|

«فدن»: قەسر.

«متلوم»: ڕاوەستاو.

دەڵێ: وشترەكەم لەوێ ڕاگرت، ئەو وشترە وەك قەسر و شاخێكی بەرز و بڵند بوو، بۆ ئەوەشم ڕاگرت تا لە ڕووی حەسرەت و شەوق و غەمەوە ئارەزووی كەسە ڕاوەستاوەكە بەجێ بێنم كە مەبەستی پێ خۆيەتی.

| وَ تَحُلُّ عَبْلَةُ بِالْجِواءِ وَ أَهْلُنٰا | بِالْحَزْنِ فَالصَّمّٰانِ فَـالْمُتَثَلَّمِ |
|---|---|

«تحل»: مەنزڵ دروست دەكا.

دەڵێ: مەنزڵ و ماڵی «عەبلە» لە «جواء»ە و ئەهل و تائيفەی ئێمە لەو سێ جێگايەيە. كە بريتين لە «حزن» و «صَما» و «متثلم».

حُيِّيتَ مِنْ طَلَلٍ تَقَادَمَ عَهدُهُ　　　أَقْوىٰ وَ أَقْفَرَ بَعْدَ أُمِّ الْهَيْثَمِ

**«حييت»**: سەلامت لیٚ بیٚ.

**«طلل»**: ماڵی بەرز جیٚی دانیشتنی خیٚزان.

**«أقوى و أقفر»**: یەعنی خاڵی بووە.

**«ام الهيثم»**: نازناوی «عەبلە»یە.

دەڵیٚ: لەنیٚو مەنزڵاندا ئەتۆ ئەی مەنزڵی خۆشەویستەکەم یاخوا هەر ئاوەدان بی و سەلامت لیٚبیٚ. ئەو مەنزڵە زۆر لەمیٚژە چۆڵ بووە و کەسی لیٚ ناژی و لەپاش «عەبلە» کەسی وەخۆ نەگرتووە.

حَلَّتْ بِأَرْضِ الزَّائِرِينَ فَأَصْبَحَتْ　　　عَسِراً عَلَيَّ طِلَابُكِ ابْنَةَ مَخْرَمِ

**«زائر»**: لە «زئیر»ی بە مەعنا نەڕەی شیرە، بەڵام لیٚرەدا مەبەست پیٚ دوژمنی هەڕەشەکەرە.

**«طلابك»**: هەوڵدانی تۆ. ئەو جوملە خیتابە لە دوا جوملەی ئەووەڵ کە خەبەردان بوو لەغائیب، ئەو جۆرە گۆڕانە لە غەیبەتەوە بۆ خیتاب، یان بە پیٚچەوانەوە پیٚی دەڵیٚن؛ ئیلتیفات و باسیٚکە لە عیلمی بەلاغەتداو لە قسەکردنی عەرەبانیشدا ویٚنەی زۆرە.

دەڵیٚ: لەسەر زەمینی دوژمنانی تەهدیدکەر و نەعرەتە لیٚدەر مەنزڵی گرتووە و بۆ من زۆر زەحمەتە ئەی کچی مەخرەم بیٚم بۆ لات.

| | |
|---|---|
| عُلِّقْتُهَا عَرَضاً وَ أَقْتُلُ قَوْمَهَا | زَعْماً لَعَمْرُ أَبِيكَ لَيْسَ بِمَزْعَمِ |

**«علق»**: بە سیفەتی مەجهوول لە بابی «تفعیل»، واتە دڵی بۆ وی لێدا و عاشقی بوو.

**«عرض»**: لە نکاو بەبێ قەسد و عەمدی، بەڵکوو چاو پێکەوتنێکی لە نکاو بوو.

**«زعما»**: مەفعوولی موتڵەقی «ازعم»ی موقەددەرە و بە مەعنا تەماعە.

دەڵێ: عەلاقەمەند و عاشقی بووم لە ڕووی تەسادوف و لە نکاوەوە لەکاتێکدا کە خزم و تائیفەکەم دەکوشت. زۆر سەیرە! لەکاتێ شەڕ لەگەڵ قەومەکەیدا دەمهەوێ بە ویسالی بگەم. سوێند بەگیانی بابت جێگای تەماع نییە، واتە تەماع و ئارەزوێکی بێجا و بەتاڵە، چونکە بەڕاستی شەڕ و کوشتار و عەداوەت بەرگرێکی سەختن لە ویسال و نزیکبوون و تەنانەت چاو پێکەوتنیش.

| | |
|---|---|
| وَ لَقَدْ نَزَلْتِ فَلَا تَظُنِّي غَيْرَهُ | مِنِّي بِمَنْزِلَةِ الْمُحَبِّ الْمُكَرَّمِ |

دەڵێ: ناچار چوویە دڵمەوە و لەلام زۆر خۆشەویست و موحتەرەمی و گومانت بۆ شتیتر نەچێ.

| | |
|---|---|
| كَيْفَ الْمَزَارُ وَ قَدْ تَرَبَّعَ أَهْلُهَا | بِعُنَيْزَتَيْنِ وَ أَهْلُنَا بِالْغَيْلَمِ |

**«مزار»**: زیارەت و دیدەنی.

«تربع»: نیشتەجێبوون لە بەهاردا لە جێگایەك.

«عُنَیزَتان»: بە قسەی قامووس ناوی جێگایەکە نەك دوو جێگا، وەك زەوزەنی نووسیویەتی.

دەڵێ: چۆن دەتوانم چاوم پێ بکەوی لە کاتێکدا کە قەومەکەی لە جێگایەك دەیگوزەرێنن و قەومی من لە جێگایەکی دیکەن کە ئەو دوو جێگایە زۆر لێك دوورن.

---

إِنْ كُنْتِ أَزْمَعْتِ الْفِرَاقَ فَإِنَّمَا زُمَّتْ رِكَـابُكُمْ بِـلَيْلٍ مُـظْلِمِ

---

«إن»: حەرفی شەرتە، یان تەئکیدە و کورتکراوەی «إنّ»یە.

«ازماع»: بڕیاردانی یەکجارەکی لە کاردا.

«زمّ»: بەسترابوو. زمان ئاوسار.

«رکاب»: وشترە و لە لەفزی خۆی موفرەدی نییە، بەڵام بەقسەی «فرّاء» جەمعی «رکوب»ە وەك «قلاص» و «قلوص».

دەڵێ: ئەگەر بڕیاری یەکجارەکیت بۆ جودایی دابێ دەمزانی، چونکە وشترەکانی تۆ لە شەوی تاریکدا بەسترابوونەوە، وە یا دیار بوو بڕیارت داوە.

---

مَـا رَاعَـنِي إِلَّا حَـمُولَـةُ أَهْـلِهَا وَسْطَ الدِّيَارِ تَسُفُّ حَبَّ الْخِمْخِمِ

---

«رَاعَنِي»: منی ترساند.

«حمولة»: وشترێك کە بتوانێ بار بەرێ.

«**وسط**»: بە سکوونی سینەکە هەمیشە زەرفە و بە فەتحەی سینەکە ناوە بۆ مابەینی دوولای شت.

«**سفّ و استفاف**»: ئەوەیە کە گیای وشك بدەن بە وشتر.

«**خمخم**»: گیایەکە کە وشتر دەیخواو دەنکەکانی ڕەشە و ئەگەر مەڕ بیخوا شیری کەم دەکا.

دەڵێ: ئــەمنی نــەترسـاند وشـتری بـاربەری خـانەوادەکـەی نـەبێ کـە لە ناوەڕاستی مەنزڵەکەیاندا گیای وشکیان دەخوارد و لەبەر ئەوەی کە زانیم گیای تەڕ لە لەوەڕگاکەدا تەواو بووە و بە ناچاری دەگەڕێنەوە بۆ ناو خێڵەکەیان، یان بۆ جێگایەکی تر بۆ پەیداکردنی لەوەڕ بۆ وشترەکان دەچنە وێ.

---

**فِيهَا اثْنَتَانِ وَ أَرْبَعُونَ حَـلُوبَةً ــــ سُوداً كَخَافِيَةِ الْغُرَابِ الأَسْحَمِ**

---

زەمیری «فیها» بۆ «حمولة»ی شیعری پێشوو دەگەڕێتەوە.

«**حلوبة**»: بە قسەی بەسرییان جەمعی «حلوب»ە، وەکوو «قتوبة» و «قتوب» و «رکوبة» و «رکوب» و بە مەعنا «محلوب» نییە، چونکە تێ بە ئاخریەوە لکاوە، بەڵام هێندێك دەڵێن دروستە.

«**خافية**»: ون و مەبەست پێی پەڕە ون بـووەکـانی بـاڵی قـەلەڕەشـەن، لە شەرحی زەوزەنیدا بە «خوافی» مەعناکراوە کە بریتییە لە چوار پەڕی مریشك وە لە زۆربەی زانایانەوە نەقڵ کراوە کە پەڕی باڵی مـریشك شـازدەن؛ چـواریـان «قوادم» و چواریان «خوافـی» و چـواریـان «مـناکب» و چـواریـان «اباهر»ن و هێندێك دەڵێن پەڕەکانی بیستن. چوارەکانی دی ناویان «کُلیٰ»یە و لە زۆربەی کتێباندا لۆغەتی «خوافی» هاتووە بە لەفزی جەمع و نەیانگوتووە موفرەدەکەی «خافیە»یە.

«اسحم»: ڕەش و وشتری ڕەشی نایاب و گرانبەها و کەموێنەیە.

دەڵێ: لەناو وشترە باربەرەکانی یاردا، بیست و دوو وشتری ڕەش وەك پەڕی قەلەڕەشەی ڕەش هەن، کە ئەوە دەوڵەمەندی ماڵی خۆشەویستەکەی دەگەیێنێ.

---

إِذْ تَسْتَبِيكَ بِذِي غُرُوبٍ وَاضِحٍ عَـذْبٍ مُـقَبَّلُهُ لَـذِيذِ الْـمَطْعَمِ

---

«استبی»: دڵی کردە ئەسیری عیشقی خۆی.

«ذی»: سیفەتە بۆ «ثغر» واتە دەدانی پێشەوە.

«غروب»: جەمعی «غرب»، واتە تیژی ددانی گەنجان.

«واضح»: سپی، مەبەست لە «ذی غروب» دەدانی پێشەوەن.

«مقبل»: جێی ماچ.

«مطعم»: مەزە.

دەڵێ: ترس و خەفەتم لە دووری یار ئەوکاتە بوو، ئەی دڵ، کە تۆی کردە ئەسیری عیشقی خۆی بەو دەم و ددانە تیژە سپیانە کە جێگای ماچی خۆش و مەزە شیرین و لەزەتبەخشی خۆی.

---

وَ كَأَنَّ فَــارَةَ تَـاجِرٍ بِـقَسِيمَةٍ سَبَقَتْ عَوارِضَهَا إِلَيْكَ مِنَ الْفَمِ

---

«فارة»: میسکی ناوکی ئاسك. «المنجد» دەڵێ: «فأرة» بە هەمزەوەیە و زەوزەنی دەڵێ: کورتکراوەی «فائِرَةَ»ە بەوێنەی «رجال خال مال» کە «خائل و

مـائل» بوون، یـەعنی چـاك ئـاگـاداری لە مـاڵ دەكـا، بـەڵام «قـاموس» بـە «مهموزالعین»ی نووسیوە. دەڵێن: لە عەرەبێکیان پرسی: «أَتَهْمِزُ الفأْرَةَ»؟ واتـە: «فارة» بە هەمزەوە دەخوێنیەوە؟ لەوەڵامدا گوتی: «الهرةُ تَـهمِزُهَا» واتـە پشـیلە گازی لێ دەگری. چونكە «همز» بە مەعنا گازگرتن هاتووە، وە «فأرة» مشكە.

«تاجر»: لێرەدا مەبەست پێی عەتتارە.

«قسيمة»: واتە جوان لە قسامة بە مەعنا حوسن و ڕووخۆشی.

«عوارض»: بەو دەدانـانە دەڵێن كـە لەنـاو پـانایی دەمـدان، وەیـا لە كـاتی پێكەنیندا وەدەر دەكەون.

دەڵێ: نافەی میسكی عەتتاری لەگەڵ بۆنی خۆشی ژنێكی جـوان لە نـاو دەمیەوە لەپێش دەدانەكانیەوە بۆت هاتووە، یەعنی لە پێش ماچكردنی لێو و دەم و دەدانی بۆنی عەتری دەمی ئەتۆ خۆش بەخت دەكا.

---

أَوْ رَوْضَةً أُنُفاً تَضَمَّنَ نَـبْتَهَا　　　غَيْثٌ قَلِيلُ الدِّمْنِ لَيْسَ بِمَعْلَمِ

---

«أنف»: گوڵزاری دەست لێ نەدراو.

«دِمن»: زبڵ و پەیین.

«معلم»: نیشانەدار و مەعلووم.

دەڵێ: یان گوڵزارێكی دەست لێنەدراو كە بارانی بێزبڵ و پەیین بە سەردا باری بێ و كەس پێی نەزانیبێ، لەبەر ئەوەی بارانەكە پاك و خاوێن بووە و زبڵ و پەیین و تۆز و خۆڵی پێوە نەبووە بۆنی گوڵزارەكەی كەم نەكردۆتەوە و دووبـارە چونكە پێیان نەزانیوە حەیوانات دەستیان نەگەیوەتـێ و لە سـەوزی گـەشی و بۆنخۆشیدا كەمی نەكردووە.

| فَتَرَكْنَ كُلَّ قَرارَةٍ كَالْدِّرْهَمِ | جادَتْ عَلَيْهِ كُلُّ بِكْرٍ حُرَّةٍ |
|---|---|

«جادت»: چاك باری.

«بكر»: لێرەدا مەبەست پێی یەکەم هەوری بەهارەکە بارانی زۆر پێوە بێ و زۆر بباریێ.

«حرة»: واتە خالیس واتە بەبێ باو و سەرما و تەپوتۆز.

دووبارە «حُرّ»: بە مەعنا ئەوەی دەخورێ، مەملووکی «حُرّ»: بەندەی ئازاد کراو. زەمینی «حرّ»: زەوی بێ مالّیات. «جامه حر»: کراسی بێعەیب.

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە «كلَّ عَينٍ ثرَةٍ»: یەعنی چەند ڕۆژ لەسەریەك بارین.

«ثرة»: پڕ ئاو.

«قرارة»: چاڵ.

دەڵێ: باغ و گوڵزارێك کە هەموو هەورێك بارانێکی بێ تەپوتۆزی بەسەردا باراند بێ و چاڵ و گۆلاوی تێدا پەیداکردبێ و پڕی کردبن لە ئاو و بەهۆی خڕی و سپیبوون و بریقەداریانەوە وەك درەمی زێوی سپی بچن.

| يَجْرِي عَلَيْهَا الْمَاءُ لَمْ يَتَصَرَّمِ | سَحّاً وَ تَسْكَاباً فَكُلَّ عَشِـيَّةٍ |
|---|---|

«سَحّاً و تَسكَاباً»: مەفعوولی موتلەق بۆ «جادت»ی شیعری پێشوو بە مەعنا ڕژان.

«لم يتصرم»: نەبڕاوە.

دەڵێ: باغ و گوڵزارێك کە بارانی زۆر و باشی بە سەردا باری بێ و هەموو ئێوارەیەك ئاوی لە سەریەکی بەسەردا جاری بێ.

| وَ خَلَا الذُّبَابُ بِهَا فَلَيْسَ بِبَارِحٍ | غَرِداً كَفِعْلِ الشَّارِبِ الْمُتَرَنِّمِ |
|---|---|

«خلا»: واتە تەنیا هەر لەوێ بێ.

«غرد»: بە کەسرەی غەین و سکوونی ڕێکە، یان بە فەتحەی غەین و کەسرەی ڕێ، یەعنی گۆرانی گوتن.

دەڵێ: مێشوولە لە وێدا وەمێن و هەمیشە ویزەویزی بێ وەك شەڕابخۆر لەبەر خۆیەوە ویزەی بێ و ورتە ورت بکا.

| هَزِجاً يَحُكُّ ذِرَاعَهُ بِذِرَاعِهِ | قَدَحَ الْمُكِبِّ عَلَى الزِّنَادِ الْأَجْذَمِ |
|---|---|

«هزج»: بانگکەر.

«قَدح»: ئاگر هەڵکردن بە ئەستێ و بەرد.

«زناد»: دوو دارن لێکیان دەدەن ئاگریان پێ دەکرێتەوە.

«اجذم»: دەست، یان قامکی بڕاو. بەڵام لێرەدا بە مەعنا دەست بڕاوە.

دەڵێ: بە ویزەویزکردنەوە باڵان لێك‌دەدا وەك ئاگرکردنەوەی ئینسانی بێ‌قۆڵ پەنا بۆ ئەستێ و بەردبەری و خەریکی ئاگرکردنەوە بێ.

لەپاش بە درێژی باسی وەسفی باغ و گوڵزارکە بۆنی خۆشی دەمی ئەو ژنانەی پێ شوبهاند بوو، دووبارە گەڕاوەتەوە بۆ غەزەل و باسی یار و دەڵێ:

| تُمْسِي وَ تُصْبِحُ فَوْقَ ظَهْرِ حَشِيَّةٍ | وَ أَبِيتُ فَوْقَ سَرَاةِ أَدْهَمَ مُلْجَمِ |
|---|---|

«حَشِيَّة»: قەرەویلە و دۆشەکی پڕ لە لۆکە، واتە نەرم و ڕاحەت.

«سراة»: لای سەرەوەی پشت.

«ادهم ملجم»: ئەسپی ڕەشی لەغاو بەسەرەوە.

دەڵێ: ئەو ژنە شەو و ڕۆژ لەسەر جێگای نەرم و ڕاحەت ژیان دەباتە سەر و منیش بە سواری پشتی ئەسپی ڕەشی لەغاو دەزاریدا شەوێ تا بەیانی بەو حاڵە ڕۆژ دەکەمەوە.

واتە ئەو ڕەحەت و خۆشگوزەران و منیش لە ڕەنج و عەزابدام.

---

**وَ حَشِيَّتِي سَرْجٌ عَلىٰ عَبْلِ الشَّوىٰ    نَـهْدٍ مَـراكِـلُهُ نَـبِيلِ المَـحْزِمِ**

---

«عبل»: ئەستوور و قەڵەو

«شوى»: کەلەکە و دەست و پێ.

«نهد»: بەرز و بڵند و شەریف.

«مراكل»: جەمعی «مركل»، یەعنی ئەو جێگایەکە بە ئاوزەنگ لێی دەدرێ، مەبەست تەنیشتی ئەسپە.

«نبيل»: قەڵەو، بە ئیستیعارەش بۆ چاك و شەریف بەکار دەبرێ.

«محزم»: جێگای تەنگە، واتە کەلەکە و بەرگەدەی ئەسپ.

دەڵێ: ڕەختوخواب و دۆشەکی منیش زینێکە لەسەر پشتی ئەسپێکی ئەندام درشتی دەست و پێ گەورەی تەنیشت قەڵەوی زگ موناسیب. یەعنی دەست و پێی ئەستوور و تەنیشت قەڵەو لە ئەسپدا زۆر پەسندن.

---

**هَـلْ تُـبْلِغَنِّي دارَهـا شَـدَنِيَّةٌ    لُعِنَتْ بِمَحْرُومِ الشَّرابِ مُصَرَّمِ؟**

---

«تبلغ»: بە فەتحەی «لام الفعل» بەهۆی نوونی تەئکیدەوە.

«شدنية»: بەقسەی زەوزەنی جێگایەکە، یان تائیفەیەکە کە نەوعە وشترێکیان نیسبەت دەدەن وەلای ئەوان. بەڵام قامووس دەڵێ: بە وشتری شوێنێك لە یەمەن دەڵێن.

«لعِنَت»: واتە نەفرینی لێ کراوە.

«شراب»: مەبەست لێرەدا پێی شیرە.

«مُصَرَّم»: واتە قەتع بووە.

دەڵێ: ئایا وشترێکی شەدەنی کە بێزاری لێ دەربڕاوە و دوعای لێ کراوە کە شیری کەم تێدا بێ، ئەمن دەگەیێنێتە لای خۆشەویستەکەم؟. واتە وشتری گوان وشکی نەزۆك قەڵەو و بەتوانا خۆڕاگرترە لەسەر ناخۆشی سەفەر.

---

خَطَّارَةٌ غِبَّ السُّرىٰ زَيَّافَةٌ     تَطِسُ الإِكَامَ بَوَخْدِ خُفٍّ مِيثَمِ

---

«خطارة»: کلك زۆر بڵیند دەکا.

«غِبَّ السُّرىٰ»: لە دوا شەوڕەوی.

«زيافة»: عیشوە و ناز.

«وطس»: شکان و کوتان.

«وخد»: توند ڕۆیین.

«ميثم» لە «وثم» و بە مەعنا کوتان. یەعنی زۆر جێگای کوتاوە و پێدا ڕۆیشتووە.

دەڵێ: لە پاش شەوڕەوی دووبارە ئەوەندە بەکەیف و بەتوانایە کە کلك بەرز دەکاتەوە و بە لار و لەنجە و بە ناز دەڕوا و بە گورج ڕۆیشتن و پێ بە عەرزێدادان ئەو تەپۆڵکە و دەشت و سەحرایە دەکوتی.

| فَكَأَنَّما أَقِصُ الْإِكامَ عَشِيَّةً | بِقَرِيبِ بَيْنَ الْمَنْسِمَيْنِ مُصَلَّمِ |
| --- | --- |

«قريب»: سیفەتی نەعامەیە، واتە وشترمورغ.

«منسم»: قەراغی سمی نەعامە و فیل و غەیری ئەوانیش.

«مصلم»: لە بنڕا گوێی بڕاوە، جا لەبەر ئەوەی کە نەعامە گوێی نییە وەك گوێی بڕابێ وایە.

دەڵێ: دەڵێی ئەو گردانە دەکوتم و دەیانشکێنم شەوانە و بە نەعامەیەك کە مابەینی دوو قەراغی سمانی لێك نزیکن و بێ گوێیە. واتە وشترەکەی لە تونند ڕۆیشتندا دەڵێی نەعامەیەکە وەك ئەو دەچی لە سوورەت و سیفەتدا.

| تَأْوِي لَهُ قُلُصُ النَّعامِ كَما أَوَتْ | حِزَقٌ يَمانِيَةٌ لِأَعْجَمَ طِمْطِمِ |
| --- | --- |

«أَوَى يأوي» بە «إِلى» دەبێتە موتەعەدی و هێنانی لام ئیشارەیە بەوەی کە «قلوص»ەکان ئی ئەون.

«قُلُص»: جەمعی «قلوص»ە و یەعنی وشتری مێیی گەنج.

«حزق»: جەمعی «حزقة» بە مەعنا تاقم و جەماعەتێك لەهەر شتێکدا.

«يمانية»: وشتری یەمەنی.

«اعجم»: شوانی نافەسیحی حەبەشی.

«طِمْطِم»: قسەنەزان و زمان لەنگ.

دەڵێ: پەنایان بۆ ئەو نەعامە نێرە هێنا، نەعامە مێ گەنجەکان، هەر وەك دەستە بەدەستە وشتری یەمەنی کە وەك نەعامەش ڕەشن دەچن بۆ لای شوانی ڕەشی حەبەشی بێنەوا و زمان نەزان.

يَتْبَعْنَ قُلَّةَ رَأْسِهِ وَ كَأَنَّهُ ... حَدَجٌ عَلَىٰ نَعْشٍ لَهُنَّ مُخَيَّمِ

«حدج»: شتێکە وەك كەژاوە ژنان تێیدا دادەنیشن.

«نعش»: واتە «منعوش»، بەو شتە دەڵێن کە بڵندیان کرد بێ.

«مخیم»: وەك خێوەت.

دەڵێ: لەدوا بڵندی سەری ئەو نەعامە نێرەوە دەڕۆن و بەچاو غافڵی ناکەن و لێی دوور ناکەونەوە و ئەو نەعامە نێرە وەك ئەوشتە وایە کە وەك کەژاوە دەچێ، کە وەك خێوەت لە جێگایەك هەڵدرا بێ.

صَعْلٍ يَعُودُ بِذِي الْعَشِيرَةِ بَيْضَهُ ... كَالْعَبْدِ ذِي الْفَرْوِ الطَّوِيلِ الْأَصْلَمِ

«صعل و اصعل»: سەر چووکەڵە.

«یعود»: سەرپەرستی دەکا.

«ذی العشیرة»: جێگایەکە.

«فرو»: باڵتۆ.

«اصلم»: بێ گوێ.

دەڵێ: نەعامەیێکی سەر چووکەڵەی «ذیالعشیره» کە سەرپەرشتی هەڵهێنانی هێلکەکانی دەکا، وەك غوڵامێکی کە عەبای پێستە مەڕی خوریاوی بەرزی لەبەر بێ ئەو نەعامە لە ڕەشی و بێ گوێیی و باڵ درێژیدا وەك غوڵام و عەبدێکی وا دەچێ.

شَرِبَتْ بِماءِ الدُّحْرُضَيْنِ فَأَصْبَحَتْ     زَوْراءَ تَنْفِرُ عَنْ حِياضِ الدَّيْلَمِ

بێی سەر «بماء»: لەلای عولەمای بەسری زائیدە وەك لەو ئایەتەدا زائیدە کە دەفەرموێ. ﴿أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَىٰ﴾، بەڵام لەلای کوفیان بە مەعنا «مِن»ە.

«دحرضين»: ناوی دو ئاوە کە یەکیان «دَحرَضٌ» و ئەوی‌دیان «وسیع»، کە شاعیر ئەو دوانەی لە بابی تەغلیب کردۆتە تەسنییە.

وەك لە قامووسدا گوتراوە. «زوراء»: مایل و خوار و نەفرەت لێکراو.

«دیلم»: ناوی بەشێك لە گیلان کە ملوکی دەیالیمە لەوێ پەیدا بوون و بە مەعنا دوژمنانیش هاتووە کە لێرەدا ئەوە مەبەستە.

دەڵێ: وشترەکەم لەو دوو ئاوەی خواردۆتەوە و بێ‌مەیل و بێزارە لە ئاوی حەوزی دوژمنان.

وَكَأَنَّما تَنْأَىٰ بِجانِبِ دَفِّـها الْ     وَحْشِيِّ مِنْ هَزِجِ العَشِيِّ مُؤَوَّمِ

«تنأی»: دور دەکەوێتەوە.

«دف»: تەنیشت.

«وحشی»: لای ڕاست. بۆیێ پێی دەڵێن وەحشی، چونکە لەلای ڕاستەوە سوار نابن و دانابەزن.

«هزج»: سەدا، دەنگ و مەبەست میاوە میاوی پشیلەیە لە ئێوارانـدا و بۆیەش دەڵێ: لە ئێواراندا، چونکە زۆربەی هاواری حەیوانات لە شەودایە.

«مُؤَوَّم»: سەرگەورە، یان ناشیرین.

دەڵێ: ئەو وشترە لە ڕۆیشتندا ئەوەندە بەکەیفە خوارە خوار بەڕێگادا دەڕوا، دەڵێی لای ڕاستی خۆی لە ترسی چنگورکی پشیلە خوار دەکاتەوە. واتە لە ترسی قامچی لێدان وەك ترس لە برینی جێ چنگورکی پشیلە لای خوار دەکاتەوە.

هِرٍّ جَنِيبٍ كُلَّمَا عَطَفَتْ لَهُ      غَضْبَى اتَّقَاهَا بِالْيَدَيْنِ وَ بِالْفَمِ

«هِرّ»: بەدەلە لەبری «هزج» لە شیعری پێشەوەدا و یەعنی پشیلە.

«جنیب»: تەنیشت.

«غضبی»: حاڵە لە زەمیری «عطفت» کە بۆ وشترەکە دەگەڕێتەوە. یەعنی تووڕە، وە زەمیری «لَهُ» وە «اتقی» دەگەڕێنەوە بۆ «هِرّ».

دەڵێ: پشیلەیەکە وەك شتی زائید و پێویست بە دوای وشترەکەدا ڕادەکێشرێ، هەرکاتێ وشترەکە بە تووڕەییەوە ئاوڕی بداتەوە سەر، ئەو بە دوو دەست و دەمی دیفاع لە خۆی دەکا، واتە: بەچنگ و دەدان وشترەکە دەڕنی و ناهێڵی بریندارى بکا.

أَبْقَى لَهَا طُولُ السِّفَارِ مُقَرْمَداً      سَنَداً وَ مِثْلَ دَعَائِمِ الْمُتَخَيِّمِ

«سفار»: لەو شیعرەدا مەسدەرە و بە مەعنا سەفەرکردنە.

«مُقَرمَد»: واتە ناو قەدی پشتی بڵندی وشتر. وە بەڕیوایەتێك «ممردد»ە، یەعنی بڵند.

«سند»: بڵند.

«مثل»: سیفەتی چوار پەلی وشترە.

«دعائم المتخیم»: کۆڵەکەکانی خێوەتەکە.

بە قسەی ڕۆستەمی ئەو شیعرە ئەسمەعی نەبێ کەسی دیکە ڕوایەتی نەکردووە و بە قسەی ئەبوو جەعفەریش ئەویش ڕیوایەتی نەکردووە.

دەڵێ: بەهۆی درێژی و زۆری سەفەرەوە ئەو وشترە کۆپانی پشتی بڵند و دەست و پێی قەوی و توند و بڵند بوون.

بَرَكَتْ عَلىٰ جَنْبِ الرِّداعِ كَأَنَّما　　　بَرَكَتْ عَلىٰ قَصَبٍ أَجَشَّ مُهَذَّمِ

«رداع»: یەعنی ئاو و گڵ و ناوی ئاوێکیشە.

«قصب»: قامیش.

«اجش»: واتە دەنگی لێوە هات.

«مهذم» و بە ڕیوایەتێك «مهضم»: بە مەعنا شکانە.

دەڵێ: لە قەراغی ئاوی «رداع» نوست و ئەژنۆی لە عەرزێ دان و وەك بڵێی لەسەر قامیشی وشکی شکاو نوستبێ وابوو. یەعنی بەهۆی ماندوبوونیەوە دەستی کرد بەناڵین، دەتگوت دەنگی قامیشی وشکە لە کاتی شکاندنیدا، یان ئەو گوڵانەی لە بنیدابون ورد بوون و دەنگیان لێ دەهات.

وَ كَأَنَّ رُبّاً أَوْ كُحَيلاً مُعْقَداً　　　حَشَّ الوُقُودُ بِهِ جَوانِبَ قُمْقُمِ

«رُبْ»: ئاوی کولاوی میوە، ئارەقی ئەو وشترەی شوبهاندووە بە «رُبْ».

«كحيل»: «قطران» كە ئاوێكی چەوری ڕەشی بریقەدار و زبر و بۆن توندە و لە هێندێك درەخت وەك سنەوبەر و چەند داری دەی وەدەستی دێنن.

«معقد»: كوڵاو و خەست.

«حش»: هەڵكردن.

«قمقم»: مەنجەڵی ئاو گەرمكردن.

دەڵێ: ئارەقی سەر و گەردنی ئەو وشترە دەڵێی «رُبّ»ە، یان قەترانی كوڵاو و خەستە كە لە مەنجەڵێكدا كوڵابێ و دڵۆپ دڵۆپ لە مەنجەڵەكە بێتە خوارێ. واتە: سەر و گەردنی وەك مەنجەڵ و ئارەقی ڕەشی وەك ڕب وە یا قەترانی كوڵیو دەتكێتە خوارێ.

---

يَنْبَاعُ مِنْ ذِفْرَي غَضُوبٍ جَسْرَةٍ     زَيَّافَةٍ مِثْلِ الْفَنِيقِ الْمُكْدَمِ

---

«يَنْبَاع»: لە ئەسڵدا «ينبع» بووە، بەڵام لە ئەسەری درێژەدان بە فەتحەی «بێ»كە لەبەر خاتری وەزنی شیعر ئەلفێك پەیدا بووە. وەك «ئامین» كە لە ئەسڵدا ئەمین بووە. لەبەر ئەوەی لەسەر وەزنی فاعیل لە زمانی عەرەبیدا نییە كەچی ئەو لەفزە بە كوێ دەنگەوە عەرەبییە و ئەلفەكەی لە درێژەپێدانی فەتحەی هەمزەكەوە پەیدا بووە. بە خیلافی قسەی جەماعەتێك كە دەڵێن «ئەمین» یەكێكە لە ئەسمای حوسنای خوا، وەیان بە مەعنا قبووڵ بكەیە. دووبارە بەلای بەعزێكانەوە كەلیمەیەكی ئەسڵییە و لە «بوع»ە و لە «نبع» نییە و موزاریعی بابی «انفعال»ە و بە مەعنا جاریبوونی ئارەقە، نەك تەیكردنی مەسافەت، وە زەوزەنی گوتوویەتی.

«ذفری»: ئێسكی دیاری پشت گوێ.

«جسرة»: وشتری قەوی و ئەندام درشت.

«زيافة»: بەنازەوە ڕۆیین.

«فنيق»: وشتری نیر، «فەحل».

«مكدم»: گازی لێ گیراوە.

دەڵێ: ئارەق لە ئێسکی بناگوێی ئەو وشترە تووڕەیە درشت ئەندامە دەتکێ کە بە لەنجە و نازەوە وەك فەحلێك کە گازی لێ گیرابێ،لە توند ڕۆیشتندا و لە لار و لەنجە و بەناز ڕۆیشتندا، وەك فەحلێکی وا دەچێ.

| طِبٌّ بِأَخْذِ الْفارِسِ الْمُسْتَلْئِمِ | إِنْ تُغْدِفِي دُونِي الْقِناعَ فَإِنَّنِي |
|---|---|

«الإغداف»: ڕووبەند داپۆشین.

«طب»: چاك و ماهیر.

«مستلئم»: ئەوەی زرێی لە بەردا بێ.

دەڵێ: ئەی مەعشووقە! ئەگەر ڕووی خۆت لەبەر من دادەپۆشی، ئەوە بزانە کە من لە گرتن و ئەسیرکردنی سوارانی زرێپۆشدا مەهارەتم هەیە، لە پیاوێکی ئازا و شێر لە عەرزێ‌دەری وەك من دووری و خۆشاردنەوە هیچ مەعنایەکی نییە.

وە یا ڕوداپۆشینی تۆ بەرگری لە وەدەستهێنانی تۆ ناکا. هەر وەك زرێ لەبەرکردنی سواران نابێتە هۆی ئەوەی کە نەبنە ئەسیری ژێر دەستی من.

| سَمْحٌ مُخالَقَتِي إِذا لَمْ أُظْلَمِ | أَثْنِي عَلَيَّ بِما عَلِمْتِ فَإِنَّنِي |
|---|---|

«مخالفة»: «مفاعلة» لە خوڵق و خوویە.

دەڵێ: هەر چۆنێك دەزانی و دەتوانی باسی خووڕەوشت و ئەخلاقم بکە، لەبەر ئەوەی کە من تا زوڵمم لێ نەکرێ و حەقم نەخورێ لێبوردوو و خۆش ئەخلاقم.

فَإِذٰا ظُلِمْتُ فَإِنَّ ظُلْمِي بٰاسِلٌ مُرٌّ مَـذٰاقَـتُهُ کَـطَعْمِ الْـعَلْقَمِ

«باسل»: سەخت و توند و تاڵ.

«علقم»: کاڵەکەمارە.

دەڵێ: ئەگەر زوڵمێکم لێ بکرێ، ئەوە بزانە کە تۆڵەو پاداشتی زوڵم لە من زۆر سەخت و توند و تاڵە، وەك کاڵەکەمارە وایە. واتە: ئەوەی زوڵم لە من بکا خەراپی چاو بەخۆی دەکەوێتەوە.

وَ لَقَدْ شَرِبْتُ مِنَ الْمُدٰامَةِ بَعْدَ مٰا رَکَدَ الْهَوٰاجِرُ بِالْمَشُوفِ الْمُعْلَمِ

«مدامة»: شەڕاب.

«رکد»: ساکین و ئارام.

«هەواجر»: جەمعی «هاجرة»، یەعنی سەختترین وەختی گەرما.

«مشوف»: سیفەتە بۆ دینار، یا بۆ پیاڵە.

دەڵێ: لە دواشیددەتی گەرما و ئارامی و هێواشبوونەوەی بە سکەی نەخشاوی جوانی ئاڵتون شەرابم کڕیوە و خواردۆمەتەوە.

عەرەبان عادەتیان وا بووە فەخریان بە ئارەقخواردنەوە و قومارەوە کردووە و بە نیشانەی سەخاوەتیان داناوە.

بِزُجاجَةٍ صَـفْراءَ ذاتِ أَسِـرَّةٍ　　قُرِنَتْ بِأَزْهَرَ فِي الشِّمالِ مُفَدَّمِ

**«زجاجة»**: شووشە و جامی شەڕاب.

**«اسرة»**: جەمعی «أسر» یا «سَرَرَ» یەعنی خەتی دەست و دەم و چاو.

**«ازهر»**: سیفەتی مەسینە و ئافتاوەیە.

**«مفدم»**: بەو پارچە دەڵێن کە بۆ پاککردنەوەی ئەو شتەی کە لە نێو مەسینەکەدایە بەسەر زالکی مەسینەکەی دادەدەن.

دەڵێ: لە جامێکی زەردی خەتدار لە مەسینێکی کە وەسیلەی پاڵاوتنی لەسەرە شەڕاب ڕۆ دەکەم و دەیخۆمەوە.

فَإِذا شَرِبْتُ فَـإِنَّنِي مُسْـتَهْلِكٌ　　مالِي، وَ عِرْضِي وافِرٌ لَمْ يُكْلَمِ

**«عرض»**: ئابڕوو.

**«وافر»**: کامیل، پڕبەپڕ، تەواو.

**«یکلم»**: عەیبدار.

دەڵێ: کاتێ شەرابم خواردەوە هەر ماڵەکەم خەرج دەکەم، بەڵام ئابڕووم تەواو و بێعەیب و عارە. واتە: لە کاتی مەستیدا خووڕەوشتی باش و ماڵ خەرجکردن نەبێ شتێکی وا لە من ڕوونادا کە ببێتە هۆی ئابڕووچوون و بەدناوی من.

وَ إِذا صَحَوْتُ فَما أُقَصِّرُ عَنْ نَدىً　　وَ كَما عَلِمْتِ شَمائِلِي وَ تَكَـرُّمِي

«صحوت»: بێمەوە سەرخۆ، هۆشیار ببمەوە.

«ندی»: بەخشش.

«شەمائل»: خووخدە، عادەت.

«تكرّم»: سەخاوەت.

دەڵێ: وەختێك بێمەوە سەرخۆ دەست لە سەخاوەت و بەخشین هەڵناگرم و تەبیعەت و پیاوەتی من ئاوایە کە دەزانی.

واتە لە کاتی مەستی و بێداریدا سەخیم و تەنانەت لە کاتی مەستی و بێ‌هۆشیشدا بە پێچەوانەی عەقڵ مەنتیق ڕەفتار ناکەم و هەرگیز شەرابخواردنەوە زاڵ نەبووە بەسەر عەقڵمدا و نەبۆتە حاکم بەسەرمدا.

**وَ حَلِيلِ غَانِيَةٍ تَرَكْتُ مُجَدَّلاً    تَمْكُو فَرِيصَتُهُ كَشَدْقِ الأَعْلَمِ**

«حلیل و حلیلة»: واتە ژن و مێرد. لە «حلول»ی بە مەعنا لەیەك مەنزڵ و بەیەکەوە دەنوون. «حلیل» فیعلی بە مەعنا فاعیله، وەك «شریب» و «أکیل» و «ندیم». یان لە «حل»ی بە فەتحەی «حێ» کە بە مەعنا کردنەوەی بەندی لیباسە.

«غانیة»: ژنی بەمێرد، وە بە قەولێك واتە زۆر جوان و بێ‌نیاز لە ئارایشکردن. بە قەولێکی دی کچی شوو نەکردوو. عمارەی کوڕی عەقیل دەڵێ: کچی جوان.

«مجدل»: بە عەرزێکدا کەوتووە.

«تَمکُو»: دەنگ دەکا.

«فریصة»: گۆشتپارەی بەینی شان و تەنیشت کە لە کاتی ترسدا دەلەرزی.

دەڵێ: ئای کە تا ئێستا مێردی خاوەن ژنی جوان و بێ‌نیاز لە ئارایشتم لە خوێندا گەوزاندووە کە گۆشتی بەینی شان و کەلەکانیان وەك لچی لای

سەرەوەی داقەڵشاوی وشتر بووە. واتە: جێی برینی نێزەکەم ئەوەندە گوشاد بووە.
یان دەڵێ: دەنگی هاتنەخوارەوەی خوێنی برینەکانیان وەك دەنگی دەرچوونی هەناسە لە لێو و دەمی وشترێکی وا بووە.

سَبَقَتْ يَدٰايَ لَهُ بِعٰاجِلِ طَعْنَةٍ        وَ رَشٰاشِ نٰافِذَةٍ كَلَوْنِ الْعَنْدَمِ

زەمیری «لَهُ» بۆ «حليل» دەگەڕێتەوە.
«نافذة»: سیفەتە بۆ «طعنة»، یەعنی برینی ئەو نێزەلێدانەی کە لەکەلەکەی دوژمن دراوە.
«عندم»: گیایەکە کە ڕەنگی پێ دەکرێ. کە بە کوردی پێی دەڵێن ڕۆنیاس.
دەڵێ: دوو دەستی من پێشدەستییان کرد و زەڕبەتێکی ئەوەندە بە پەلەم لێدا کە لە دەمی برینەکەی خوێنی سووری وەك ڕەنگی ڕۆنیاسی لێ دەهاتە خوارێ.

هَلّا سَأَلْتِ الْخَيْلَ يٰا ابْنَةَ مٰالِكٍ        إِنْ كُنْتِ جٰاهِلَةً بِمٰا لَمْ تَعْلَمِي

«هلا»: حەرفی تەڕغیبە و لە ئەسڵدا «هل لا» بووە، ئەگەر داخڵی سەر فیعلی مازی بێ ئەوە بۆ ئیفادەی لۆمەکردنە لەسەر کردەوە، بەڵام ئەگەر چووە سەر فیعلی موزاریع، بۆ هەڵنان لەسەر کردەوویە.
دەڵێ: ئەی کچی مالیك! ئەگەر ئاگات لە ئازایەتی و شوجاعەت و جەنگاوەری من نییە، ئەی بۆچی لە سواران و ئازایانت نەپرسیوە؟

إِذْ لا أَزالُ عَلىٰ رِحالَةِ سابِحٍ          نَهْدٍ، تَعاوَرُهُ الْكُماةُ مُكَلَّمِ

«رحالة»: بە زینێك دەڵێن کە داری تێدا بەکار نەبرابێ.

«سابح»: ئەسپی خۆشڕەو.

«نهد»: ئەندام درشت.

«كماة»: جەمعی «كَمِيّ»، یەعنی ئازا، یان ئەوکەسەی ئەسڵەحەی شەڕی لە خۆ داوە.

دەڵێ: کە ئەمن هەمیشە لەسەر زینی ئەسپی تیژڕەو و ئەندام درشتم، کە جەنگاوەران هەرکەس بە نۆرە زەربەتیان لێداوە و بریندار دەکەن.

طَوْراً يُجَرَّدُ لِلطِّعانِ وَ تارَةً          يَأوِي إِلىٰ حَصِدِ الْقِسِيِّ عَرَمْرَمِ

«طورا و تارة»: یەعنی کەڕەتێك و جارێك.

«حصد»: زاهیر وایە بە کەسرەی «صاد»ەکە بێ و سیفەت بێ بۆ «قوم»ی مەحزووف، وەك «عرمرم» کە «حصيد» بە مەعنا سەخت و «عرمرم»: لەشکەری زۆرە.

«قسى»: بە کەسرە و بۆری «قاف»ە کە جەمعی «قوس» و بە مەعنا کەوانە.

دەڵێ: جاری وایە دەهێندرێتە دەر بۆ شەڕکردن بە نێزە و جاری واشە دەگەڵ دەستەی لەشکەرچییانی کەوان سەخت دەکەوێ.

واتە جاری وایە لە لەشکەری جیا دەکەومەوە و بە تەنیا بەنێزە شەڕ دەکەم و کەڕەتی واشە دەگەڵ لەشکەر دەکەوم.

يُخْبِرْكِ مَن شَهِدَ الْـوَقِيعَةَ أَنَّـنِي      أَغْشَى الْوَغىٰ وَ أَعِفُّ عِنْدَ الْمَغْنَمِ

«يخبر»: لە وەڵامی «هلا»دا مەجزوومە.

«وقعە یا وقیعە»: یەعنی جەنگ.

دەڵێ: ئەوانە لە شەڕدا حازر بوون پێت دەڵێن، کە من چۆن شەڕ دەکەم و لە کاتی تاڵانیشدا چاوم لە تاڵانەوە نییە، واتە ئازاو ڕەشیدم و چاوم لە ماڵی دنیاوە نییە.

وَ مُدَجَّجٍ كَرِهَ الكُماةُ نَزالَهُ      لا مُمْعِنٍ هَرَباً وَ لا مُسْتَسْلِمِ

«مدجج»: واتە پڕسیلاح.

«نزال»: واتە بەیەکەوە شەڕکردن، یان پیادە شەڕکردنی دووکەس بەیەکەوە.

«مُمْعَنْ»: بە پەلە لە کاردا.

«مُستَسلِم»: واتە ئەمان خواست و تەسلیمبوو.

دەڵێ: ئەی کە پاڵەوانی غەرق لە ئەسڵەحەداکە ئازایان لە شەڕکردن لەگەڵیدا بێزار بوون، نە لە ڕاکردندا پەلەی کردووە و نە تەسلیم بووە و نە ئەمانی خواستووە.

جادَتْ لَهُ كَفِّي بِعاجِلِ طَعْنَةٍ      بِمُثَقَّفٍ صَدْقِ الكُعُوبِ مُقَوَّمِ

ئەو شیعرە جوابە بۆ «رُبَّ»ەی موقەددەر لە جوملەی «و مدجج».

«مثقف»: لە عورفی شاعیراندا یەعنی نێزە.

«صدق»: بە فەتحەی «صاد»ە کە یەعنی نێزەی سفت و ڕاست.

«کعوب»: جەمعی «کعب». واتە قەف و گرێی قامیش و نێزە.

دەڵێ: بە پەلە دەستی من پێی بەخشی برینێکی گەورە بە نێزەیەکی ڕاست کە قەف و گرێکانی زۆر سفت و مەحکەم بوون.

بِرَحِيبَةِ الفَرْغَيْنِ يَهْدِي جَرْسُهَا بِاللَّيْلِ مُعْتَسَّ الذِّئَابِ الضُّـرَّمِ

«رحيبة»: واسیع.

«فرغ»: جۆگەلە ئاوێك بچێتە ناو شیوێکەوە، یان زالکی دۆڵچە.

«جرس»: دەنگ.

«معتس»: تالبی ڕاو.

«ذئاب»: جەمعی «ذئب»، گورگ.

«ضرم»: جەمعی «ضارم»، واتە برسی.

بێی «برحيبة» پەیوەندی بە «جادت»ی شیعری پێشەوەیە.

دەڵێ: نێزەیەکی وام لێداکە خوێنێکی زۆری لە زالکی برینەکەی جاری بوو دەتگوت زالکی دۆڵچەیە، وە دەنگی لە شەودا گورگی برسی وادار دەکرد کە بۆلای گۆشتی کوژراوەکان بە غاردان بچن.

فَشَكَكْتُ بِالرُّمْحِ الأَصَمِّ ثِيَابَهُ لَيْس الكَرِيمُ عَلَى الْقَنَا بِمُحَرَّمِ

«شككت»: کونم تێ کرد.

«الرمح»: ڕم، نێزە.

«أصم»: ڕەق.

«قنا»: ڕم، نێزە.

دەڵێ: بە نێزە لێدانێکی سەخت زرێ و لیباسەکانم دڕاند و برینەکەی لە گۆشت تێپەڕی و گەیشتە سەر ئێسقان، پیاوی ئازاو ڕەشید حەرام و مانیع نییە نێزەی لێ بدرێ، واتە ئینسانی ئازا بە زۆری دوچاری کوشتن دەبێ و بریندار دەبێ.

یـان مـەعنای وایـە دەڵێ: کـەرەم و بـەخشش و سـەخاوەت ئـینسان لە سەرنوێشتی دوور ناخاتەوە.

فتَرَكْتُهُ جَزَرَ السِّباعِ يَـنُشْنَهُ     يَقْضِمْنَ حُسْنَ بَنانِهِ وَ الْمِعْصَمِ

«جزر»: جەمعی «جزرة»، بە مەڕێك دەڵێن کە بۆ کوشتنەوە ئامادە کرابێ.

«نَوش»: بە شتێکەوە مەشغوول بوون و مەبەست خواردنە.

«قضم»: خواردن و گاز لێگرتن بە دەدانەکانی پێشەوە.

دەڵێ: ئەوم کردە خۆراکی دڕندان کە بە دەدانەکانیان خەریکی خواردنـی قامك و جمگە جوانەکانی بوون.

وَ مِشَكٍّ سابِغَةٍ هَتَكْتُ فُرُوجَـها     بِالسَّيْفِ عَنْ حامِي الْحَقِيقَةِ مُعْلَمِ

«مِشَك»: زرێ، وە بە قەولێك پیاوی پڕ چەك.

«سابغة»: زرێی گوشاد.

«هتک»: لەتکردن.

«حقيقة»:لە حەقە و بەو شتە دەڵێن کە پارێزگاری لەسەر ئینسان واجب و لازم بێ.

«معلم»: بە کەسرەی لام بە جەنگاوەرێك دەڵێن کە بەهۆی عەلامەتێکەوە خۆی بنوێنی. وە بە فەتحەی لامەکەش بە مەعنا دیار و مەشهوورە.

دەڵێ: ئەی کە تا ئێستا چەندین زرێی گوشادم لەبەر پیاوی جەنگاوەردا کە خۆی بۆ پاسداری حەریم و موقەددەسات و ئیفتیخارات ئامادە کردبوو لەت و پەتم کردووە کە ئەو خۆی بۆ جەنگ بەهۆی نیشانەیەکەوە ناساندبوو.

---

رَبِذٍ يَدٰاهُ بِالْقِدٰاحِ إِذٰا شَتٰا　　　هَتّٰاكِ غٰايٰاتِ التِّجٰارِ مُلَوَّمِ

---

«ربذ»: سەریع.

«شتا»: داخڵی زستان بوو.

«تجار»: جەمعی «تاجر»، یەعنی شەڕابفرۆش.

دەڵێ: زۆر بە گورجی و بەپەلە لەکاتی زستاندا تیری قوماری جێ بەجێ کردووە و ئەوەندەی بەیداغی مەیخانان دڕاندووە کە لۆمەی کراوە.

دەڵێ: ئەو جەنگاوەرەی کە کوشتومە خاوەنی ئەو سیفەتانە بووە، کە لەکاتی فەڕاغەتدا قوماربازێکی زۆر چالاك بووە و ئەوەندەی شەڕاب کڕیوە دوکانی شەڕابفرۆشی داخستووە و لەوڕووەوە خەڵك سەرزەنشتیان کردووە.

---

لَمّٰا رَآنِي قَدْ نَزَلْتُ أُرِيدُهُ　　　أَبْدىٰ نَوٰاجِذَهُ لِغَيْرِ تَبَسُّمِ

---

**«نواجذ»**: جەمعی «ناجذ» و بە مەعنا چوار خلیّنەکانی ئاخری ناو دەم.

دەڵێ: کاتێ چاوی پێکەوتم کە لە ئەسپەکەم دابەزیم و نیازی کوشتنی ئەوم هەیە دەدانەکانی نیشاندا، نەك لە ڕووی پێکەنینەوە، بەڵکوو لە ترسان دەمی کرابۆوە، یان لە ڕووی تووڕەییەوە. واتە کاتێ کوشتم زاری کرایەوە، کاتێ تەماشات دەکرد وەتدەزانی پێدەکەنێ.

عَهْدِي بِهِ مَدَّ النَّهارِ كَأَنَّما خُضِبَ البَنانُ وَ رَأْسُهُ بالْعِظْلِمِ

**«مد النهار»**: بە درێژایی ڕۆژ.

**«عظلم»**: شیرەی درەختێك و گیایەکە بۆ ڕەنگکردن بەکار دەبرێ و دووبارە بە سورمەش دەڵێن.

دەڵێ: لە تەواوی ڕۆژدا دەمدی کە سەرو قامکەکانی وەك بە گیا ڕەنگ ڕەنگکرابن وا بوو. یەعنی لاشەی خوێناوی کە خوێنەکەی پێوە وشك ببۆوە و لەسەر عەرز کەوتبوو وات دەهاتە بەر چاوان.

فَطَعَنْتُهُ بِالرُّمْحِ ثُمَّ عَلَوْتُهُ بِمُهَنَّدٍ صافِي الْحَدِيدَةِ مِخْذَمِ

**«مخذم»**: شمشێری بڕندە.

**«مهنّد»**: شمشێری هیندی.

دەڵێ: بەنێزە زەربەتێکم لێدا و لە پاشان بە شیری تیژی هیندی کە ئاسنەکەی ساف و بێگەردبوو لەسەر سەری ڕاوەستام و بە زەخمی نێزە لە ئەسپەکەم بەردایەوە و لە کاتێکدا کە کەوتبوو بە شیر سەرم بڕی و نەجاتم دا.

بَـطَلٍ كَأَنَّ ثِـيَابَهُ فِـي سَـرْحَةٍ    يُحْذىٰ نِعَالَ السِّبْتِ لَيْسَ بِتَوْأَمِ

«**بطل**»: ئازا.

«**سرحة**»: درەختی گەورە.

«**يحذى**»: لە «حذاء»ە بە مەعنا کەوشە.

«**سبت**»: بە کەسرەی سینەکە، چەرمی دەباغکراو.

دەڵێ: پاڵەوانێك بوو دەتگوت لیباسەکانی لەبەر دارێکی گەورە و قەویدان و کەوشی چەرمی دەباغکراوی دەپێ کردبوو، دوو قلوو و جووتیلە نەبوو تا بڵێین بەو هۆیەوە زەعیف بووە. واتە لە شیددەت و قووەت و بەرزی و بڵندیدا وەك دارێکی بەرز و بڵند دەچوو، چەرمی گایەکی دەویست بۆ پێڵاوەکانی و لەبەر ئەوەی کە بە جووتیل لەدایك نەببوو، هەموو شیری دایکی خواردبوو، درشت ئەندام و قەوی هەیکەڵ و گەورە بوو.

يَا شَاةَ مَا قَنَصٍ لِمَنْ حَلَّتْ لَهُ    حَرُمَتْ عَلَيَّ وَ لَيْتَهَا لَمْ تَحْرُمِ

«**شاة**»: مەڕە، بەڵام لێرەدا بریتییە لە ژن.

«**ما**»: زائیدە.

«**قنص**»: بە سکوونی «نون»، بە مەعنا ڕاوکردنە و بە فەتحەی واتە ڕاوکراو.

دەڵێ: ئەی ئەو مەڕەی ڕاوکراوی کەسێکی کە بۆ وی حەڵاڵ و بۆ من حەرامی، خۆزگە بۆ منیش حەرام نەبوویتایە.

یان مەعنای وایە، دەڵێ: ئەی ئەو قەومەی کە جوانی ئەو ژنەتان زۆر بەلاوە عەجائیبە کە بۆ عاشقی سووتاوی خۆی کافیە و بەداخەوە بۆ من حەرامە، لەبەر

ئەوەی کە باوکم مارەی کردووە، یان لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ تائیفەکەی لە دوژمنی و شەردا بەسەر دەبەم.

فَبَعَثْتُ جارِيَتِي فَقُلْتُ لَهَا اذْهَبِي    فَتَجَسَّسِي أَخْبارَها لِي وَاعْلَمِي

دەڵێ: قەرەواشەکەم نارد و پێمگوت: بچۆ باس و خواستی ئەوم بۆ بزانە و بۆم بێنەوە.

قالَتْ رَأَيْتُ مِنَ الْأعادِي غِرَّةً    وَ الشَّاةُ مُمْكِنَةٌ لِمَنْ هُوَ مُرْتَمِ

«غرة»: غەفڵەت.

«مرتم»: ئەسڵەکەی «مرتمی»یە ئیسمی فاعیلی بابی ئیفتعال و لە «رمی» بە مەعنا تیرەندازییە.

دەڵێ: کە هاتەوە گوتی: دوژمنان ئاگایان لە خۆیان نییە و دەتوانی تیر باوێژیە مەڕەکە و لەبەر چاوی ڕەقیبان دوور بێ و ڕاوی بکەیت و بیبەی، یان چاوپێکەوتن و پێگەیشتنی ئاسانە.

وَ كَأَنَّمَا الْتَفَتَتْ بِجِيدِ جَدايَةٍ    رَشَإٍ مِنَ الْغِزْلانِ حُرٍّ أَرْثَمِ

«جید»: گەردن.

«جدایة»: بە فەتحەی «جیم» و بە کەسرەشی خوێندراوەتەوە یەعنی ئاسك.

«رشاء»: بێچووە ئاسکێك کە چەند مانگ بووبێ و خۆی گرتبێ.

«حُرّ»: خالیس.

«ارثم»: بە حەیوانێك دەڵێن کە لێوی لای سەرەوە و لووتی سپی بێ.

دەڵێ: کە ڕوو وەردەگێڕێ دەڵێی بەچکە ئاسکی قەوی لمبۆز سپیە کە بەگەردنە بەرز و جوانەکەیەوە تەماشا دەور و بەری خۆی دەکا.

---

نُبِّئْتُ عَمْراً غَيْرَ شاكِرِ نِعْمَتِي وَ الْكُفْرُ مَخْبَثَةٌ لِنَفْسِ الْمنْعِمِ

---

«نبئت»: مازی مەجهوولی موتەکەلیمی وەحدەهوە و لەبابی «تفعیل»ە.

«نَبَّأ»: یەکێکە لەو حەوت فیعلانەی خاوەنی سێ مەفعوولن.

«تاء»: نائیب فاعیل و لە ئەسڵدا مەفعوولی یەکەم بووە و «عمرو» مەفعوولی دووەم و «غیر» مەفعولی سێیەم.

«عَمْر»: بە فەتحەی «عین» و سکوونی «میم» لە حاڵەتی ڕەفعە و جەڕڕەدا واوێکی پێوە زیاد دەکرێ تا لەگەڵ عومەر وەك یەك نەچن.

«مخبثة»: مەفسەدە.

دەڵێ: خەبەریان پێ داوم و ئاگادار کراومەتەوە کە عەمر سپاسی نیعمەت و چاکەی من ناکا، کە ئەو ناسپاسییەش دەبێتە هۆی فەساد بۆ خاوەن نیعمەت.

---

وَ لَقَدْ حَفِظْتُ وَصاةَ عَمِّيَ بالضُّحىٰ إِذْ تَقْلِصُ الشَّفَتانِ عَنْ وَضَحِ الْفَمِ

---

«وصاة»: وەسیەت.

«قلص»: هاتنەوە یەك و کورت بوونەوە.

«وضح الفم»: دەدانەکان.

دەڵێ: وەسیەتەکەی مامم فەرامۆش نەکردووەکە لە چێشتەنگاواندا کە لێو لە دەدان لە ترسی جەنگ و کوشتار هاتنەوەیەك و کورت بوونەوە و لێك دوورکەوتنەوە ئەمن فیداکاری و پایەداری بنوێنم.

فِي حَوْمَةِ الْحَرْبِ الَّتِي لا تَشْتَكِي    غَمَرَاتِـهَا الأَبْـطَالُ غَـيْرَ تَـغَمْغُمِ

«حومة»: لە ناوەڕاست و شیددەتی شەڕدا.

«غمرات»: بەو وەزع و نارەحەتییە دەڵێن کە لە کاتی جەنگدا زاڵ دەبێ بەسەر دڵ و عەقڵدا.

«تغمغم»: بەو هەراو هوریایە دەڵێن کە لەکاتی حەربدا دێ و لێی حاڵی نابی.

دەڵێ: لە گەرماو گەرمی شەڕداکە پاڵەوانان بە غەیرەز هات و هاواری بێ مەعنای شەڕ شکایەت و دەردی دڵێکیان نییە.

إِذْ يَتَّقُونَ بِيَ الأَسِنَّةَ لَمْ أَخِـمْ    عَنْهَا وَلٰكِنِّي تَضَايَقَ مُقْدَمِي

«خیم»: ترس و لەرز.

«مقدم»: جێگای پەلامار.

دەڵێ: لە کاتێکداکە بە هۆی منەوە خۆیان لە نێزان دەپارێزن و ئەمن بکەنە سپەری خۆیان نە ترساوم، بەڵام جێگای پەلاماردانم تەنگ بۆتەوە و ڕێگای چوونە پێشەوەم نەماوە تا زۆرتر بڕۆم بۆ پێشەوە.

لَمَّا رَأَيْتُ الْقَوْمَ أَقْبَلَ جَمْعُهُمْ          يَتَذامَرُونَ كَرَرْتُ غَيْرَ مُذَمَّمِ

«تذامر»: هەڵنان بۆ شەڕ.

«كررت»: هێرشم برد.

دەڵێ: کاتێك دیم دوژمنەکان ڕوویان کردە لای ئێمە و یەکتر هەڵدەنێن بۆ بەربەرەکانێ گەڕامەوە و زۆر چاك شەڕم کرد و نەبوومە جێگای لۆمەکردن.

يَدْعُونَ عَنْتَرَ وَ الرِّماحُ كَأَنَّها          أَشْطانُ بِئْرٍ فِي لَبانِ الأَدْهَمِ

«اشطان»: جەمعی «شطن»، واتە: گوریسی دۆڵچەی ئاوهەڵکێشان.

«أدهم»: ئەسپی ڕەش.

دەڵێ: بانگیان دەکردم و ئەو نێزانەی کە بە سینگی ئەسپەکەمدا چووبوونە خوارەوە لە درێژیدا دەتگوت گوریسی دۆڵچەی ئاو هەڵکێشانن.

ما زِلْتُ أَرْمِيهِمْ بِثُغْرَةِ نَحْرِهِ          وَ لَبانِهِ حَتّىٰ تَسَرْبَلَ بِـالدَّمِ

«ثغرة»: چاڵ و پانایی سینگ.

«تسربل» ـ کراس لەبەرکردن.

دەڵێ: بەسینگی ئەسپەکەم بەرگریم لە دوژمنان دەکرد تا ئەوە بوو ئەسپەکەم کراسی خوێناوی پۆشی و تەواوی بەدەنی خوێناوی بوو.

فَأزْوَرَّ مِنْ وَقْعِ الْقَنا بِـلَبانِهِ          وَ شَكىٰ إلِيَّ بِعَبْرَةٍ وَ تَحَمْحُمِ

«ازورار»: مەیل و خۆبادان.

«تحمحم»: حیلەی ئەسپ.

دەڵێ: بەهۆی لێدانی نیزەوە سینگی بادا و بەفرمێسك و حیلەكردنەوە شكایەتی بۆلای من هێنا، واتە لە ئەسەری شیددەتی لێدانی نێزانەوە فرمێسكی هەڵوەراندن و حیلەی كرد تا بەزەییم پێدا بێتەوە.

لَوْ كٰانَ يَدْرِي مَا الْمُحٰاوَرَةُ اشْتَكىٰ          وَ لَكٰانَ لَوْ عَـلِمَ الْكَـلامَ مُكَـلِّمِي

دەڵێ: ئەگەر بیزانیایە گفتوگۆ بكا شكایەتی دەكرد و ئەگەر قسەشی بزانیایە قسەی لەگەڵ دەكردم. واتە ئەگەر زمانی قسە پێكردنی بوایە باسی ئێش و ئازاری برینەكانی خۆی دەكرد.

وَ لَقَدْ شَفىٰ نَفْسِي وَ أبْرَأ سُقمَهٰا          قِيلَ الْفَوٰارِسُ وَيْكَ عَنْتَرَ أَقْدِمِ

«ویك»: تێكەڵكراو لە «وی» بە مەعنا «ویل»، واتە وای بۆ تۆ. كافەكە بۆ خیتابە.

دەڵێ: شیفا و سەبووری و دەرمانی دەردی نەفسم قسەی ئەو چابوك سوارانە بوو كە دەیانگوت: وای بۆ تۆ ئەی عەنتەرە پەلامارە بدە، واتە باوەڕ پێكردن و هەڵنانی پیاوانی چەنگی بۆ من شیفابەخشی هەموو سەختی و ناڕەحەتی و دەردێك بوو.

وَ الْخَيلُ تَقْتَحِمُ الْخَبارَ عَوٰابساً  مِنْ بَيْنِ شَيْظَمَةٍ وَ أَجْرَدَ شَيْظَمِ

«خبار»: عەرزی نەرم.

«شیظم»: باڵا بەرز و قەد بڵند.

دەڵێ: ئەسپ و مایین سمیان بە عەرزی نەرمدا دەچووەخوارێ و لەبەر ماندووبوونیان ڕوویان گرژ بوو، هەموو مایین و ئەسپێکی باڵا بڵند و هەنگاو چوست و موو کورت بوون.

ذُلُلٌ رِكٰابِي حَيْثُ شِئْتُ مُشٰايعي  لُـبِّي، وَ أَحْـفِزُهُ بِأَمْـرٍ مَـبْرَمِ

«ذلل»: جەمعی «ذلول»ە واتە: وشتری ڕام کراو.

«رکاب»: وشتر.

«مشایع»: یار و یاوەر.

دەڵێ: وشترەکانم ڕاهاتوون بۆ هەر جێگا، ئارەزوو بکەم دێن و عەقڵم هەمیشە یار و یاوەرمە و بەرەو پێشەوەی دەبەم و بۆکاری دروست هەڵی دەنێم.

إِنِّي عَدٰانِي أَنْ أَزُورَكِ فَـاعْلَمِي  مٰا قَدْ عَلِمْتِ وَ بَعْضُ مٰا لَم تَعْلَمِي

«عدانی»: ئەمنی مەشغووڵ کرد.

«ما»: لە مەحەلدا مەڕفووع و فاعیلی «عدانی»یە.

دەڵێ: منی لە دیداری تۆ بێبەش کرد ئەو شتەی کە خۆت دەیزانی و هێندێکیش لەوەی کە تۆ نایزانی، لەوە ئاگادار بە.

خالَتْ رَماجُ ابْنَيْ بَغِيضٍ دوُنَكُمْ وَ زَوَتْ
جَـوانِي الْحَـرْبِ مَـنْ لَـمْ يُجْـرِمِ

«رماج»: بە فەتحەی ڕاء کینایە لە نێزەیە و لە ئەسڵدا بە مەعنا مابەینی گرێی داری نێزەیە.

«ابنی بفیض»: «عبس» و «ذبیان» و مەبەست جەنگی «داحس» و «غبرا»یە کە لە بەینیاندا ڕووی داوە.

«زوت»: ناچارکردن.

«جوانی»: جەمعی «جانیة»، یەعنی جینایەتکار.

«لم یجرم»: واتە جورم و خەتایەکی نەکردووە.

دەڵێ: شەڕ و نێزە وەشاندنی دوو تائیفەی «عبس» و «ذبیان» بوو بە مانیعی دیدار و گەیشتن بە تۆ و جینایەتکارانی جەنگ خەڵکی بێخەتا و خەتاباریان وادار بە جەنگ کرد، چونکە ئەوەی کە بەشداری لە شەڕدا نەکا دەکوژرێ.

وَ لَقَدْ خَشِيتُ بِأَنْ أَمُوتَ وَ لَم تَدُرْ لِلْحَرْبِ دائِرَةٌ عَلَى ابْنَيْ ضَـمْضَمِ

«دائره»: حادیسە، بەڵام لە کارەساتی ناخۆشیدا بەکار براوە.

«ابنی ضمضم»: مەبەست پێی «حصین» و «هەرم» دووکوڕەکەی «ضمضم»ن.

دەڵێ: دەترسم بمرم و ئەو دوو کوڕەی «ضمضم» قەت تووشی شەڕ نەبن.

الشّاتِمَيْ عِرْضِي وَ لَمْ أَشْتِمْهُما وَالنّاذِرَيْنِ إِذا لَمْ أَلْقَهُما دَمِـي

«الشاتمي»: دوو جنێودەر.

«**الناذرين**»: دو نەزر کەر.

«**دمي**»: خوێنم، واتە کوشتنم. وە لە تەرکیبدا مەفعوولە بۆ «ناذري» و لە تەقديردا مەنسووبە.

دەڵێ: ئەو کەسەکە جنێویان بەمن داوەو ئەمن جنێوم پێ نەداون و تا کاتێ لەگەڵیان ڕووبەڕوو نەبووم کوشتنی منیان لە سەرشانی خۆیان نەزر و واجب دەکەن، بەڵام لە بەرامبەرمدا جورئەت و جەسارەتی کارێکی وایان نییە.

---

**وَ لَقَدْ كَرَرْتُ الْمُهْرَ يَدْمِي نَحْرُهُ حَتَّى اتَّقَتْنِي الْخَيْلُ بِابْنَي حِذْيَمِ**

---

«**مهر**»: بە زەممەی میم، جوانووی ئەسپ.

«**حذيم**»: بە کەسرەی «حا» و سکوونی «ذال» و فەتحەی یێ، بە مەعنا تیژ و بڕندە و ماهیر. وە ناوی جێگایەکیشە لە «نەجد»، بەڵام وا دیارە مەعنای ئەووەڵ مەبەست بێ و مەبەست لە دوو کوڕەکانی دوو دەمی شمشیر بێ.

دەڵێ: جوانوو ئەسپەکەم بۆ مەیدانێ گێڕایەوە لە کاتێکدا خوێن لە سینگی دەهاتە خوارێ تا ئەو جێگایە کە سوارەکان، یان ئەسپەکان ببوونە پەناگا بۆ من، ئەمن بە واسیتەی دوو دەمی شمشێری بڕندەم دیفاعم لەوان دەکرد.

---

**إِنْ يَفْعَلا فَلَقَدْ تَرَكْتُ أَبَاهُمَا جَزَرَ السِّبَاعِ وَكُلِّ نَسْرٍ قَشْعَمِ**

---

«**قشعم**»: پیر.

دەڵێ: ئەگەر ئەو کارە بکەن جنێوم پێ ندەن، یان لە پاشە ملە هەڕەشەی کوشتنم لێ بکەن ناحەقیان نییە، چونکە ئەمن باوکی وانم کردۆتە خۆراکی دڕندان و داڵاشی پیر، کەواتە جنێودان و هەڕەشەکردنیان زۆر عەجایب نییە.

# موعەللەقەی حەوتەم

گۆیندەی ئەو قەسیدە حارسی کوڕی «ظلیم»ی کوڕی «حلزة»ی «یشکری» بەکری بووە و یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی تائیفەی بەکری کوڕی وائیل، کە لە ئاخری قەرنی شەشەمی زاییینیدا کۆچی دوایی کردووە، ناوبانگی شاعیری لە ئەسەری دانانی ئەو «معلقە»دا دەرکردووە کە لە بەحری خەفیفدایە و هەشتا و دوو شیعرە.

هۆی دانانی ئەو قەسیدە مەوزووعی قەزاوەت بە حزووری عەمری کوڕی هیند بوو، بۆ نەمانی دوو بەرەکی لە بەینی دوو تائیفەی «بەکرو تەغلەب» بوو. کە شاعیر لە دیفاع لە قەومەکەی خۆی و وەڵامی قسەکان و داواکانی عەمری کوڕی کولسوومدا دایناوە، دانانی ئەو «معلقە» بێبیرکردنەوە بووە و سنعەتی خوتبە خوێندنەوە و فنوونی جەنگی و هونەرنمایی و مەهارەتی تێدا بەرچاو دەکەوێ.

| رُبَّ ثَاوٍ يُمَلُّ مِنْهُ الثَّوَاءُ | آذَنَــتْنَا بِــبَيْنِهَا أَسْــمَاءُ |
|---|---|

«إيذان»: ئيعلام.

«اسماء»: ناوی مەعشووقە.

«بين»: فیراق و جودایی.

«ثواء» : نیشتەجێ.

دەڵێ: ئەسماء منی ئاگادار کرد کـە بـڕیـاریداوە جـیاوە بـێ، زۆر کـەسی نیشتەجێ کە نیشتەجێبوونیان دڵتەنگی هێنەرە، بەڵام «ئەسما» زۆر دەمـێکـە نیشتەجێیە، کەچی هەر وەك خۆی مەحبووب و خۆشەویست و موحتەرەمە.

| ءَ، فَأَدْنَىٰ دِيَارِهَا الْخَلْصَاءُ | بَعْدَ عَهْدٍ لَـنَا بِـبُرْقَةِ شَـمَّا |
|---|---|

«عهد»: دیدار، مولاقات.

«برقة»: زەوی ڕەق.

«شماء» و «خلصاء»: ناوی دوو جێگان.

دەڵێ: عەزمی لەسەر جیابوونەوە و لەپاش مولاقات و دیـدار لە بـوورقـەی «شماء» و نزیکترین مەنزڵەکەی «خلصاء» بوو.

| قُ فِتَاقٍ، فَعَاذِبٌ فَالْوَفَاءُ | فَالْمُحَيَّاةُ فَالصِّفَاحُ فَأَعْنَا |
|---|---|

دەڵێ: ئەو چەند جێگا ناوبراوە (شماء، خلصاء، محياة، صفاح، فتاق، وفاء)

شوێنی چاو پێکەوتن و مولاقاتی یار بوو، وە نزیکترین جێگای بووە. هەروەها ئەو چوار جێگایە کە لەو شیعرەی دواوەدا ناویان دەبرێ.

| | |
|---|---|
| فَــرِيٰاضُ الْـقَطٰا فَأَوْدِيَـةُ الشُّـرَ | يْبِ، فَـــالشُعْبَتٰانِ فَـــالأَبْلاٰءُ |
| لٰا أَرىٰ مَنْ عَهِدْتُ فِيهٰا فَأَبْكِي الْ | يَـوْمَ دَلْـهاً وَ مٰـا يُـحِيرُ الْـبُكٰاءُ |

«رياض القطا، أودية الشريب، شعبتان، أبلاء»: ناوی جێگان.

«دله»: بێ عەقڵ.

«إحارة»: ڕەدکردنەوە و وەڵامدانەوە.

دەڵێ: ئێستا نابینم ئەو کەسەی کە لەو جێگایانە چاوم پێ دەکەوت، بۆیە ئەو ڕۆ وەك دێوانان دەگریم، بەڵام داخوا گریان کەس دەگێڕێتەوە؟.

واتە: هەرچەند دەزانم کە گریان بێ سوودە، بەڵام گریان نەبێ چارەیەکی دیکەم نییە.

| | |
|---|---|
| وَ بِعَيْنَيْكَ أَوْقَدَتْ هِنْدٌ النّٰا | رَ أَخِيراً تُلْوِي بِهَا الْعَلْيٰاءُ |

«تلوی بها»: ئیشارە بەو دەکا.

«علیاء»: جێگای بڵند.

دەڵێ: هیند لە پێش دوو چاوی تۆوە لەو ئاخریانەدا ئاگری کردەوە و ئەو جێگا بڵندە هیندی نیشان دەدا و ئیشارەی پێ دەکرد. واتە ئەتۆ بە ئاشکرا هیندت دی.

| بِخَزَازَى، هَيْهَاتَ مِنْكَ الصِّلَاءُ | فَتَنَوَّرْتُ نَارَهَا مِنْ بَعِيدٍ |
|---|---|

«خزازی»: ناوی جێگایەکە.

«هیهات»: واتە دوور.

«صلاء»: «مصدر» و بە مەعنا سووتانە.

دەڵێ: لە دوورەوەڕا چاوم کەوت بە ئاگری هیند لە خەزازا و سووتان و گەرم بوونەوە لەتۆ دوور بوو، واتە بەرگری لە چوون بۆ لای هیند و ئیستیفادە لێکردنی مەوجوود بوو.

| نِ، بِعُودٍ كَمَا تَلُوحُ الضِّيَاءُ | أَوْقَدَتْهَا بَيْنَ الْعَقِيقِ فَشَخْصَيْـ |
|---|---|

«عقیق و شخصین»: ناوی دوو جێگان.

«عود»: دار.

«کما تلوح»: تەعەللوقی بەستوە بە «لاحت»ی موقەدەرەوە.

دەڵێ: ئەو ئاگرەی لە بەینی ئەو دوو جێگایەدا کردبۆوە بە دار و وەك تیشکی ڕۆژ دەدرەوشایەوە.

| ـمِ إِذَا خَفَّ بِالثَّوِيِّ النَّجَاءُ | غَيْرَ أَنِّي قَدْ أَسْتَعِينُ عَلَى الْهَمْـ |
|---|---|

«ثوی و ثاوی»: نیشتەجێ و «بێ»کەی بۆ تەعدیدی فیعلە.

«نجاء»: توند ڕۆیین.

دەڵێ: بەڵام ئەمن دەستم لە غەزەل و مەدح و باسی فەخرکردنی خۆم هەڵگرتووە لە ئەنجامی کار و بڕیاردانی خۆم لە کاتێکدا کە پەلەکردن و توندڕۆیشتن ئینسانی نیشتەجێ چوست و چالاك دەکا یارمەتی لێ وەردەگرم. واتە لەکاتی سەختی و ترس و غەم و خەفەت کە خەڵك بە پەلە جێگای خۆیان تەرك دەکەن و دەڕۆن، ئەمن لە وشترێکی وا یارمەتی وەردەگرم کە لێرە بە دواوە باسی دەکەم.

| مُ رِئالٍ، دَوِّيَّةٌ سَقْفاءُ | بِزَفُوفٍ كَأَنَّها هِقْلَةٌ أُمْ |
| --- | --- |

«زفیف»: توند ڕۆیشتنی نەعامە و بە ئەمانەت، بە ڕۆیشتنی غەیری ویش دەڵێن و «زفوف» سیغە موبالەغەیەتی.

«هقلة»: نەعامەی مێ.

«رئال»: جەمعی «رئل»، یەعنی بەچکەی نەعامە.

«دوية»: نیسبەت دراوە وەلای «دوّ» ـ بە تەشدیدی واو، بە مەعنا بیابانە. بەڵام زەوزەنی دەڵێ: لە «دوی»یە، بەڵام «دوی» بە بێ تا، لە قاموسدا نییە.

«سقفاء»: درێژی دوو لا هاتوو.

دەڵێ: ئەمن لەکاتی تەنگانەدا پەنا دەبەمە بەر وشترێك ڕزگارم کا، کە وەك نەعامەیەکی بەچکەدار کە هەمیشە لە سەحرا و بیابانە و قەدی درێژی دوولاهاتۆتەوە.

| نَاصُ عَصْراً وَ قَدْ دَنَا الإِمْسَاءُ | آنَسَتْ نَبْأَةً وَ أَفْزَعَها القُنْ |
| --- | --- |

«آنست»: هەستی کرد.

«نبأة»: دەنگی هێواش.

«قناص»: جەمعی «قانص» یەعنی ڕاوچی.

دەڵێ: نەعامەیەك کە هەستی بە دەنگێکی لەسەرخۆ کردبێ و ڕاوچییان ئەویان ترساندبێ لە کاتی عەسردا کە بەرەو ڕۆژئاوا بوون دەچێ و شەو دایێ. نەعامەیەکی واکە زۆر بە توندی بۆلای بەچکەکانی دەچێ. دەڵێ: ئەو وشترەی منیش وەك ئەو توندڕۆیە.

---

فَتَرىٰ خَلْفَهٰا مِنَ الرَّجْعِ وَ الْوَقْـ ـعِ مَـــنِيناً كَأَنَّـــهُ إِهْــبٰاءُ

---

«رجع و وقع»: وە حەڕەکە خستن و دەست لێدان و پێ لە عەرزێدان.

«منین»: تۆز و خۆڵی ورد و سووك.

«إهباء»: بە فەتحەی هەمزە جەمعی «هباء» و بە مەعنا وردە خاکی پەڕیوە لە هەوادا و بە کەسرەی هەمزەکە یەعنی هەڵدانی تۆز و خۆڵ.

دەڵێ: لە پاش سەریەوە دەبینی لە هەستان و دەست و پێ لە عەرزدانیدا تۆزێکی ورد کە دەڵێی مێرووڵەی وردیلەن لە هەوادا.

واتە: بە هۆی ڕۆیشتنی تۆزێکی ورد نەبێ هیچی دیکە نابینی.

---

وَ طِرٰاقاً مِنْ خَـلْفِهِنَّ طِـرٰاقٌ سٰاقِطٰاتٌ أَلْوَتْ بِهَا الصَّحْرٰاءُ

---

«طراق»: پێستی نەعل و مەبەست جێی پێیە.

«ألوی»: ئیشارەی کرد، نەیهێشت و لەبەینی برد.

دەڵێ: بە دوا ویدا جێ پێی زەلام و شوێنی نەعلی چەرم بە دوایدا دەبینی لەسەر عەرز دیارن کە دەشت و سەحرا نیشانیان دەدا و لە زۆر جێگا جێ پێکان کوێر بوونەوە.

| | |
|---|---|
| أَتَلَهَّى بِهَا الْهَوَاجِرَ إِذْ كُلْ | لُ ابْنِ هَمٍّ بَلِيَّةٌ عَـمْيَاءُ |

«ابن هم»: خاوەن غەم و کاری موهیم.

«بلية»: ئەو وشترەیە کە لەسەر گۆڕی خاوەنەکەی دەبەستنەوە تا دەمری.

دەڵێ: خۆمی پێوە مەشغووڵ دەکەم لە کاتی شیددەتی گەرمادا، لە کاتێکدا کە ئەوانەی سەرگەمی کارن، وەك وشتری بەستراوەی سەر گۆڕی خاوەنەکەی سەرگەردان بێ. واتە: لە کاتی سەختی و سەرگەردانی خەڵکدا ئەمن سواری ئەو وشترە دەبم و لە کەرەکانمدا سەرکەوتوو و خۆشبەختم.

| | |
|---|---|
| وَ أَتَانَا مِنَ الْحَوَادِثِ وَالْأَنْبَا | ءِ خَطْبٌ نُـعْنَىٰ بِـهِ وَ نُسَـاءُ |

«خطب»: کاری موهیم و گەورە.

«عنی بالامر»: بە سیغەی مەجهوول و مەعلووم یەعنی بەوەوە خەریك بووە زۆری مەبەست بوو، وە بەهۆی ئەوەوە تووشی زەحمەت و نارەحەتی بوو.

«نساء»: موزاریعی مەجهوول بۆ موتەکەلیمی لەگەڵ غەیرە لە «سوء»ی بە مەعنا غەمە.

دەڵێ: بەهۆی کارەسات و حادیسە و هەواڵی ناخۆش کە هاتوونە پێشێ کە زۆرمان موبالات پێ کردوون غەمبار بووین و بوونە هۆی ڕەنج و خەفەت بۆ ئێمە.

إِنَّ إِخْوَانَنَا الْأَرَاقِمَ يَغْلُو    نَ عَلَيْنَا فِي قِيلِهِمْ إِحْفَاءُ

«اراقم»: تیرەیەك بوون لە خێڵی تەغلەب کە ژنێك چاوی باوکانی ئەوانی شوبهاندووە بە چاوی ماری ڕەش و سپی، یان پیسترین مار و بەوناوەوە ناوبانگیان دەرکردبوو.

«غلو»: لە ئەندازە بەدەر.

«احفاء»: واتە ئیسراڕ.

دەڵێ: ئەوکارە دیشوارە ئەوەیە کە برادەرەکانمان کە تیرێکی لە خێڵی ئەرڕقەم لەسەر ئێمە زیادەڕۆییان کردووە لە قسەکانیاندا موبالەغە زۆرە و ئیسراڕ دەکەن.

يَخْلِطُونَ الْبَرِيَّ مِنَّا بِذِي الذَّنْـ    ـبِ، وَ لَا يَنْفَعُ الْخَلِيَّ الْخَلَاءُ

دەڵێ: خەتابار و بێ‌خەتایان لێك هەڵناوێرن و بێ‌خەتایی هیچ سوودێکی بۆ بێ‌خەتاکە نییە.

زَعَمُوا أَنَّ كُلَّ مَنْ ضَرَبَ الْعَيْـ    ـرَ مَوَالٍ لَنَا وَ أَنَّا الْوَلَاءُ

«عیر»: مەبەست پێ «کلیب وائل»ە. یان کەرە کێوی، یان بزمار، یان زبڵ و زاڵ و ناوی کێوێکیشە.

«موال»: بە زەمەی میم ئیسمی فاعیل بابی «مفاعله» و بە مەعنا یارمەتیدەر و دۆستە و بە فەتحەی جەمعی «مولی»یە و لێرەدا بە مەعنا کوڕە مامە.

«الولاء»: موزافەکەی حەزف کراوە و لە ئەسڵدا «اصحاب‌الولاء» بووە.

دەڵێ: قەبیلەی «أراقم» وا دەزانن کە هەر کەسێك بە کوشتنی «کلیب» ڕازی بێ کوڕە مامی ئێمە بووە و ئێمە گەورەیانین و گوناحی ئەوان پەیوەندی بە ئێمەوەیە.

یان دەڵێ: هەر کەسێك ڕاوی کەرەکێوی بکا، یان چادر هەڵدا، یا زبڵ و زاڵ لەسەر ئاو لابا، یان لەو کێوەدا بژی لە خزمان و پەیوەندی بە ئێمەوەیە و ئێمە شەریکی کارە خەراپەکانیانین.

| | |
|---|---|
| أَجْـمَعُوا أَمْـرَهُمْ عِشَـاءً فَـلَمَّا | أَصْبَحُوا أَصْبَحَتْ لَهُمْ ضَوْضَاءُ |

دەڵێ: لە شەوێدا هەموانیان بڕیاریاندا کە شەڕمان لەگەڵدا بکەن و بەیانی غەڵبە غەڵب و هەراو هۆریایان لێ پەیدا بوو.

| | |
|---|---|
| مِنْ مُنادٍ وَ مِنْ مُجِيبٍ وَ مِنْ تَصْـ | ـهالِ خَـيْلٍ خِـلالَ ذاكَ رُغَـاءُ |

«تصهال»: حیلەی وڵاغ.

«رغاء»: دەنگی وشتر.

دەڵێ: یەکێك بانگی دەکرد و یەکی دی وەڵامی دەدایەوە و ئەسپان حیلە حیلیان بوو، لەناو ئەو بگرە و بەردەی ئەوانیشدا دەنگی وشتران بەرز ببۆوە.

| | |
|---|---|
| أَيُّهَا النَّاطِقُ الْمُرَقِّشُ عَـنَّا | عِنْدَ عَمْرٍو وَ هَلْ لِذاكَ بَقَاءُ |

«ترقیش»: جوانکردن، بەڵام لێرەدا مەبەست لەو کەسەیە کە قسە دێنی و دەبا.

دەڵێ: ئەی ئەو کەسەی کە بە درۆ قسەی ئێمە دەبەی بۆ لای عەمری کوڕی هیند، ئایا ئەو درۆ و گەزافە گوتنە تا سەر دەوام دەکەن؟ نەخەیر قەت دەوام ناکەن، چونکە ئەتۆ ناتوانی پاشا بە درۆیان فریو بدەی و عاقیبەت درۆزن ڕیسوا دەبێ.

لا تَخَلْنا عَلىٰ غَـراتِكَ إِنّـا　　　　قَبْلُ ما قَدْ وَشَىٰ بِنَا الأَعْداءُ

«لا تخلنا»: لە «خال یخال»: یائییە و بە مەعنا وا زەن مەبە و مەفعوولی دووەمی مەحزووفە.

«غراة»: بێ دەستەڵات و زەعیف.

دەڵێ: ئەی ئەو کەسەی کە سەبارەت بە ئێمە دوو زمانیت کردووە. وا مەزانە کە لە بەرامبەر بە تۆدا، یان کەسێکی دیکە بێ دەسەڵات و زەعیف و زبوونین، لە پێش تۆشدا ناحەزانی ئێمە دوو زمانی و بەدگۆییان سەبارەت بە ئێمە زۆر کردووە، بەڵام هیچ گۆڕانێکی لە وەزعی ئێمە لەلای مەلیك پێ نەگۆڕاوە.

فَبَقِينا عَلَى الشَّناءَةِ تَنْمِيـ　　　　ـنا حُصُونٌ وَ عِزَّةٌ قَعْساءُ

«شناءة»: بوغز و کینە.

«نمی، تنمی»: بڵند دەکا.

«قعساء»: پایەدار.

دەڵێ: هەرچەند بەعزە کەسێك ڕقیان لە ئێمەیە و دوو زمانی و فیتنەییان سەبارەت بە ئێمە لە لای مەلیك کردووە، بەڵام ئێمە هەر وەك خۆمان ماوینەوە و بە کوێرایی چاوی دوژمنان قەدر و شەڕەف و حورمەتمان هەر زیادی کردووە.

| قَبْلَ مَا الْيَوْمِ بَيَّضَتْ بِعُيُونِ النْ | نَـاسِ فِـيهَا تَـغَيُّظٌ وَ إِبَـاءُ |
|---|---|

«ما»: وەك «بیّ»ی «بعیون» زائیدە.

«تبیض»: یەعنی سپیکردن و بریتییە لە کوێرکردن.

«فیها»: هایە کە بۆ «عزة»ی شیعری پێشەوە دەگەڕێتەوە. نیسبەتدانی «غیظ» و «اباء» وەلای «عزة» نیسبەتێکی مەجازییە، چونکە لە حەقیقەتدا مەنسووب بە ئەشخاسە.

دەڵێ: لەپێش ئەو ڕۆژدا عیززەت و گەورەیی و سەربەرزی ئێمە مایەی تووڕەبوونی خەڵك و سەربڵندی ئێمە بووە چاوی دوژمنانی کوێر کردووە.

| فَكَأَنَّ الْمَنُونَ تَـرْدِي بِـنَا أَرْ | عَنَ، جَوْناً يَنْجَابُ عَنْهُ الْعَمَاءُ |
|---|---|

«منون»: مەبەست زەمانە و ڕۆژگارە.

«تردی»: داوێژی.

«ارعن»: کێوی بڵند.

«جون»: لێرەدا یەعنی ڕەش.

«ینجاب»: لە «جوب»ە و بە مەعنا لاچوونە.

«عماء»: هەور.

دەڵێ: زەمانە کە ئێمەی کردۆتە هەدەف و وەبەر تیری بەڵاو مەسیبەتی داوین، وەك بڵێی کێوێکی بڵندی ڕەشی کردبێتە نیشانە کە ئەوەندە بەرز بێ هەور وەسەری نەکەوێ. کارەسات و بەسەرهاتی زەمانەش لە ئێمە نزیك دەبنەوە، بەڵام سوارمان نابن.

مُكْفَهِرّاً عَلَى الْحَوَادِثِ لَا تَرْ ... تُوهُ لِلدَّهْرِ مُؤْيِدٌ صَمَّاءُ

«اکفهرار»: ئەوپەڕی عەبووسی و ڕووترشی.
«رتو»: لێرەدا بە مەعنا شلکردن و داهێشتنە.
«مؤید»: لە «اید»ی بە مەعنا قووەتە و مەبەست ڕووداوی ناخۆش و خەتەرناکە.
«صماء»: سەخت.

دەڵێ: کێوێکی ئەوەندە بڵند لەگەڵ ڕووداوەکان ڕووگرژ دەبێ و کارەساتی نەخۆشی ڕۆژگار سست و زەبوونی ناکا.
دەڵێ: ئێمە لە قووەت و پایەداریدا ئەو کێوەین.

إِرَمِيٌّ بِمِثْلِهِ جَالَتِ الخَيْ ... لُ، فَتَأْبِي لِخَصْمِهَا الأَجْلاءَ

«ارمی»: نیسبەتە وەلای «إرم»ی باپیری عادی و سیفەتی عەمرە لە شیعری بیست و یەکدا.

دەڵێ: لە ئەولادی ئیرەمی کوڕی سامە و حەسەب و نەسەب و شەڕەفی قەدیمە، لە سایە و سێبەری زاتێکی وادا دەبێ سواران دەست بکەن بە دەور لێدان و دوژمنان نەتوانن ئەوان لەسەر جێگا و ڕێگای خۆیان وەدەر نێن.

مَلِكٌ مُقْسِطٌ وَ أَفْضَلُ مَنْ يَـمْـ شِي وَ مِنْ دُونِ مٰا لَدَيْهِ الثَّنٰاءُ

دەڵێ: پاشایەکی زۆر عادل و باشترین کەسێکە کە لەسەر زەوی بە ڕێگادا دەڕوا و هەرچەند مەدح و سەنای بکەی ناگاتە پلە و پایەی بەرزی قەدر و گەورەیی ئەو.

أَيَّمٰا خُـطَّةٍ أَرَدْتُـم فَأَدُّو هٰا إِلَيْنٰا تَمْشِي بِهَا الْأَمْلاءُ

«خطة»: بە زەمەی خا، بە کارێکی گەورە دەڵێن کە نیازی بە چارەکردن و ڕێگا پەیداکردنێك هەبێ بۆ لێ دەربازبوونی.
«املاء»: جەمعی «ملاء»ە. واتە کۆمەڵێك ئەشراف.
دەڵێ: هەرکارێکی موهیم و موشکیل کە پیاوە گەورەکان لە هات و چۆدابن و نەتوانن ڕێگای دەربازبوونی بۆ بدۆزنەوە و نەیانتوانی، ئەوە گەر بتهەوێ چارەی بکەی حەواڵەی ڕەئی و تەگبیری ئێمەی بکە.

إِنْ نَبَشْتُمْ مٰا بَيْنَ مِلْحَةَ فَالصّٰا قِبِ فِيهِ الْأَمْوٰاتُ وَ الْأَحْيٰاءُ

دەڵێ: ئەگەر ئەو قەبرانەی کە لە مابەینی «ملحه» و «صاقب»دان هەڵدەنەوە پڕن لە مردوو و زیندوو، واتە لەو شەڕانەی لە بەینی ئەو دوو جێگایانەدا ڕوویانداوە کوژراوانی بە بێ خوێندانیان و تۆڵە لێکردنەوەی ڕاستی تێدان و کوژراوەکانی ئێمەش کە تۆڵەیان کراوەتەوە کە وەك زیندوو بن لە وێدان.

| أَوْ نَقَشْتُمْ فَالنَّقْشُ يَجْشَمُهُ النَّا | سُ، وَ فِيهِ الْأَسْقَامُ وَ الْأَبْرَاءُ |
|---|---|

«نقش»: تەحقیق و لێکدانەوە.

«تکلف»: خۆ زەحمەتدان.

«اسقام و ابرام»: بە کەسرەی هەمزەی ئەووەڵ، مەسدەرن و بە فەتحەی جەمعی «سقم» و «برء» و بە مەعنا نەخۆشی و چاکبوونەوە و بریتین لە گوناحباری و بێ گوناحی.

دەڵێ: ئەگەر بە وردی لێکی بدەیەوە و تەحقیقی بکەی خەڵك توانای قبووڵکردنی زەحمەتی لێکدانەوەیان هەیە، گوناحی گوناحباران و بێ گوناحی بێ خەتایان مەعلووم و ئاشکرایە.

| أَوْ سَكَتُّمْ عَنَّا فَكُنَّا كَمَنْ أَغْ | مَضَ عَيْناً فِي جَفْنِهَا الْأَقْذَاءُ |
|---|---|

دەڵێ: وە ئەگەر بێ دەنگ بی و باسمان نەکەی، ئێمە وەك ئەو کەسە دەبین پووش و پەڵاشێ چووبێتە بژۆڵکانەوە و چاو دەنووقێنێ، واتە ڕق لە دڵدا و بێ دەنگ دادەنیشین.

| أَوْ مَنَعْتُمْ مَا تُسْأَلُونَ فَمَنْ حُدْ | دِثْتُمُوهُ لَهُ عَلَيْنَا الْعَلَاءُ |
|---|---|

دەڵێ: وە ئەگەر ئەو سوڵح و سەفاو ئاشتییەی ئێمە دەمانهەوێ ئەتۆ مەنعی دەکەی، کەواتە پێمان بڵێ ئەو کەسانە کێن کە بە تۆیان گوتووە کە ئەوان لە ئێمە نەجیبتر و بەشەڕەفترن؟

ئەوە بزانە کە کەس ڕێی ناکەوێ لە ئێمە بە شەڕەفتر بێ و ئێمە دەتوانین موقابەلە و شەڕتان لەگەڵ بکەین.

هَلْ عَلِمْتُمْ أَيّامَ يُنْتَهَبُ النّا سُ، غِواراً لِكُلِّ حَيٍّ عُواءُ

«هل»: بە مەعنا «قد».

«غوار»: تاڵان.

«حي» عەشیرەت.

«عُواء»: لوورەی گورگ، بەڵام لێرەدا بریتییە لە هات و هاوار و دەنگ و سەدایی وەختی تاڵان.

دەڵێ: ئایا لەبیرتە ئەو ڕۆژارانەی کە خەڵك تاڵان دەکراو هەر خێڵ و تائیفەیەك داد و فەریادی بوو؟ لەو شەڕانەدا شوجاعەت و ئازایەتی و مەردایەتی ئێمەت چاك لەبیرە؟

إِذْ رَفَعْنا الْجِمالَ مِنْ سَعَفِ الْبَحْ رَيْنِ سَيْراً حَتّىٰ نَهاها الْحِساءُ

«سعف»: لقی دارخورما.

«سیراً»: مەفعولی موتڵەقی فیعلێکی مەحزووفە وەك «سِرْنا»، واتە ڕۆیشتن.

«حساء»: ناوی جێگایەکە.

دەڵێ: کاتێ وشترەکانمان وادار بە ڕۆیشتن کردن، لە بەحرەینەوە تا «حساء» و بە پەلە ڕۆیشتین و دەستمان بەتاڵانی خێڵەکان کرد تا چووینە «حساء» کەس نەیتوانی پێشمان پێ بگرێ.

| ثُمَّ مِلْنا عَلَىٰ تَمِيمٍ فَأَحْرَمْ | نا، وَ فِينا بَنٰاتُ قَوْمٍ إِمٰاءُ |
|---|---|

«اَحْرَمَنا»: داخلی مانگە حەرامەکان بووین.

دەڵێ: لەپاشان ڕوومان کردە خێڵی تەمیم و تاڵانمان کرد و مانگە حەرامکراوەکان بەسەردا هاتن و کچە ئەسیرکراوەکانیان بوون بە کەنیزەکی ئێمە.

بۆ ئاگاداری! ئەو مانگانەی کە شەڕیان تێدا حەرام بوو بریتین لە زولقەعدە و زولحەجە و موحەڕڕەم و ڕەجەب.

| لا يُقِيمُ الْعَزِيزُ بِالْبَلَدِ السَّهْ | لِ، وَ لا يَنْفَعُ الذَّلِيلَ النَّجٰاءُ |
|---|---|

«نجاء»: واتە توند ڕۆیشتن.

دەڵێ: کات و وەزعێك بوو کە خێڵی بە دەسەڵاتیش نەیاندەتوانی لە دەشت و شوێنە هەموارەکاندا وەمێنن، بەڵکوو پەنایان دەبر بۆ بەر کێوەکان و ڕاکردنی پیاوی بێدەسەڵات و زەعیف فائیدەی نەبوو، چونکە شەڕ و زەرەر هەموو کەسی دەگرتەوە.

| لَيْسَ يُنْجِي الَّذِي يُوٰائِلُ مِنّٰا | رَأْسُ طَوْدٍ وَ حَرَّةٌ رَجْلٰاءُ |
|---|---|

«یوائل»: ڕا دەکا.

«طود»: کێو.

«حرة»: بە سەحرایەك دەڵێن کە بەردی ڕەشی زۆر بێ.

«رجلاء»: عەستەم.

دەڵێ: پەنابردنە سەر کێو و عەرزی بەرداوی ڕەش و شوێنی عاستەم، ئەو کەسانە ڕزگار و نەجات نادەن کە لە دەست ئێمە ڕابکەن.

| مَلِكٌ أَضْرَعَ البَرِيَّةَ لا يُو | جَدُ فِيها لِما لَدَيْهِ كِـفاءُ |
|---|---|

«اضرع»: ڕام و زەلیلکردن.

«کفاء»: مەسدەرە و بە مەعنا ئیسمی فاعیلە و بە مەعنا وەکوو وێنە.

دەڵێ: پاشایەکە هەموو خەڵکی هێناوەتە ژێر فەرمان و دەسەڵاتی خۆی و لەناو هەموو خەڵکدا هاوتا و وێنەی نییە.

| كَتَكاليفِ قَوْمِنا إِذْ غَزَا الْـمُنْ | ذِرُ هَلْ نَحْنُ لِابْنِ هِندٍ رِعاءُ |
|---|---|

«تکالیف»: موتەعەلیقە بە جوملەیەکی مەحزووف وەك «هل قـاسیتم مـن المشاق والشدائد؟» واتە ئایا ئێوە ناخۆشی و ناڕەحەتیتان دیوە وەك قەومەکەی من؟

«رعاء»: بە کەسرە و زەممەی ڕا، جەمعی «راعی» و بە مەعنا شوانە.

دەڵێ: لە شەڕەکانی «مونزیر» لەگەڵ دوژمنانیدا ئایا وەکوو قـەومـی ئـێمـە شەڕتان کرد و لەو تەکلیف و وەزیفانەی کە ئێمە خستبوومانە سەرشانی خۆمان ئێوە بەشداریتان تێدا کرد؟ یان ئێمە شوانی کوڕی هیندین وەك ئێوە؟

| ما أَصابُوا مِنْ تَغْلَبِيٍّ فَمَطْلُو | لٌ عَلَيْهِ إِذا أُصِـيبَ الْـعَفاءُ |
|---|---|

**«مطلول»**: یەعنی خوێنی بە هەدەرچووە.

**«عفاء»**: توزێك كە شوێن ون دەكا.

دەڵێ: هەر كەسێك كە لە «تەغلبیان» كوژرا خوێنی بە هەدەر ڕۆیشت و تۆڵەیان نەكردەوە وەك بڵێی خاك دایپۆشی و كۆن بوو، لەبەین چوو.

| | |
|---|---|
| إِذْ أَحَلَّ الْعَلْيٰاءَ قُبَّةَ مَـيْسُو | نَ، فَأَدْنٰى دِيٰارَهٰا الْعَوْصٰاءُ |

**«احلّ»**: زەمیری فاعیل لەودا بۆ مەلیك دەگەڕێتەوە.

**«علیاء»**: ئاسمان و تۆقە سەری كێو و جێگای بڵند.

**«میسون»**: ناوی ژنێكە

**«عوصاء»**: عەرزی سەخت.

دەڵێ: كاتێك مەلیك خێوەتی «مەیسوون»ی لە جێگایەكی بڵند هەڵدا و نزیكترین مەنزڵەكەی عەرزێكی زۆر سەخت بوو.

| | |
|---|---|
| فَتَأَوَّتْ لَهُ قَرٰاضِبَةٌ مِنْ | كُلِّ حَيٍّ كَأَنَّهُمْ أَلْـقٰاءُ |

**«تأوت»**: كۆبوونەوە.

**«قراضبة»**: جەمعی «قرضاب» یا «قرضوب»، یەعنی دزی پیس.

**«القاء»**: جەمعی «لقوة» واتە هەڵۆی مێ، یان سووك و سەریع.

دەڵێ: لە هەموو تائیفەیەك ئەو دزە پیسانە بۆی كۆبوونەوە دەتگوت هەڵۆ و داڵاشن لە قووەت و ئازایەتیدا.

فَهَداهُمْ بِالْأَسْوَدَيْنِ وَ أَمْرُ الـ ـلّهِ بَلْغٌ تَشقىٰ بِهِ الْأَشْـقِيٰاءُ

**«هداهم»**: وەپێشیان کەوت، یان بۆ پێشەوەی بردن.

**«اسودان»**: دوو ڕەش، یەعنی خورما و ئاو.

**«بلغ»**: بە فەتحەی «با»کە و سکوونی لام یەعنی ئەمری خوا دێتە جێ.

دەڵێ: پاشا ئەو لەشکەرەی بە زەخیرە و خورما و ئاوەوە ناردە مەیدانی جەنگ و قەزاو قەدەری خوا خەراپکاران تووشی بەدبەختی دەکا.

إِذْ تَمَنَّوْنَهُمْ غُرُوراً فَساقَتْـ ـهُمْ إِلَيْكُمْ أُمْـنِيَّةٌ أَشْـرٰاءُ

**«امنية»**: ئارەزوو.

**«اشراء»**: لەسەر وەزنی «فعلاء» لە مەسدەری «اشر»ە و بە مەعنا غووروورئامێز.

دەڵێ: ڕووی قسەی لەگەڵ «بەنی تەغلەب»ە و دەڵێ: ئێوە کاتێ لە ڕووی غروور و خودپەسەندی و غەفڵەتەوە ئارەزووی شەڕکردنتان بوو لەگەڵیان، ئارەزووی غروورئامێزی ئێوە بوو ئەوانی هێنایە سەر ئێوە.

لَمْ يَـغَرُّوكُـمْ غُـرُوراً وَ لٰكِـنْ رَفَعَ الْآلُ شَخْصَهُمْ وَ الضَّحٰاءُ

**«آل»**: وەك سەراب وایە لە ئەووەڵی ڕۆژ و ئاخری ڕۆژدا دەبیندرێ، واتە کاتێك زۆر گەرم بوو لە دەشت و سەحرا شتێك دەبینی وەك ئاو دەچێ.

**«ضحاء»**: کاتی بەرزبوونەوەی ڕۆژ.

دەڵێ: خۆ ئێوەیان فریو نەدا و بێ خەبەر نەهاتن، بەڵکوو بە ئاشکرا و لە پێش چاوی خۆتان ڕوویان تێ کردن، دەتگوت سەراب هەیکەلی ئەوانی بڵند کردووە و بە ئێوەی نیشان‌داوە و لە وەختی نێوەڕۆ و لە ناو ئەمواجی سەرابدا ئەو لەشکەرەتان دەدی.

| أَيُّــهَا النَّــاطِقُ الْــمُبَلِّغُ عَــنَّا | عِنْدَ عَمْرٍو وَ هَلْ لِذاكَ اِنْتِهاءُ |
|---|---|

دەڵێ: ئەی قسەکەری خەبەر دەر! لە لای عەمری کوڕی هیند بەرعەلەیی ئێمە، ئایا دەست لەو درۆ و بوختانانە هەڵناگری؟

| مَنْ لَنا عِنْدَهُ مِنَ الْخَيْرِ آيا | تٌ ثَلاثٌ فِي كُلِّهِنَّ الْقَضاءُ |
|---|---|

دەڵێ: لە لای کەسێك کە بۆ ئێمە لەلای ئەو سێ دەلیل و عەلامەت و بەڵگە هەن لەسەر وەفاداری و جەنگاوەری ئێمە کە لە هەمووی ئەوانەدا داوەری و قەزاوەتی خەڵك بە قازانجی ئێمەیە.

| آيَةٌ شارِقُ الشَّقِيقَةِ اِذْ جا | ءَتْ مَعَدٌّ لِكُلِّ حَيٍّ لِـواءُ |
|---|---|

«شارق»: ڕۆژ لەوەختی هەڵاتندا.

«شقیقة»: یەعنی عەرزێکی سەخت لە بەینی دوو باسکی خۆڵدا.

دەڵێ: یەکیان ئەو شەڕە بوو کە لەکاتی ڕۆژ هەڵاتندا لەسەر ئەو عەرزەی کە خێڵی مەعدی هاتن و هەر تیرەیەك ئاڵای خۆی پێ بوو.

حَوْلَ قَيْسٍ مُستَلْئِمِينَ بِكَبْشٍ        قَــــرَظِيٍّ كَأَنَّــــهُ عَــبْلاءُ

قەیسی کوڕی مەعدی کەریبە یەکێك بوو لە ملووکی حومەیەرەکان.

**«مستلئم»**: زرێپۆش.

**«قرظ»**:گەڵای دارێکە بۆ دەباغ بەکار دەبرێ و بیلادی قەرەزی وڵاتی یەمەنە.

**«کبش»**: بەرانە و لێرەدا مەبەست پێی گەورە و ڕەئیسی قەومە.

**«قرظی»**: یەعنی یەمەنی.

**«عبلاء»**: بە قسەی زەوزەنی تەپۆڵکەیەکی سپی و بە نووسینی قامووسیش بەردە، یان بەردی سپیە.

دەڵێ: خێڵەکانی مەعد زرێیان پۆشی بوو، دەورەی ڕەئیسی یەمەنیان گرتبوو کە وەك بەردێکی سەخت وابوو، ئێمە شەڕمان لەگەڵ کردن و شەڕی وانمان لە عەمری کوڕی هیند دوور خستەوە.

وَ صَتِيتٍ مِنَ الْعَوَاتِكِ لَا تَنْـ        ـهَــاهُ إِلّا مُــبْيَضَّةٌ رَعْـلاءُ

**«صتیت»**: جەماعەت.

**«عواتك»**: ژنانی جوانی ئازاد و مەبەست ئەولادی وانن.

**«مبیضة»**: سپی، سیفەتە بۆ دەستەیێکی حەزف کراو. یەعنی دەستەیەك لە سواران، یان فیرقەیەك لە لشکەریان و بە قسەی هێندێکان سیفەتی شمشێرە.

**«رعلاء»**: تولانی.

**«صتیت»**: عەتفە بۆ سەر «آیة» لە شیعری چل و نۆدا و دەلیلی دووەمە و دەبۆ مەرفووع بوایە و زاهیرەن دەلیلی مەجروربوونی «رُبَّ»ی تەقدیرییە.

دەڵێ: دەلیل و نیشانەی دووەم ئەوەیە، ئەی کە تا ئێستا زۆر لە جەماعەتی کوڕانی ژنانی ئازاد و جوان کە نابێتە مانیعیان و پێشیان پێ بگری مەگەر دەستەیەك لە لشکریانی سپی بە واسیتەی زرێ لەبەرکردنیان و کڵاو خودی سەریان کە بڵند و گەورەیە، یان بە واسیتەی شمشێری سپی درێژەوە، ئێمە لە بەرامبەر حەملەی ئەوانەوە موقاوەمەتمان کرد و نەمانهێشت تاڵان و بڕۆ بکەن.

| | |
|---|---|
| فَرَدَدْنٰاهُمْ بِطَعْنٍ كَمٰا يَـخْ | رُجُ مِنْ خَرْبَةِ الْمَزٰادِ الْمٰاءُ |

«کما یخرج»: پەیوەندی بە «خَرَج»ی موقەدەرەوەیـە. یـەعنی ڕۆیـی، وەك ڕۆیشتنی ئاو.

«**خربة**»: کون.

«مزاد»: مەشکەی ئاو، یەعنی دەمی مەشکە.

دەڵێ: ئەوانمان گێڕانەوە بە زەربی نێزان کە خوێن لە برینی ئەو نێزانە جاری دەبوو وەك جاریبوونی ئاو لە زالکی مەشکەی ئاو.

| | |
|---|---|
| وَ حَمَلْنٰاهُمْ عَلیٰ حَزْمِ ثَهْلا | نَ، شِلاٰلاً وَ دُمِّيَ الْأَنْسٰاءُ |

«حزم»: عەرزی سەخت و بڵند.

«ثهلان»: ناوی کێوێکە.

«شلال»: خەڵکی پەرت و بڵاو

«انساء»: جەمعی «نسا» کە ڕەگێکە لە ناو ڕاندا پێی دەڵێن: «عِرقُ النَّسٰاء».

دەڵێ: ئێمە تینمان بۆ هێنان و وادارمان کردن کە ڕا بکەن بۆ سەر عەرزی سەخت و بڵندی کێو «ثهلان» و لە حاڵێکدا کە پەرێشان بوون ڕەگی ڕان و پێیان خوێناوی بوو بوو.

وَ جَبَهْنَاهُمْ بِطَعْنٍ كَمَا تُنْـ هَزُ فِي جَمَّةِ الطَّوِيِّ الدِّلَاءُ

«جبه»: بە شیددەتی بەرپەرچدانەوە و مەنعکردن.

«نهز»: تەکاندان.

«جمة»: ئاوی زۆر کۆبۆوە.

«طوی»: چاڵاوی سەنگ چین، واتە بە بەرد دەورەی هەڵچندرا بێ.

«دلاء»: جەمعی «دلو»، واتە دۆڵچە.

دەڵێ: زۆر بەتوندی بەر پەرچمان دانەوە و مەنعمان کرد بە لێدانی ئەو نێزانەی کە لە بەدەنیاندا وەك دۆڵچە بخەیتە ناو ئاوێکی زۆری بیراوێکەوە وەحەرەکە کەوتبوو.

وَ فَعَلْنَا بِهِمْ كَمَا عَلِمَ اللَّـ هُ، وَ مَا إِنْ لِلْحَائِنِينَ دِمَاءُ

«ما إن»: «إن» زیادەیە.

«حائن»: ئەحمەق و بەهیلاك چوو کە لێرەدا دووەمەکەیان مرادە.

دەڵێ: کارێکمان لەگەڵ کردن مەگەر هەر خوا بزانێ و ئەوانەی کە بە هیلاك چوون خوێنیان نییە، واتە کەس خەریکی تۆڵەکردنەوەیان و خوێن وەرگرتنیان نییە.

ثُمَّ حُجْراً أَعْنِي ابْنَ أُمِّ قَطَامٍ        وَ لَهُ فَارِسِيَّةٌ خَضْرَاءُ

«فارسية»: لشکرچی فارسی، یان زرێی فارسی.

«خضراء»: سەوز بە واسیتەی ژەنگ لێدانی ئەسلەحەکەیان. زاهیر وایە کە ئەوە سێیەمین دەلیل بێ، بەڵام زەوزەنی مەعنای شیعری «٦١» بە دەلیلی سێیەم دەزانێ وەك لێرە بە دواوە دێ.

دەڵێ: سێیەم ئەوەیە کە حوجری کوڕی «أم قطام» شەڕی دەست پێ کرد و ئێمە بە ڕەنگاریمان کرد، لە کاتێکدا کە سپای ئێرانی، یان زرێی دروست کراوی ئێرانی هەبوو، کڵاوە خودیەکەی حوجری ژەنگی لێدا بوو زەرد هەڵگەڕا بوو، لەوانەشە «خضراء»: مەبەست پێ زۆربەی قەومەکە بێ.

أَسَدٌ فِي اللِّقَاءِ، وَرْدٌ هَمُوسٌ        وَ رَبِيعٌ إِنْ شَمَّرَتْ غَبْرَاءُ

«ورد»: ڕەنگ سوور.

«هموس»: لە هەمسە و بە مەعنا خشپەی پێیە.

«ربیع»: بارانی بەهارە.

«شمر»: حازر و ئامادە. یان مەعنا سەختە.

«غبراء»: سیفەتی ساڵە و بە مەعنا وشکساڵی و گرانییە.

دەڵێ: ئەو حوجرە لە شەڕدا وەك شێرێکی ڕەنگ سوورە و خشپەی پێیانی وەك دەنگی پێی شێر وایە و لە ساڵی بێ‌بارانی و گرانیدا ئەوەندە سەخییە وەك بارانی بەهار وایە.

یەعنی لە شەڕدا وەك شێری ئازا و لە کاتی گرانیشدا وەك بارانی ڕەحمەتی بەهارییە و سفرە و خوانی ئیحسانە و لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە غاڵب بووین بە سەریدا و گێڕامانەوە.

وَ فَكَكْنا غُلَّ امْرِئِ الْقَيْسِ عَنْهُ ... بَعْدَ ما طَالَ حَبْسُهُ وَ الْعَنَاءُ

دەڵێ: «امری القیس»ی کوڕی مونزیری برای هیند کە کاتێ مونزیر کوژرا و ئەویان ئەسیر کرد ئێمەی خێڵی بەنیبەکر لە زیندان ڕزگارمان کرد لە پاش حەبس و ناڕەحەتییەکی زۆر.

وَ مَعَ الْجَوْنِ جَوْنِ آلِ بَنِي الْأَوْ ... سِ عَنُودٌ كَأَنَّهَا دَفْوَاءُ

«جون»: مەلیکێك بوو لە مەلیکەکانی «کندە» و بە چەند چەکدارەوە هاتە سەر خێڵی بەنیبەکر و شەڕیان لەگەڵ کرد و شکاندیان و کوڕەکەیان ئەسیر کردو هێنایان بۆ لای مەنزیری.

«عنود»: سیفەتە بۆ دەستە لەشکری موقەددەر، واتە لشکرێکی داخ لە دڵ و ئینکار.

«دفواء»: بەپێی نووسینی زەوزەنی بە مەعنا تەپۆڵکە و کێوە، بەڵام قامووس دەڵێ: هەڵۆی دەندوك خوارە.

دەڵێ: لەگەڵ «جون» و بەسەرکردایەتی ئەو لە خێڵی «ئەوس» کە کەسانێکی زۆر داخ لەدڵ بوون وەك هەڵۆیان شەڕیان کرد.

| مٰا جَزِعْنٰا تَحْتَ العَجٰاجَةِ إِذْ وَلْـ | لَوْا شِلالاً وَ إِذْ تَلَظّٰى الصِّلٰاءُ |
|---|---|

«عجاجة»: تۆز و غوبار.

دەڵێ: ئێمە جەزەع و فەزەعمان کرد و بێزاریمان دەر نەبڕی لە ژێر تۆز و غوباری شەڕدا لەوکاتەداکە بڵاوبوونەوە وکشانەوە و ئاگری شەڕ بڵیسەی دابوو.

| وَ أَقَدْنٰاهُ رَبَّ غَسّٰانَ بِـالْمُنْـ | ذِرِ كَرْهاً إِذْ لٰا تُكٰالُ الدِّمٰاءُ |
|---|---|

دەڵێ: بۆ تۆڵە لێکردنەوە مەڵێکی غەسانمان تەسلیم بە بەنیبەکر کرد تا لە تۆڵەی کوشتنی مەنزیردا بیکوژنەوە.

بەقسەی زەوزەنی دەڵێ: لە کاتێکدا کە کەس نەیدەتوانی تۆڵەیان لێ بکاتەوە و لە کاتێکداکە خوێن لە ئەندازە بەدەر ڕژا بوو ئەوان بە زۆر ئەوکارەیان کرد، کە ئەوەش ئایەت و دەلیلی سێیەمە وەك زەوزەنی نووسیویەتی.

| وَ أَتَيْنٰاهُمُ بِتِسْعَةِ أَمْـلا | كٍ كِرٰامٍ أَسْلاٰبُهُمْ أَغْلٰاءُ |
|---|---|

«اسلاب»: جەمعی سەلەب، یەعنی لیباس و سیلاح و وەڵاغی کوژراوەکان و ئەسیرەکان.

دەڵێن مونزیری کوڕی «ماء السماء» لەشکرێکی نارد کوڕەکانی «حوجریان» گرتن و هێنایانن بۆ «حیرە» و ئەمری کرد بیان کوژن.

جا شاعیر دەڵێ: نۆ کوڕە پاشای گەورە و شەریف کە لیباس و سیلاح و وەڵاغی گرانبەهایان بوو ئەسیرمان کردن و بردمانن بۆلایان.

| وَ وَلَدْنَا عَمْرَو بْنَ أُمِّ أُنَاسٍ | مِنْ قَرِيبٍ لَمَّا أَتَانَا الْحِبَاءُ |
|---|---|

«حباء»: مارەکردن.

دەڵێ: کاتێ زانیمان کە مەلیك پیاوی چاکە و بۆ وەی دەبێ خزمایەتی لەگەڵ بگرین «أم أناس»مان لێ مارە کرد و عەمری کوڕی حوجری کندی لێ‌بوو کە دەبێتە باپیری عەمری کوڕی هیند، واتە عەمری کوڕی «ام اناس» بەو زوانە کە حەقە مارەیی دایکی ئێمە وەرمان گرت لە ئێمە بووە و دایکی لە ئێمەیە و ئێمە خاڵ و برای دایکی ئەوین.

| مِثْلُهَا يُخْرِجُ النَصِيحَةَ لِلْقَوْ | مِ فَلَاةٌ مِنْ دُونِـهَا أَفْـلَاءُ |
|---|---|

«مثلها»: زەمیرەکـەی دەگـەڕێتـەوە بـۆ «قـەرابـەت» کـە شـیعری پـێشـوو دەیگەیێنێ.

«افلاء»: جەمعی «فلا» و ئەویش دووبارە جەمعی «فلاة»ە، واتە سەحرا.

دەڵێ: وێنەی ئەو خزمایەتییە دەبێتە هۆی پەند و دڵسۆزی سـەبارەت بـە خزمان.

دەڵێ: خزمایەتی وەك دەشت و سەحرایەکە کە لە نزیك چـەند دەشت و سەحرای دیکەوە بێ و خزمایەتی ئێمەش کە وەك ئـەو سـەحرایـانە پـێکـەوە جووت بوون بۆتە هۆی ئەوەی ئامۆژگاری دڵسۆزی خۆمان نیسبەت بە پاشاو قەومەکەی دەربڕین.

| فَاتْرَكُوا الطَّيْخَ و التَّعَاشِي وَ إِمَّا | تَتَعَاشَوْا فَـفِي التَّـعَاشِي الدَّاءُ |
|---|---|

**«طيخ»**: تەکەبور.

**«تعاشی»**: خۆت وەك کوێر و نەزانان لێ بکەی.

دەڵێ: ئەو تەکەبورە خۆ بە زلزانین و خۆ گێلکردنە تەرك بکە، ئەگەر وەك کەڕ و نەزانان خۆت نیشان بدەی دەبێتە باعیسی دەردیسەری و بە هیلاك چوونی خۆت.

| وَاذْكُرُوا حِلْفَ الْمَجَازِ وَ مَا قُدْ | دِمَ فِـيهِ الْـعُهُودُ وَ الْكُـفَلَاءُ |
|---|---|

دەڵێ: وەیادی خۆتان بێننەوە ئەو پەیمان و سوێندخواردنەی کە لە «ذی المجار» ڕوویدا و ئەوەی کە لەو پەیمان و بەبارمتەگیراوانەدا هاتە پێشێ. لەو شیعرەدا ئیشارە دەکا بەو سوڵح و ئاشتییەی کە عەمری کوڕی هیند لە بەینی دوو خێڵی بەنیبەکر و بەنیتەغلەبیدا کرد و لە هەر لایەی هەشتا نەفەری بە بارمتە گرتبوو.

| حَذَرَ الْجَوْرِ و التَّعَدِّي وَ هَلْ يَنْـ | قُضُ، مَا فِي الْمَهَارِقِ الْأَهْوَاءُ |
|---|---|

**«حذر»**: «مفعولٌ لَهُ»یە بۆ فیعلەکانی شیعری پێشوو.

**«مهارق»**: جەمعی «مهرق» و لە «مُهر کرد»ی فارسی وەرگیراوە وەك زەوزەنی دەڵێ: واتە نامە و سەحیفە.

دەڵێ: ئەو عەهد و پەیمان و سوێندە لە ترسی زوڵم و تەجاوەزی یەکێك لەو دوو لایەنە بوو، وە ئایا هەواو هەوەس پەیمان نامە بەتاڵ دەکاتەوە؟

وَاعْلَمُوا أَنَّـنا وَ إِيّـاكُـمْ فِـيـ ... مَا اشْتَرَطْنا يَوْمَ اخْتَلَفْنا سَواءُ

دەڵێ: ئێوە بزانن ئێمەو ئێوە لەوەیدا کە لە ڕۆژی جودایی و لێکبوونەوەماندا وەك یەك بووین کە هەر خەراپەیەك ڕوو بدا هەر دوولامان خەتابار بین، ئەی بۆچی هەر ئێمە خەتابار دەکەن؟

عَنَناً بٰاطِلاً وَ ظُـلْماً كَـمٰا تُـعْـ ... تَرُ عَنْ حُجْرَةٍ الرَّبِيضِ، اَلظِّبٰاءُ

«عنن»: ئیسمێکە لە «عنّ»، واتە ئاشکرا بوو و هاتە پێشەوە.

«تعتر»: لە «عتیرة»ە ئەویش ئەوە بۆ عەرەبێك لەسەر شانی خۆی نەزر دەکرد و دەیگوت: ئەگەر وشترەکانم، یان مەڕەکانم بوون بە سەد سەر لە مانگی ڕەجەبدا یەکیان بکەم بە قوربانی بۆ بتەکان، بەزۆریش کە دەبوون بەسەت لەباتی مەڕەکە ئاسکێکی دەکوشت و دەیکرد بە قوربانی.

«حجرة»: بەو جێگایە دەڵێن کە مەڕی لێ بن.

«ربیض» مێگەلە مەڕ.

دەڵێ: ڕوودانێکی بەتاڵ و زوڵمێك بوو ئەوە کە گوناحی خەڵکیو لەسەر ئێمە حیساب دەکرد، وەك سەربڕینی ئاسکەکان لە باتی ئەو مەڕەی کە نەزر کرا بوو سەر ببڕێ.

| نَمَ غٰازِيِهِمْ وَ مِنّا الْجَزاءُ | أَعَلَيْنا جُنٰاحُ كِنْدَةَ أَنْ يَغْ |
|---|---|

دەڵێ: ئایا گوناحی «کندە» لەسەر ئێمە حیساب دەکەن کە شەڕکەرەکانیان ئێوە تاڵان بکەن و ئێمە تۆڵەی تاوانی ئەوان بدەین؟ ئەوە لۆمە و وەیاد خستنەوەی عەیبی شکان و تاڵانکردنی ئەوانە.

| طَ بِجَوْزِ الْمُحَمَّلِ الْأَعْباءُ | أَمْ عَلَيْنا جَرَّىٰ أَيٰادٍ كَمٰا نِيـ |
|---|---|

**«جری»**: بە قەسر و مەد. یەعنی جینایەت.

**«نوط»**: هەڵاوەسین.

**«جوز»**: ناوەڕاست.

**«محمل»**: وشتری بارکراو.

**«اعباء»**: جەمعی «عِب»، یەعنی بار و گرانی.

دەڵێ: ئایا ئەو جینایەتەی کە ئەیادی کوڕی نزار کردی ئێمە بووین کە لەسەر ئێمەو حیساب کرد و بە ئیمەوەتان چەسپاند وەك بەستن و هەڵاوەسینی بارێکی گران لەسەر پشتی وشتری بارەبەر؟

| سُ وَ لا جَنْدَلٌ وَ لاَ الْحَدّاءُ | لَيْسَ مِنّا الْمُضَرَّبُونَ وَ لا قَيْ |
|---|---|

**«مضرب»**: لە نوسخەی زەوزەنیدا بە فەتحەی «ڕا»کەیە و زاهیر ئەوەیە کە ئیسمی فاعیلی «ضرب» بێ، واتە ئەوانەی شەڕ و فیتنە هەڵدایسێنن کە زەوزەنی

هیچ ئیشارەیەکی بە سیغە و مەعناکەی نەکردووە و دووبارە ئەو سێ کەسە ناو براوەی لە بەشێك لە فیتنەگێڕەکان حیساب کردووە.

دەڵێ: خۆ ئەو کەسانەی شەڕ و فیتنەیان دەوێ و ئەو سێ کەسە (قەیس و جەندەل و حەداء) لە ئێمە نین.

أَمْ جَنٰايٰا بَنِي عَتِيقٍ فَمَنْ يَغْ　　　دِرْ فَإِنّٰا مِنْ حَـرْبِهِمْ بُـرٰاءُ

دەڵێ: ئایا جینایەتکارانی بەنی عەتیق لە ئێمەن؟ ئەگەر کەسێك بیهەوێ غەدر بکا و پەیمان بشکێنی، ئەوە ئێمە لە شەڕکردن بەری و بێزارین.

وَ ثَمٰانُونَ مِنْ تَـمِيمٍ بأَيْـدِيـ　　　ـهِمْ رِمٰاحٌ صُدُورُهنَّ الْقَضٰاءُ

«صدور»: جەمعی «صدر» بەرزترین شوێن.

«رماح»: ڕم، نێزە.

«قضاء»: مردن.

دەڵێ: عەمری ئەولادی سەعدی کوڕی زەید کە بە خۆی و هەشتا نەفەر لە تەمیمیان کە نێزەی مەرگ ئاوەر و کوشندەیان بە دەستەوە بوو پەیوەندی بە ئێمەوەیە و گوناحیان لە ملی ئێمەدایە؟

تَرَكُوهُم مُلَحَّبِينَ وَ آبُوا　　　بِنِهٰابٍ يُصِمُّ مِنْهَا الْحُدٰاءُ

«ملحب»: لەت‌لەت بووە.

«نهاب»: تاڵان.

«یصم»: کەڕ دەکا.

«حداء»: گۆرانی بۆ لێ خوڕینی وشتر.

دەڵێ: تەمیمیەکان ئەوانیان بە زەربی شمشێر لەت و پەت کرد و بەجێیان هێشتن و بە تاڵانێکی زۆرەوە گەڕانەوە کە دەنگی وشترەوانەکانیان گوێیان کەڕ دەکرد.

| أَمْ عَلَيْنٰا جَرَّىٰ حَنِيفَةَ أَمْ مٰا | جَمَّعَتْ مِنْ مُحٰارِبٍ غَبْراءُ |
|---|---|

«جرّی»: جینایەتی کرد.

«غبراء»: هەژارەکان.

دەڵێ: یان لەسەر ئێمە حیساب دەکرێ جینایەتی بەنی‌حەنیفە، یان ئەو جەنگاوەرانەی کە سەرزەمینی خۆڵاوی ئەوانی لە باوەش کردبوو.

| أَمْ عَلَيْنٰا جَرَّىٰ قُضٰاعَةَ أَمْ لَيْ | سَ عَلَيْنٰا فِيمٰا جَنَوْا أَنْـداءُ |
|---|---|

«انداء»: جەمعی «ندی» کە مەعنای زۆری هەیە، وەك باران و گیا و شەونم و غایەت و شتی‌تر. وە هیچ یەك لەوانە موناسیب نین و زەوزەنی ئەوی ئاوا مەعنا کردووە کە بە ئێمە نەلکێ و لەسەر ئێمە لازم نەبێ، ڕەنگە بتوانی بڵێی شەونمێك لەسەر ئێمە نەنیشێ.

دەڵێ: یان جینایەتی «قُضاعه» لە گەردنی ئێمەدایە، یان ئێمە دەخالەتمان تێدا نەکردووە.

| ثُمَّ جاؤُوا يَسْتَرْجِعُونَ فَلَمْ تَرْ | جِعْ لَهُمْ شامَةٌ وَ لا زَهْراءُ |
|---|---|

«شامة»: خاڵ و مەبەست حەیوانی خالدارە.
«زهراء»: سپی.

دەڵێ: لەپاشان بۆ گەڕانەوەی ماڵە تاڵانکراوەکەیان هاتنەوە بەڵام نە مەڕێکی خاڵدار و نە مەڕێکی سپیان بۆ نەگەڕایەوە. واتە تاڵانەکەی خۆیان وەر نەگرتەوە.

| لَمْ يُحِلُّوا بَنِي رِزاحٍ بِبَرْقا | ءِ نِطاعٍ لَهُمْ عَلَيْهِمْ دُعاءُ |
|---|---|

«برقاء»: عەرزی بەرداوی و ڕملاوی.
«نطاع»: بەکەسرە و بە فەتحەی نوون، گوندێکە لە بەحرەین ئی بەنی ڕزاحە.

دەڵێ: قەومەکەی من لە «بەرقائی نطاع»دا دەست درێژییان نەکردۆتە سەر ژنانی «بەنی ڕزاح» تا دوعای شەڕیان لێ بکەن و داوایەکیان لەسەر هەبن. ئەوە ئێوەن کە ئەوکارە ناشیرینە و ناپیاوانەتان کردووە.

| ثُمَّ فاؤُوا مِنهُمْ بِقاصِمَةِ الظَّهْ | رِ، وَ لا يَبْرُدُ الْغَلِيلَ الْماءُ |
|---|---|

«قاصمة»: کارەساتێکی پشت شکێنەرە، یان بەسەر هاتێکی کەلەکەبڕ.
«غليل»: تینوایەتی زۆر و بوغز و کینە و داغ لە دڵ.

دەڵێ: لە پاشان بەکارەساتێکی پشت شکێنەر و کەلەکەبڕەوە و تینوایەتییەکی واوە کە بە ئاوخواردنەوە ناشکێ و فەرامۆشیان نایە.

واتە گەرمایی و حەرارەتی بوغز و ڕق و عەداوەت بە ئاوخواردنەوە عیلاج ناکرێ بە تۆڵەکردنەوە نەبێ.

| ثُمَّ خَيْلٌ مِنْ بَعْدِ ذٰاكَ مَعَ الْغَلْ | لٰاقِ لٰا رَأْفَــةٌ وَ لٰاْ إِبْـقٰاءُ |
| --- | --- |

دەڵێ: لەپاشان بەنی تەمیمیان سوارەکانی بەنی غەللاق کە نە ڕوحمیان هەبوو، نە لە هیچ شتێك خۆیان دەپاراست و هەڵویستەیان لەسەر دەکرد پەلاماری ئێوەیان دا.

| فَمَلَكْنٰا بِذٰلِكَ النّٰاسَ حَـتّٰى | مَلِكَ الْمُنْذَرُ بْنُ مٰاءِ السَّمٰاءِ |
| --- | --- |

دەڵێ: جا بەهۆی ئەو هەموو خووڕەوشتە چاکانەمان لەگەڵ خەڵك بووینە فەرمانڕەوا و تا ئەوەبوو مونزیری کوڕی «ماءالسماء»مان لەسەر تەختی پاشایەتی دانا.

لەو شیعرەدا یەکێك لە عەیبەکانی قافیە هەیە کە «اقوا»یە و «اقواء» گۆڕینی حەرەکاتی ئاخری شیعرەکانە. وەك ئەوە کە حەرفی هەمزە کە لە تەواوی ئەو قەسیدەدا مەزمومە، بەڵام لەو شیعرەدا بینا لەسەر قیرائەتی مەشهوور مەکسوورە. فیروز ئابادی لە قامووسدا دەڵێ: لە مادەی «ق و و»ەدا «اقواء»، بە ڕەفعە و جەڕڕە لە شیعری عەرەبیدا زۆرە، بەڵام بە نەسبەکەمە.

وَ هُوَ الرَّبُّ وَ الشَّهِيدُ عَلىٰ يَوْ مِ الْـحِيٰارَيْنِ وَ الْـبَلاٰءُ بَـلاٰءُ ١

له قامووسدا دەڵێ: «حیاران» ناوی جێگایەکە.

دەڵێ: ئەو پاشایە عەمری کوڕی هیند کە شاهیدە لەسەر شەڕی «حیارین» و لەو کاتەدا کە جەنگ لەوپەڕی گەرمیدا بوو، ڕەنج و ناڕەحەتی گەیشتبووە ئاخر دەرەجەی ناڕەحەتی، ئەو شاهیدی فیداکاری و لەگیانبردوویی ئێمە بوو.

لە وەرگێرانی نووسینەوەی شەرحی سەبعە «معلقە» بوومەوە لە «دە»ی مورردادی «١٣٨٦» کۆچی هەتاوی، بەرامبەر بە «١٧» ڕەجەبی «١٤٢٨» کۆچی، مانگی یەکی ژوئیەی «٢٠٠٧» زاینی و «دە»ی گەلاوێژی ٢٧٠٧ کوردی، لە وڵاتی «فینلەند» و لە شاری «هێڵسنکی»، ئومێدەوارم کە لە چاپ بدرێ و بکەوێتە بەردەستی ئەدیبان و بە ڕەخنەوە دەیخوێنن و بە چاك یان بە خەراب کەم وکووڕییەکانی وەرگرن و لە فرسەتێکدا لەوەی من چاکتر شەرحیان بکەن.

وە زۆر سوپاسی ژیان عومەر ڕەشید خێزانی خەلیلی کوڕم دەکەم کە بە باشی نووسیویەتەوە، دەستی نەڕزێ.

محەمەدی شەڵماشی

٢٠٠٧-٨-٥